# نەتەوە لەناوچووەکان




نوسینی
هارون یەحیا

وەرگێرانی
شاهۆ عومەر عارف





چاپی یەکەم
٢٠١٠

ناوی کتێب: نەتەوە لەناوچووەکان
نوسینی: هارون یحیی
وەرگێڕانی: شاهۆ عومەر عارف
تایپ وهەڵەبڕ: ئەندریا حەزا غەفور
دیزاین و بەرگ: فەرهاد
شوێنی چاپ: چاپەمەنی چوارچرا
ساڵی چاپ: ٢٠١١
نۆرەی چاپ: چاپی یەکەم
تیراژ: ١٠٠٠
لە کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (١٣٦٥) ساڵی ٢٠١٠ ی پێدراوە

## پێشکەشە

- بەدایك وباوكم وبراكانم
- بەهاوسەرە بەوەفاكەم كەهەمیشە هاندەری چاكەم بووە
- بەمامۆستایەی كەسەرەتا دەستی گرتم خۆم بەقەرزاری دەزانم
- بەهەموو شەیدایانی ڕێگەی ڕاستی بێ جیاوازی
- بەهەموو ئەو كەسانەی خۆشەویستن لام

## پێشەکی وەرگێڕ

سوپاس و ستایشی بێ پایان بۆ پەروەردگاری جیهانیان، وەدرودو سەلامیش بۆ سەر گیانی پێغەمبەری ئازیز موحەممەد (درودی خوای لەسەر بێت) وە بۆسەر یارو یاوەرانی تاڕۆژی دوایی. زۆرێکمان ڕۆژانە لێرە و لەوێ چەندین بەسەرهاتی کۆن و نوێمان بیستووە لەگەڵ ئەو چیرۆکە قورئانیانەی کەباس لەنەتەوەکانی پێشوو دەکات، ئەگەر سەرنج لەبەسەرهاتی ئەو نەتەوە لەناوچووانە بدەین دەگەینە ئەوەی کە هیچ نەتەوەیەك نیە کە پێویستی بەڕابەرێك یان پشتیوانێك نەبێت کەهاوکاریان بکات، بەڵام لەکاتێکدا کە ئەو نەتەوانە پشتیان لە حەقیقەتی ژیان کردوو شوێن ڕێڕەوی ناڕاستی خۆیان کەوتن ئەوکات خوای گەورەش دووچاری نەهامەتی و دەردی سەریان دەکات.

### خوێنەری بەڕێزم

ئەم کتێبەی کەلەبەردەستدایە یەکێکە لەو کتێبە پڕبەهایانەی نوسەری بەتوانای تورکی (هارون یحی) کەزۆرێك لە کتێبەکانی ناو براو وەرگێڕاونەتە سەر زمانەکانی دونیا، بۆیە منیش بەباشم زانی ئەم کتێبەی هارون یحی وەربگێڕمە سەرزمانی شیرینی کوردی تاوەکو ڕۆڵەکانی گەلەکەمی پێ ئاشنا بکەم و هاوکات کتێبخانەی کوردیشی پێ دەوڵەمەند ببێت: ئەم کتێبە باس لەچۆنیەتی لەناوچوونی نەتەوەکانی پێشوو دەکات، وەباس لەو ڕاستیانە دەکات کە قورئانی پیرۆز وەك دواین پەیامی خوایی بۆ مرۆڤایەتی هێناویەتی، لێرەوە گرنگی ئەم بابەتانەمان بۆ دەردەکەوێت کەلە ناوەڕۆکی ئەم کتێبەدا هاتووە بۆیە پێویستمان بەهونەرو ڕێبەرێك هەیە بۆ تێڕامان لەحەقیقەتی بەسەرهاتی ئەو نەتەوانەی پێش خۆمان، وەبێگومان قورئانیش وەك مەوسوعەیەکی بەرفراوان لێوان لێوە

لەڕەهەندی مێژوویی و کۆمەڵایەتی و دەروونی و زانستی و هتد...، لەم کتێبەدا بەراوردێکی ئەقڵی و زانستی لەنێوان تەواوی ئەو بەسەرهات و چیرۆکانە دەکات کەلە کتێبی ئاینە جیاجیاکانەوە دەگێڕێنەوە و بەبەراورد لەگەڵ ئەو چیرۆکانەی کەلە قورئانی پیرۆزدا باسکراون، پاشان نوسەر زۆربەجوانی وەڵامی هەموو ئەو هەڵانە دەداتەوە کە داروین لە تیۆرەکەیدا باسی لێوە کردووە.

**خوێنەری بەڕێزم** ئەم کتێبەی کەلەبەردەستدایە بریتیە لەنۆ بەش کە سەرجەمیان باس لەو چیرۆکانە دەکات کەلە قورئانی پیرۆزو تەواوی ئاینە جیاجیاکان و داستانە ئەفسوناویەکانی زۆرێك لەنەتەوەکانی دونیادا هەن، پاشان بەشێکی تایبەتیشی تەرخان کردووە بۆ بەدرۆخستنەوەی ئەو هەڵانەی کە داروینی پێدا تێپەڕی. لێرەدا تەوە ماوە بڵێم کە داواکارم خوای گەورە بەبەزەیی خۆی ئەم خەرمانە کەمەی لێوەرگرتبم وە بیکاتە مایەی لێ خۆشبونی گوناهەکانم، وەدەمەوێت زۆر سوپاسی ئەوکەسانە بکەم کەهەمیشە یارمەتیدەرم بوون لەهەر کارێکی چاکەدا ئەگەر تەنها بە وشەیەکی بچوکیش بوبێت بەتایبەت برای بەڕێزم ئیبراهیم جەعفەر وە ئومێدەوارم لەداهاتوودا بەخەرمانێکی ترەوە بێمەوە خزمەتتان.

**شاهۆ عومەرعارف**

٢٠١٠/٣/١

# بۆخوێنەر

هۆكارێك لەپشت دیاریكردن و تەرخان كردنی بەشێكی تایبەت بەڕووخانی تیۆری داروین ئەوەیە كە ئەم تیۆرە بنچینە و یاسایەك ڕێكدەخات كە تێكڕای فەیلەسوفە بێ باوەڕو گومڕاكان پشتی پێ دەبەستن، جالەوكاتەوەی كە داروینیەكان نكوڵی حەقیقەتی بوون دەكەن وەلەلایەكی تریشەوە نكوڵی حەقیقەتی بوونی خوا دەكەن، زۆرێك لە خەڵكی پشتیان كردووە لە ئاینەكانیان یاخود كەوتونەتە گومان و دوودڵی لەسەربوونی بەدیهێنەر لە ماوەی ئەو سەدووچل ساڵەی دواییەدا. لەبەرئەوە بەتاڵكردنەوە و پوچەڵكردنەوەی ئەم تیۆرە شتێكەو ئاین پێویستی كردووە لەسەرمان، وە بەرپرسیاریەتیەكیشە دەكەوێتە سەرشانی هەریەك لە ئێمە.

وە بۆئەوەی هەلێك.نەمێنێتەوە بۆ خوێنەر كە زیاد لەم كتێبەی ئێمە بخوێنێتەوە لەبەرئەوە بیمان لەوە كردەوە كە بەشێك تایبەت بكەین كەپوختەی ئەم بابەتەی تێدا باس بكەین. تەواوی بابەتەئیمانیەكانی ڕاڤە كردوە كە هەموو ئەم كتێبانە لە خۆیانی گرتووە ئەویش لە سەر تیشكی ئایەتە قورئانیەكاندا كە بانگەشەی خەڵكی دەكەن بۆلای پەیامی خواو ژیان لەگەڵ واتاو ماناكانیدا. وە هەروەها تەواوی ئەو بابەتانەشی ڕاڤە كردوە كە پەیوەستن بە ئایەتە قورئانیەكان بە شێوەیەك كە هیچ گومان و پرسیار گەلێكی نە هێشتوە تەوە كە بەهۆش و بیری خوێنەردا بێت، وەبەشێوازێكی ناسك ودەستەواژەیەكی ئاسان كەنوسەرلەكتێبەكانیداپشتی پێ بەستوە، خوێنەران دەتوانن لە هەموو چینەكۆمەڵایەتی وئاستەزانستیەكان دا سوودیان لێ وەربگرن و لێیان تێ بگەن.

ئەم شێوازە ئاسانە لەنوسیندا وادەكات لە خوێنەر كە ئەم كتێبە لەیەك دانیشتندا بخوێنێتەوە، تەنانەت ئەوانەیش كە بڕوایان بەبوارە ڕۆحانیەكان نیەو ڕەتیان دەكەنەوە دەكەونە ژێرئەو ڕاستیانەوە كە ئەم كتێبانە لەخۆیانیان گرتووە، وەناشتوانن ئەوەی

که بڕوایان پێی دەبێت بیشارنەوە. خوێنەر دەتوانێت ئەم کتێبەو کتێبە کانی دیکەی نوسەر بخوێنێتەوە بەشێوە یەکی جیا یاخودلە نێوان مشت ومڕە بەرفراوانەکاندا، بەڵام ئەوانەی ئارەزوومەندی ئەوەن کە سوودمەندبن لێی ئەوە لە مشت و مڕکردندا سوودێکی باش بۆ خۆیان بەدەست دەهێنن، چونکە ئەوکاتە ئەوانە دەتوانن بەو سروشتەیان زیاتر شۆڕببنەوە بە ئەزمونی کەسانی تردا و بەوخولیایەی خۆشیان هەیانە وتوێژ بکەن لەبارەی ئەو ئەزمونانەی بەدەستیان هێناوە بۆ کەسانی تر.

ئەمەوێڕای ئەوەی کە بەشداریکردن لە خوێندنەوەو پیشاندانی ئەم کتێبانە کە لەبەر ڕەزامەندی خوا نوسراون خۆی بۆخۆی بەخزمەت کردنی ئاین دادەنرێت. لەم کتێبەدا ڕاستیەکان بەشێوازێکی تەواو ڕام و هێنانە سەربار پیشاندراوە، لەبەر ئەوە بەوکەسانە دەڵێین کە دەیانەوێت ئاین بگەیەننە کەسانی تر ئەوە لەڕاستیدا ئەم کتێبە یارمەتی و کۆمەکیەکی گەورەیان پێشکەش دەکات. ئەوەی بەسوودو پێویستە بۆ خوێنەر ئەوەیە کە دیراسە بکات لەسەر چەند نمونەیەك لەم کتێبانە کەلەکۆتایی کتێبەکەدا باس کراوە و هەن، تاوەکو بەچاوی خۆی ئەم هەمەچەشنەییە کەئەم سەرچاوە دەوڵەمەندانە بەبابەتە ئاینە بەسودو بەنرخ و بە پێزەکان پێشکەشیان کردووە ببینێت، لەم کتێبەو کتێبەکانی تری نوسەردا بیروبۆچونی کەسێتی نوسەر یان ئەوقسە کردنانەی کە پشت بە کتێبە گومان لێکراوەکان دەبەستن وەیاخود شێوازێکی لێڵ و پەنهانی لە پیشاندانی بابەتە نەیارەکاندا وەیان پیشاندانێکی خراپ کە کاریکاتە سەرگومان و دوودڵی وەببێتە مایەی لادان لەبیرکردنەوەو تێڕاماندا هەرگیز پەیدا نابن.

# دەربارەی نوسەر

هارون یەحیا کە ناوی خوازراوی نوسەرە لە ساڵی ﴿١٩٥٦﴾ لە ئەنقەرە لە دایك بووە، دوای ئەوەی خوێندنی سەرەتایی وناوەندی لە ئەنقەرە تەواودەکات، خوێندنی ئادابی لە زانکۆی ﴿میمار سنان﴾ لە زانکۆی ئەستەنبول خوێندوە، وەلە هەشتاکانی سەدەی ڕابردوودا دەستی کردووە بەدەرکردنی کتێبە سیاسی و ئاینیەکان. هارون یەحیا نوسەرێکی بەناوبانگەو ناسراوە بەوەی لە نوسینەکانیدا داروینیەکان پوچەڵ دەکاتەوە، وەئەوەش پیشان دەدات کە پەیوەندی ڕاستەوخۆیان بە ئایدۆلۆژیای خوێناوی تێکدەرەوە هەیە. ناوی خوازراوی لە هەردوو ناوی ﴿هارون﴾ وە ﴿یەحیا﴾ پێك دێت ئەویش بەیادی دوو پەیامبەرو پێغەمبەری خاوەن ئەزموون کە هەردووکیان دژ بە کوفرو بێ بڕوایی دەجەنگین، بەڵام لە کاتێکدا مۆری پێغەمبەر لەسەر بەرگەکەی دەردەکەوێت وەك نیشانەیەك بۆ پەیوەست بوونی واتاو مانای ئەم کتێبانە کە لە خۆیانی گرتووە ئەویش بەدانانی ئەم مۆرە.

مۆرەکەی پێغەمبەر ئاماژە بەوەدەکات کە بەڕاستی قورئانی پیرۆز دواین کتێب و پەیامی ئاسمانیە، وە پێغەمبەرمان ﴿موحەممەد (درودی خوای لێ بێت)﴾ دواینی پێغەمبەرانە. وە نوسەر لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا مەبەست و ئامانجی بریتیە لە ڕوخاندن و ڕیشە کێش کردنی بنەماکانی بێ باوەڕی و هاوەڵ بۆ ﴿خودا﴾ بڕیاردان لە بناغەو بنچینەیانەوە، وە بۆ پوچەڵ کردنەوەی هەموو ئەو بانگەشانەی کە بزاوتە نەیارەکانی ئاین لەسەری وەستاون، بۆ ئەوەی کۆتا ووشەی حەقیقەت و ڕاستی بکاتە بانگەشە بۆکراوی خۆی، وە ئەم مۆرەش کە کتێبەکانی پێ مۆرکراوە دادەنرێت لە بری ئاشکرا کردنی ئەم ئامانجانەی. تێکڕای کتێبەکانی

نوسەر بەدەوری یەك ئامانج و مەبەست دا دەسورێنەوە ئەویش گەیاندنی پەیامی قورئانە بەتەواوی خەلكی، وەهانیان دەدات لەسەر باوەڕ هێنان بە خواو وە بیرکردنەوەو تێڕامان بە بابەتە ئیمانیەکاندا و وەهەروەها بیرکردنەوە لە بوونی خوای بەدیهێنەری پەرستراوو رۆژی دوایی. کتێبەکانی هارون یەحیا چونەتە ناو کرۆکی جەماوەرەوە بەفراوانی بەشێوەیەك کە لە هیندەوە تا ئەمریکا ئارەزوومەندانێکی زۆریان هەیە، وەدەگاتە ولاّتی ئینگلتەرا و ئەندەنوسیا و پۆڵەندا و بۆسنە و بەرازیل و ئیسپانیا، وە لە ڕاستیدا هەندێ لە کتێبەکانیشی وەرگێڕاون بۆ سەرزمانەکانی فەرەنسی و ئینگلیزی وئەڵمانی و پورتوگالی و ئوردی و عەرەبی و ئەلبانی و ڕووسی و ئەندەنوسی.

ئەوەی ڕاستی بێت ئەم کتێبانە بەسودن و کاریگەریان لەناو جەماوەردا زۆرە بۆ بانگ هێشت کردنی کەسانی بێ بڕوا بۆلای باوەڕ بە خوای تاك وتەنها. وە هەروەها بۆ بەهێز کردنی باوەڕی ئیماندارانیش، جاشێوازی ئاسان و قایل کەر کە ئەم کتێبانە لەخۆیانیان گرتووە، دەست مایەو ئەنجامێکی باشیان هەیەو کاریگەری خێراو قوڵیشیان لەسەر خوێنەر هەیە، مەحاڵە لەسەرهەر خوێنەرێك ئەم کتێبانە بخوێنێتەوە وەبە شێوە یەکی ڕاستیش بیر لە ناوەرۆکەکانیان بکاتەوە دواجار قایل بێت بەهەر جۆرە فەلسەفەیەکی مادی گەرایی، وەئە گەر کەسێك مابێتەوە پارێزگاریان لێ بکات ئەوە لەدەروازەیەکی سۆزدارییەوەیە، چونکە ئەم کتێبانە ئەو جۆرە فەلسەفانە لە بناغەوە پوچەڵ دەکەنەوە، وەلە ڕاستیشدا تەواوی ئەو ئایدۆلۆژیانەی کە نکولی بونی خوای گەورە دەکەن ئەمڕۆ بەتاڵ بونەتەوە، وەچاکەوگەورەیی ئەوەیش دەگەڕێتەوە بۆ کتێبەکانی هارون یەحیا. گومانی تێدا نیە کە ئەم تایبەتمەندیانە بۆ دانایی و ڕوونی قورئانی پیرۆز دەگەڕێتەوە، وە ئامانجی نوسەریش لە پشت ئەم کتێبانەوە ئەوەیە کە خزمەتی ئەو کەسانەبکات کە دەگەڕێن بەدوای ڕێگەی ڕاست و گەیشتن بە پەروەردگار، نەك ئەوەی مەبەست

تیایدا بەدەست هێنانی نازناو یان ناو بانگ دەرکردنبێت ، سەرەڕای ئەوەش هیچ ئامانجێکی مادی لە پشت بلاوکردنەوەی ئەم کتێبانەوە نیە. وەلە بەر ڕۆشنایی ئەم ڕاستیانەدا ئەوانەی هانی کەسانی دیکە دەدەن لەسەر خوێندنەوەی ئەم کتێبانە کە چاوودلێیان دەکەنەوەو ڕێگەی بەندایەتی کردن بۆ خوای تاك و تەنهایان پێ پیشان دەدەن، ئەوانە خزمەتێك پێشکەش دەکەن کە بەهیچ نرخ وبەهایەك مەزەندەناکرێت.

لەلایەکی تریشەوە گواستنەوەی ئەو کتێبانەی کە جۆرێك لە گومان و ڕاڕایی لەبیرو هۆشی خوێنەردا دروست دەکات، وە مرۆڤیش بەرەو ناو گێژاوی ئایدۆ لۆژیا کان دەبات، وە کاری گەری ئەوتۆشی نابێت لەلابردنی گومان لەسەر دڵی مرۆڤەکان کات و هەوڵ بەفیڕۆ دانە، بەلاّم ئەوەی کەڕون و ئاشکرایە لەم کتێببانەدا ئەوەیە کە کاریگەری گەورەی لای خوێنەر جێ نەهێشتووە، ئەگەر سەرنج بدەیتە توانای ئەدەبی نوسەر زیاترمەبەست لە فەوتاندنیانە کەهەوڵی بۆدەدا، ئەوەی گومان دەکات لەمەدا دەتوانێت خۆی بۆ خۆی بیبینێت کە بەڕاستی تاکە مەبەست و ئامانجی کتێبەکانی هارون یەحیا ڕووخان و لەناوبردنی کو فرو بێ باوەڕیە و گرنگی دان و خۆتەرخان کردنی بەرزو بلّند کردنەوەی بەها بالاکانی مرۆڤایەتیە. پێویستە ئاماژە بەوە بکەین کە ئەو بارودۆخە ناهەموارو خراپە، وەئەو ململانێ یەی کەجیهانی ئیسلامی لەئەمڕۆماندا تیایدا دەژی و پێوەی دەنالێنێ جگە لەئەنجامی دوور کەوتنەوە لە دینی خوای گەورە و ڕووکردنە ئایدۆلۆژیای بێ باوەڕان هیچی ترنیە، ئەمەش کۆتایی پێ نایەت مەگەر بەگەڕانەوە بۆلای پرۆگرام و بەرنامەی ئیمان و باوەڕو وازهێنان لەو بەرنامەو پرۆگرامە گومڕاییانە، وە ڕۆشتن ڕووەو بەهابالاکان و دروشمە قورئانیەکان کە خاوەن و دروستکەری بوونەوەر پیشانی داوین تاوەکو ببێتە دەستوورو بەرنامە بۆمان، وە بەسەرنج دان لەو بارودۆخە خراپەی کە ڕووەو وێران بوون و کاولکاری دەڕوات، ئەوە پێویستە لەسەرمان وەك

نەركێك ئەنجامی بدەین ئەگەرنا.... لەڕاستیدا لەكاتی گونجاوی خۆیدا پێی ناگەین. زیادە ڕەوی ناكەین ئەگەر بڵێین بەرهەمەكانی هارون یەحیا توانیویەتی هەموولەمپەرەكان بگرێت، وە بەیارمەتی خوای گەورە ئەم كتێبانە هۆكارێك دەبن تاوەكو نەتەوەكانی سەدەی بیستەم بگەن بە ئاشتی و دادپەروەری و بەختەوەری كە قورئانی پیرۆز پەیمانی داوە.

## كارەكانی نوسەر ئەمانەی لەخۆگرتووە

﴿النظام الماسوني الجديد، اليهودية والماسونية، الكوارث التي جرتها الداروينية على العالم، الشيوعية عندالأمبوش، الايديولوجية الد موية للداروينية : الفاشية، الاسلام يرفض الارهاب، اليدالخفية في البوسنة، وراء حوادث الارهاب، وراء حوادث الهولوكوست، قيَم القرآن، الموضوعات ١,٢,٣، سلاح الشيطان : الرومانسية حقائق ١,٢، الغرب يتجه الى الله، خدعة التطور، أكاذيب التطور، الأمم البائدة، لأولي الألباب، انهيار نظرية التطور في عشرين سؤالا، اجابات دقيقة على التطورين، النبي موسى، النبي يوسف، العصر الذهبي، اعجاز الله في الألوان، العظمة في كل مكان، حقيقة حياة هذا العالم، القرآن طريق العلم، التصميم في الطبيعة، بذل النفس ونماذج رائعة من السلوك في عالم الحيوان، السرمدية قد بدأت فعلا، خلق الكون، لاتتجاهل، الخلود و حقيقة القدر، معجزة الذرة، المعجزة في الخلية، معجزة الجهاز المناعي، المعجزة في العين، معجزة الخلق في النباتات، المعجزة في العنكبوت، المعجزة في البعوضة، المعجزة في نحل العسل، المعجزة في النملة، الأصل الحقيقي للحياة، الشعور في الخلية، سلسلة من المعجزات، بالعقل يعرف الله، المعجزة الخضراء في التركيب الضوئي، المعجزة في البروتين، أسرارDNA﴾.

## کتێبەکانی نوسەر بۆ منداڵان

﴿ايها الأطفال كذب داروين ! ، عالم الحيوان، عظمة السماوات، عالم أصد قائك الصغار، النمل، النحل يبني خليته باتقان، بناة الجسر المهرة، القنادس.﴾

## بەرهەمەکانی دیکەی نوسەر کە بابەتە قورئانیەکانی لەخۆ گرتووە

﴿المفاهيم الأساسية في القرآن، القيم الأخلاقية في القرآن، فهم سريع للايمان ١,٢,٣ ، هجرمجتمع الجاهلية، المأوى الحقيقي للمؤمنين : الجنة، القيم الروحانية في القرآن، علوم القرآن، الهجرة في سبيل الله، شخصية المنافقين في القرآن، أسرارالمنافق، أسماء الله، تبليغ الرسالة والمجادلة في القرآن، المفاهيم الأساسية في القرآن، اجابات من القرآن، بعث النار، معركة الرسل، عدوالانسان المعلن : الشيطان، الوثنية، دين الجاهل، تكبر الشيطان، الصلاة في القرآن، أهمية الوعي في القرآن، يوم البعث، لاتنس أبدا، أحكام القرآن المنسية، شخصية الانسان في مجتمع الجاهلية، أهمية الصبر في القرآن، معارف عامة من القرآن، حجج الكفرالواهية، الايمان المتكامل، قبل أن تتوب، تقول رسلنا، رحمة المؤمنين، خشية الله، كابوس الكفر، النبي عيسى آت، الجمال في الحياة في القرآن، مجموعة من جماليات الله ١-٢-٣، مدرسة يوسف، الافتراءات التي تعرض لها الاسلام عبر التاريخ، اهمية اتباع كلام الله، لما ذا تخادع نفسك، كيف يفسر الكون القرآن، بعض اسرار القرآن، الله يتجلى في كل مكان، الصبر والعدل في القرآن، اولئك الذين يستمعون الى القرآن﴾.

## سەرەتا

ذَٰلِكَ مِنْ أَنۢبَآءِ ٱلْقُرَىٰ نَقُصُّهُۥ عَلَيْكَ ۖ مِنْهَا قَآئِمٌ وَحَصِيدٌ ﴿١٠٠﴾ وَمَا ظَلَمْنَٰهُمْ وَلَٰكِن ظَلَمُوٓا۟ أَنفُسَهُمْ ۖ فَمَآ أَغْنَتْ عَنْهُمْ ءَالِهَتُهُمُ ٱلَّتِى يَدْعُونَ مِن دُونِ ٱللَّهِ مِن شَىْءٍ لَّمَّا جَآءَ أَمْرُ رَبِّكَ ۖ وَمَا زَادُوهُمْ غَيْرَ تَتْبِيبٍ ﴿١٠١﴾

**هود** (١٠٠ /١٠١) واتە ﴿ئەوەی کە باسکرا

هەندێك بوو لە هەواڵی ئەو شارو شارۆچکانە، بۆت دەگێڕینەوە، هەندێك لەو شارو دێهاتانە ماون و هەندێکی تری بەتەواوی وێران بوون. ئێمە ستەمان لێنەکردن و بەڵکو هەرخۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد، ئەوسا ئەو پەرستا وانەیان کەلە جیاتی خوا هاواریان لێ دەکردن، فریای هیچ شتێکیان نەکەوتن کاتێك فەرمانی پەروەردگاری تۆ هات، هیچیان بۆ زیاد نەکردن جگە لە تیاچوون نەبێت﴾. خوای پەروەردگار ئادەمیزادی بەدیهێناوە و ڕۆح و لاشەشی پێ بەخشیوە، وە زەویشی بۆ فەراهەم هێناوە تاوەکو لەسەر بەرنامەیەکی دیاریکراو لەسەری بڕوات، پاشانیش دەیمرێنێت بۆ ئەوەی سەرلەنوێ بیگەڕێنێتەوە بۆ لای خۆی، خوای پەروەردگار ئادەمیزادی بەدیهێناوە و خۆشی زاناترە بەوەی کەبەدیهێناوە، وەك دەفەرموێت

أَلَا يَعْلَمُ مَنْ خَلَقَ وَهُوَ ٱللَّطِيفُ ٱلْخَبِيرُ ﴿١٤﴾ **الملك** (١٤)

واتە ﴿مەگەر خوا نازانێت کێی دروست کردووە و چۆنی دروست کردوە، لەکاتێکدا ئەوزاتە وردکارو بەسۆزو ئاگایە﴾. شارەزای کردو هەموو پێدا ویستیەکانی بۆ ئامادە ساز کرد، لەبەر ئەوە یەکەم ئامانجی سەرەکی کە مرۆڤی لە پێناودا دەژێت بریتیە لە بەندایەتی کردنی خوای بالآدەست و بەگەورە زانینی وپەنا بۆ بردنی، وەهەمان هۆکار بوو کە پەیامی پوخت و پاك و بێگەرد

هاتەکایەوە هاوکات نیگای خوایی کە مرۆڤایەتی لە ڕێگەی پێغەمبەرانەوە (سەلامی خوا یان لەسەر بێت) بۆیان دەنێررا بریتی بوولە ڕێنمویی ڕەها بۆ ئادەمیزاد. قورئانی پیرۆزیش دوایین کتێبە ئاسمانیەکانە و ئەو نیگایەیە کە هیچ گۆڕان و لادانێکیشی بەسەردا نایەت.

جالەبەر ئەوە ئێمە هەموومان بەرپرسین لەوەر گرتن و شوێن کەوتنی وەك بەرنامەیەکی نەگۆڕو جێگیر وەلە هەمان کاتیشدا پێویستە پابەند بین بەبڕیارو تەواوی وردەکاریە کانیشیەوە، چونکە تاکە ڕێگایەکە بۆ ڕزگار بونمان لەدونیا و دوارۆژدا، وەلە لایەکی تریشەوە ئێمە پێویستمان بە لێکۆڵینەوە و تێڕوانینێکی ورد هەیە لەماناو ناوەڕۆکی قورئانی پیرۆز لەوەدا کەبۆمان دادەڕێژێت، خوای پەروەردگار لەقورئانی پیرۆزدا بۆمان باس دەکات کەمەبەست لەوەحی و نیگای قورئان ڕێنمویی خەڵکە بۆ بیرکردنەوە و تێ فکرین، وەك دەفەرموێت : هَـٰذَا بَلَـٰغٌ لِّلنَّاسِ وَلِيُنذَرُوا۟ بِهِۦ وَلِيَعْلَمُوٓا۟ أَنَّمَا هُوَ إِلَـٰهٌ وَٰحِدٌ وَلِيَذَّكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴿٥٢﴾ ابراهيم (٥٢) : واتە : ﴿ئە م (قورئانە) ڕاگەیاندنێکە بۆخە لکی بە گشتی تابە هۆیە وە وریا بکرێنە وە و ئا مۆژگاری پیێ وە ربگرن، بۆ ئە وە ی بزانن بێگومان ئە وزاتە خوایە کی تاك وتە نهایە،﴾ (هە روە ها بۆ ئەوە یە کە) خا وە نی بیرو هۆشە کان یاداوە ری وە ربگرن و تێفکرن (لە هە ولێ ئە وە دابن خۆیشیان وخە لکیش لە سزای دۆزەخ رزگاربکە ن) ﴾.

بەدڵنیاییەوە چیرۆکەکانی ڕابردوو کە شوێنەوارێکی گەورەیان لە قورئاندا تۆمارکردوە لەو بابەتە قورئانیە گرنگانەن کە پێویستە وردبینەوە لێیان و سەرنجیان بدەین و بیریان لێ بکەینەوە، وەئەو ڕابردوانەش ئەو گەل و نەتەوانەن کە زۆر بەیان پێغەمبەرە کانیان بەدرۆ خستوەتەوە کە پەیامیان بۆ هێناون، وەتەنانەت

دوژمنایەتیشیان لەگەڵدا دەکردن، وە ئەو گەل و نەتەوانەش لەبەر خۆ بەگەورە زانین و مل نەدان بۆ ڕاستیەکان شایستەی ئەو سزایە بوون کە بەهۆیەوە خوای گەورە لەسەر ڕووی زەویدا لەناوی بردن و نەیهێشتن . قورئانی پیرۆز کاتێك ئەوحاڵەتە وێرانکاریانەمان بۆ باس دەکات بۆ ئەوەیە ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ نەتەوەکانی داهاتوو، ئەمەش لە ئایەتی (٦٦) سورەتی (البقرة) دا بەتەواوەتی دەردەکەوێت کە لەتۆڵەو سزای ئەو کۆمەڵە جولەکەدا دابەزی کە پشتیان لە خوای گەورە کردو یاخی بوون وەك دەفەرموێت : فَجَعَلْنَـٰهَا نَكَـٰلًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهَا وَمَا خَلْفَهَا وَمَوْعِظَةً لِّلْمُتَّقِينَ ﴿٦٦﴾ البقرة (٦٦)

واتە : ﴿جائەو کۆمەڵەی کە سزاکەیان ئەوە بوو کە کردمانن بە مەیموون تاوەکو ببنە پەندو عیبرەت بۆ ئەوانەی کە : هاو چەرخی ڕووداوەکە بوون و بۆ ئەوانەش لە دوای ئەوان دێن، هەروەها کردمانە ئامۆژگاری بۆخواناس و پارێزکاران﴾. لەم کتێبەدا چیرۆکی هەندێ لەنەتەوەکانی ڕابردوو پیشان دەدەین کە بەهۆی پشت هەلکردنیان لە خوای گەورە تیاچوون و فەوتان . هۆکاری دووەم کەوای کرد بەم کارەمان هەستین بیر کردنەوە و ڕامانە لەو ڕووداوە کاولکار یانەی کە بەسەر ئەو نەتەوانەدا هاتووە ئەویش پیشاندانی ڕواڵەتە دەرەکیەکانە بۆ ئایەتەکانی قورئان کە باس لەم ڕووداوانە دەکەن کەبەسەر ئەم جیهانەماندا هاتووە کە تیایدا دەژین. وەهەروەها دەرخستنی ڕاستیەکانی قوورئانیشە و خوای پەروەردگاریش لە پەیامە پیرۆزەکەیدا بۆمان باس دەکات کە هێماو نیشانەکانی لە جیهاندا دیارن وەدەتوانرێت ببینرێن، وەك دەفەرموویت وَقُلِ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ سَيُرِيكُمْ ءَايَـٰتِهِۦ فَتَعْرِفُونَهَا ۚ وَمَا رَبُّكَ بِغَـٰفِلٍ عَمَّا تَعْمَلُونَ ﴿٩٣﴾ النمل (٩٣) واتە : ﴿بڵێ

(الحمد لله) سوپاس و ستایش بۆ خوا، لەئاییندەیەکی نزیکدا هەموو بەلگەو نیشانەکانی خۆیتان نیشان دەدات و دەیانناسنەوە (کە هەمووی دەستکارو بەدیهێنراوی خوایە)، بێگومـان پەروەردگاری تۆ غافلّ و بیّ ئاگانیە لەو کارو کردەوانەی کە ئەنجامی دەدەن﴾. لەڕاستیشدا زانین و شارەزا بوون ئەم ئایەتانە و دیاریکردنیان یەکێکە لەرێگە سەرەکیەکان کە بەرەو ئیمان و باوەڕ دەتبات .

دەتوانین بلّێین : کەزۆربەی ڕووداوە کانی کاولکاری کە قورئانی پیرۆز بۆی باس کردوین هەموویان ئاشکراودیاری بەر چاوان بوون و دەتوانین دیاریان بکەین، چاکەو خستنەڕو و پشکنینی ئەمانەش بۆ شوێنە وارناسەکان دەگەڕێتەوە، لەم باسەشماندا هەندیّ لە شوێنەواری ئەو حالّەتە وێرانبوانەی کە قورئانی پیرۆز باسی لێوە کردوون و پیشان دەدەین. سەرنج بدە کە هەندیّ لەو نەتەوانەی کەلە قورئاندا ئاماژەیان پیّ کراوە تەواو لەم کتێبەدا ڕۆشن نەکراونەتەوە، چوونکە قورئانی پیرۆز شوێن و کاتەکانیانی پیشان نەداوە بەلکو تەنها بەکورتی ئاماژەی کردووە بە یاخی بوونی ئەو نەتەوانە لە خوا و پێغەمبەرەکانی. وەلەئەنجامی گومڕایشیاندا خوای گەورە لەناوی بردون، ئەمەش بۆ ئەوەیە ببێتە بانگەشە بۆ خەلکی تاوەکو لەم ڕووداوانە پەندوئامۆژگاری وەر بگرن. وەئامانجیشمان لەپیشاندانی هەمووئەو سزاو تۆلاّنەی کەلەم ڕووداوانەدا توشی نەتەوەکان بوون بۆ ئەوەیە ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ ئەوکەسانەی کە پەندو ئامۆژگاری وەردەگرن.

## پێشەکی

# ﴿نەتەوەکانی پێشوو﴾

أَلَمۡ يَأۡتِهِمۡ نَبَأُ ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِهِمۡ قَوۡمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَقَوۡمِ إِبۡرَٰهِيمَ وَأَصۡحَٰبِ مَدۡيَنَ وَٱلۡمُؤۡتَفِكَٰتِۚ أَتَتۡهُمۡ رُسُلُهُم بِٱلۡبَيِّنَٰتِۖ فَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴿٧٠﴾ **التوبە** (٧٠).واتە:

**﴿ئایا ئەوانە هەواڵی گرنگی قەومەکانی پێش خۆیان پێ نەگەیشتوە (بەتایبەتی) قەومی نوح و عاد و ثەمود، قەومی ئیبراهیم و نیشتە جێکانی مەدیەن (قەومی شوعەیب) هەروەها ڕەفتار نزم و بێ ڕەوشتەکان (قەومی لوط) ، جاهەموو ئەو نەتەوانە پێغەمبەرەکانیان بەڵگەو نیشانەی ئاشکرایان بۆ هێناون، جابەڕاستی وەنەبێت خوا ستەمی لێکردبن، بەڵکو ئەوانەخۆیان ستەمیان لە خۆیان کرد﴾.**

**هەرلەسەرەتای دروست بوونی ئادەمیزاد و دروستکراوەکاندا پەروەردگار لە ڕێگەی پێغەمبەرەکانیەوە پەیامی بۆ ناردون، هەندێ لەو نەتەوانە پەیامەکەیان پەسەند کردوە و وەریان گرتووە لەهەمان کاتیشدا گەل و نەتەوانێکیش هەبوون ڕەتیان کردوەتەوە، هەندێ جاریش کەمینەیەك لەنەتەوە و گەلەکان پەیامەکەیان وەرگرتووە و شوێن پێغەمبەرەکەیان کەوتوون، بەڵام زۆربەشیان ڕەتیان کردوەتەوە و نەیان ویستووە. لەڕاستیشدا ئەم زۆرینەیەش تەنها بەبەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکانیانەوە نەوەستاون، بەڵکو دووچاری ئازارونەشکەنجە و قسە پێوتنیش بوونەتەوە، زۆرجار بەتۆمەتی شێتی و درۆزنی و جادوگەری و فریو خواردوو ناوزەد یان کردوون، تەنانەت سەرکردەی هەندێ لەو هۆزو نەتەوانەش هەوڵی کوشتنیان داون.**

**جاداواکاری و داخوازی ئەو پێغەمبەرانەش لەگەڵ و نەتەوەکانیان جگە لەباوەڕ**

هێنان بە خوای تاك و تەنها و گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی هیچی ترنەبووە، بەشێوازێك کە داوای ماڵ و سامانی دوونیایشیان لێ نەکردون، تەنانەت لەکاتێکدا قەومەکەیان وەڵامی بانگەوازە کەشیان نەداونەتەوە ڕقیان لێ هەڵنەگرتوون، تەنهاکارێك کە ئەنجامیان دابێت بانگەێشت کردنیان بووە بۆ لای ئاینی ڕاست و دروست. وەلەگەڵ شوێن کەوتوەکانیاندا ژیانێکی نوێوو جیاوازیان دەست پێ دەکرد دوور لە کۆمەڵگاگومڕاکەیان . وەڕەنگدانەوەیەك هەیە بۆ ئێمە لە چیرۆکی شوعەیب وگەلەکەیدا (کە هاوەڵانی مەدیەنن) و حەزرەتی شوعەیب نێررا بویە سەریان ئە و پە یوە ند یەی کە باسمان کرد لە نێوان هەر پێغە مبە رێك و ئەو کۆمە ڵگاکە یەی کە ئەو پێغەمبەرە بۆی ڕە وانە کراوە، پێدە چێت کاردانەوەی هۆ زە کەی شوعەیب بوبێت بۆبانگەوازەکەی کەبانگهێشت کردنیان بوو بۆلای باوەڕهێنان بە خواو دادپەروەری کردن لە پێوانەو کێشانەدا کە بەناوبانگ بون بەترازوبازی، وەئەو ڕێگەیەی کە کۆتاییان پێنەهێنا درێژ دەبێتەوە لە ڕوانگەی ئایەتە پیرۆزە کانەوە :-﴿ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ ۚ إِنِّىٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَٰقَوْمِ أَوْفُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿٨٦﴾ قَالُوا۟ يَٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَٰٓؤُا۟ ۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ

أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ وَيَٰقَوْمِ لَا يَجْرِمَنَّكُمْ شِقَاقِىٓ أَن يُصِيبَكُم مِّثْلُ مَآ أَصَابَ قَوْمَ نُوحٍ أَوْ قَوْمَ هُودٍ أَوْ قَوْمَ صَٰلِحٍ ۚ وَمَا قَوْمُ لُوطٍ مِّنكُم بِبَعِيدٍ ﴿٨٩﴾ وَٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّى رَحِيمٌ وَدُودٌ ﴿٩٠﴾ قَالُوا۟ يَٰشُعَيْبُ مَا نَفْقَهُ كَثِيرًا مِّمَّا تَقُولُ وَإِنَّا لَنَرَىٰكَ فِينَا ضَعِيفًا ۖ وَلَوْلَا رَهْطُكَ لَرَجَمْنَٰكَ ۖ وَمَآ أَنتَ عَلَيْنَا بِعَزِيزٍ ﴿٩١﴾ قَالَ يَٰقَوْمِ أَرَهْطِىٓ أَعَزُّ عَلَيْكُم مِّنَ ٱللَّهِ وَٱتَّخَذْتُمُوهُ وَرَآءَكُمْ ظِهْرِيًّا ۖ إِنَّ رَبِّى بِمَا تَعْمَلُونَ مُحِيطٌ ﴿٩٢﴾ وَيَٰقَوْمِ ٱعْمَلُوا۟ عَلَىٰ مَكَانَتِكُمْ إِنِّى عَٰمِلٌ ۖ سَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَمَنْ هُوَ كَٰذِبٌ ۖ وَٱرْتَقِبُوٓا۟ إِنِّى مَعَكُمْ رَقِيبٌ ﴿٩٣﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا شُعَيْبًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَأَخَذَتِ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٩٤﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّمَدْيَنَ كَمَا بَعِدَتْ ثَمُودُ ﴿٩٥﴾ **هود (٨٤-**

**٩٥). واته : ﴿بۆلای خەڵکی مەدیەنیش برای و کەسی خۆیان (شوعەیب) مان بە پێغەمبەرێتی ڕەوانە کرد، ئەویش وتی : ئەی خزمەکانم بەندایەتی خوا بکەن، هیچ خوایەکی ترتان نیە جگە لەو، هەروەها کەموو کورپیش مەکەن لە پێوانەو کێشانەدا، بەڕاستی من بە چاك دەتانبینم و ڕزق و ڕۆزیشتان باشەو لە خۆشیدان، بێگومان من دە ترسم ئەگەرلە فە رمانی خوا دە رچن ئێوە توشی سزای ڕۆژێك بن کە گەمارۆتان بدات و لێی ڕزگارنەبن. ئە ی قە وم و خزمە کانم، باپێۆانەو**

کێشانە تان تێرو تەواوبێت و بە دادپە روە رانە ئەنجاامی بدە ن، شت ومە کی خە لکی کە م نرخ مە کەن (فێلیان) لیّ مە کەن و خراپەکاری مەکەن لە زەویدا و تۆ وی خراپە مە چێنن. ئە وە ی خوای گە ورە بۆ تان دە هێلێتەوە لە قازانج حە لا لی کردوە بوتان، ئە وە چاکترە لە زۆرێکی جە را م ئە گە ر ئێوە ئیمان دارین منیش لێپرسرا و نیم بە رامبە ر ئێوە (بە لکو حە ق و را ستیتان پیّ را دە گە یە نم)

خە لکە کە وتیان : ئە ی شوعەیب ئایا نوێژە کە ت فە رمانت پێدە کەت فە رمانت پێدە کات کە ئێمە واز بهێنین لە وە ی باووباپیرانمان پە رستویانن، یاخود لە ماڵ و سامانماندا بە ئارە زووی خۆمان چیمان بوێت بیکە ین و بە ڕاستی تۆ زۆر هێمن و خا وە ن ژیریت ؟! شو عە یب وتی : ئە ی قە وم و خزمەکانم هە واڵم بدە نیّ ئەگەر منتان بینی و بوتان دە رکە وت کە لە سە ر بە رنا مە یە کی ڕێك و ڕۆ شنم لەلایەن پە روە ردگارمە وە و هەرلە لایەن خۆشیە وە ڕزق و ڕۆزی جوان وباشی داومە تیّ، منیش نامە وێت قە دە غە ی شتێکتان لیّ بکەم، کە چی خۆم وە ك ئێوە نە کە م من هیچم نا وێت تە نها چاك سازی نە بێت، بەگوێرەی توانام ڕێکخستنی کارم بەدەستی کەس نیە بەدەستی خوانەبێت پشت وپەنام هەربەیەستوە وهەربۆلای ئەویش دەگەڕێمەوە. ئەی قەوم وخزمانم ناکۆکی و دژایەتیتان لەگەڵ منداواتان لێنەکات (ئەوتاین وبیروباوەڕەی هێناومە لەلایەن خواوە بەدرۆی بزانن) جائەوکاتە ئەوەی توشی هۆ زی نوح و هود و ساڵح بوو توشی ئێوەش بێت، خۆهۆ زی لوط لێتانەوە زۆردورنیە. داوای لێخۆش بونیش لەپەروەردگارتان بکەن و وا ز بهێنن لەتاوان وخراپەکاری و پاشان بگەڕێنەوە بولای خوا، بێگومان پەروەردگاری من زۆر بەبەزەیی ومیهرەبانە، زۆربەسۆزو دلۆڤانە. خزمانی نالەبار وتیان: ئەی شوعەیب، ئێمە تێناگەین لە زۆربەی ئەوباسانەی کە تۆ دەیلێیت، ئێمەش بەراستی تۆبەلاواز دەبینین لەناو خۆماندا

(وادەزانین ناتوانیت بەرەنگاری ئەم هەمرو خەلکە بکەیت، ئەمەی تۆباسی دەکەیت پێویستی بەهێزو توانایەکی زۆرهەیە)  و خۆئەگەر خزمەکانت نەبوایە بەردبارنمان دەکردی، وەنەبیت تۆهیچ تواناو دەستەلاتێکت هەبێت بسەرماندا.

شوعەیب  وتی   ئەی هۆزوخزمانم ئایا کەس وکارم بەلای ئێوەوە بەتواناو دەستەلات دار ترە لەخوا ؟! لەکاتێکدا ئەو زاتە تان فەرامۆش کردوە و گوێ نادەن بەفەرمانەکانی، بەڕاستی پەروەردگارم ئاگا دارە بەوەی ئێوە ئەنجامی دەدن. ئەی هۆزو خزمانم ئێوەکاری خۆتان بکەن چەندە تواناتان هەیە،منیش کاری خۆم لەسەر بەرنامەی خۆم ئەنجام دەدەم، لەمەودوا دەردەکەوێت و دەزانن کێ سزای بۆدێت و سەرشۆڕی دەکات  کێش درۆزنە، ئێوە چاوەڕێ بن  بەڕاستی منیش لەگەلتاندا چاوەڕێم. کاتێکیش فەرمانی  ئێمەهات  بۆتیا چونیان، شوعەیب وئەوانەی بڕوایان هێنا بوو لە گەڵیدا بە هۆی بەزەیو لوتفی خۆمان ڕزگارمان کردن و دەنگو نرکەی تیاچون تاوان کارو بێ بڕواکانی گرتەوەو جاهەمویان لەشوێن و جێگەی خۆیانداتیاچون وبەچۆك داهاتن  لەبەرەبەیاندا. هەروەك لەوێ نەژیا بن، ئاگاداربن، وەك مەدیەن لەوەلاتر بچێت هەروەك ثە مود لەوەلاترچوو﴾. ئامۆژگاری یەکتریان دەکرد بە (بەرد باران کردنی شوعەیب) لە کاتێکدا هیچ تاوانێکی نەبوو جگە لەوەی بانگی دەکردن بۆ ڕێگەی چاکە، تارەکوو خوای گەورە سزای داباران بەسەریانداو تۆ لەی لێ کردن و لەناوی بردن وەك چۆن ئایەتە پیرۆزەکان ئاماژەیان پێ کردووە، ئەمەلەکاتێکدا کە هۆزو نەتەوەکەی شوعەیب تەنها نمونەی لە ناوچوون نین، بەلکو بەپێچەوانەوە، وەك چۆن لە ئایەتەکانی قورئاندا لەسەر زاری شوعەیبەوە هاتوون کە لەگەلٚ هۆزەکەیدا دەدوا کە گەل و نەتەوەیەکی زۆر لەپێشدا هاتوون بۆ مەدیەن خوای گەورە لەناوی بردوون، وەهەروەها هۆزو نەتەوەیەکی زۆری دیکەش لە دوایانەوە هاتوون بە هەمان شێوە تیا چوون و لەناو براون. لەلاپەڕەکانی داهاتوماندا هەلٚدەستین بەپێشکەشکردنی وەسفێك

بۆکۆمەڵگالەناوچووەکان کە لەداهاتوودادەگەین سەرباس و شوێنەوارە کانیان لەقورئانی پیرۆزدا وەسفی ئەم کۆمەڵگایانە بەدرێژی هاتووە، بەشێوەیەك ئایەتەکان بانگی خەڵکی دەکەن بۆئەوەی بیربکەنەوە و ئاگاداربن لەوسزایەی کە ئەوانە پێی گەیشتن  لێرەدا دەبێت ئەوە بزانین کە قورئانی پیرۆز بەشێوەیەکی تایبەتی سەرنجمان بۆئەوە ڕادەکێشێ کە زۆرینەی زۆری ئەم نەتەوانە لەوپەڕی شارستانی پێش کەو تندابوون، دەتوانین لەم ئایەتەدا ئەم ئایەت مەندیە ڕۆشن بکەینەوە کەئەم نەتەوە لەوناوچوانەی پێ جیادەبێتەوە کە دەفەرموێت: ﴿ئێمە چەندەها هۆزو نەتەوەی پێش ئەوانمان لەناو بردووە، کە ئەوان لەمان بەدەستەڵاترو بەتوانا تربوون.. خۆ ئەوان بەشارەکان و شوێنەوارەکاندا گەڕاون و تێپەڕیوون، ئایا هیچ دەرباز بوونێك لەسزاکانیان بەدی کرد ؟!﴾. دەتوانین لەم ئایەتەدا کەباسمان لێوەکرد دووسیفەتی ئەم هۆزو نەتەوانە وەربگرین، یەکەمیان  ئەو هۆزو نەتەوانە زۆر بەهێزبوون، ئەمەش ئەوەدەگەێنێت کەخاوەنی ڕژێمێکی سەربازی بەهێز بوون، وەتوانیویانە دەسەڵاتی بەهێز لەسەر زەویدا دابمەزرێنن.

سیفەتێکی تریان : ئەوەیە کەئەم نەتەوانە توانیویانە چەند شارێکی گەورە بونیاد بنێن کەبەهونەری شارستانیان خەڵکی تەماشاکەر سەرسام  بکەن. لەڕاستیدا ئەم دووسیفەتە بەناوبانگە کەلە شارستانیەتی تازەدا کە جیهانێکی شارستانی ڕوون و گەشاوە لەسایەی تەکنیك کاری زانستی پێشکەوتوو بونیاد ناوە وەچەندین وڵاتی دامەزراو و شاری گەورەی دروست کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا نکوڵی بوونی خوای گەورە دەکات و لە یادیشی چووەتەوە کە هەموو ئەو پێش کەوتن و گەشە سەندنە نەدەبوو بەهاتبایاتەدی ئەگەر توانای خوای گەورەی لەگەڵ نەبوایە، ئەگەرنا ئەو شارستانیەتانەی کە نەتەوەلەناوچووەکان بوونیادیان نابوو ڕزگاریان نەدەبوو لەوێرانبون چونکە لەسەر ئینکاری و نکوڵی کردنی خوای تاك و تەنها وەستا بوو وەك لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا باس کراون، کەواتە کۆتایی ئەم شارستانیەتە

نویّ یەش هیچ جیاوازیەکی نیە لەگەلّ شارستانیەتەکانی پێشوودا ئەگەر لەسەر درۆ و خراپە کردن لەسەر زەویدا دامەزرا بێت. وەژمارەیەك لە ڕوداوە وێرانبوەکان کە قورئانی پیرۆز باسی هەندێکیانی کردوە سەلێنراون، ئەویش لەرێگەی گەڕان و پشکنینی شوێنەوارەکانەوە کەزاناکانی چەرخی تازە پێی هەستاون، وەدۆزینەوەی ئەم شوێنەوارانەش دەبنە بەلگە لەسەر بوونی ئەو ڕوداوانەی کەلە قورئانی پیرۆزدا باسیان لێوە کراوە، ئەوە دەسەلێنن کەدەبێت لەپێش هاتنی ئەم ڕووداوانەدا ئاگادار کرابنەوە، وەك چۆن چەندین جار لە چیرۆکە قورئانیەکاندا وێنا کراون، خوای گەورە لەئایەتەکانیدا فەرمانمان پیّ دەکات و دەفەرموێت : قُلْ سِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ ثُمَّ ٱنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُكَذِّبِينَ ﴿١١﴾ **الانعام** (١١). واتە : ﴿پێیان

بلّیّ : بڕۆن و بگەڕێن بەسەرزەویدا و پاشان تەماشا بکەن و سەرنج بدەن، بزانن سەرئەنجامی ئەوانەی بەرنامەی خوایان بەدرۆزانی چۆن بووە (چیمان بەسەر هێنان)﴾. وەهەروەها دەفەرموێت : وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ إِلَّا رِجَالًا نُّوحِىٓ إِلَيْهِم مِّنْ أَهْلِ ٱلْقُرَىٰٓ ۗ أَفَلَمْ يَسِيرُوا۟ فِى ٱلْأَرْضِ فَيَنظُرُوا۟ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۗ وَلَدَارُ ٱلْـَٔاخِرَةِ خَيْرٌ لِّلَّذِينَ ٱتَّقَوْا۟ ۗ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿١٠٩﴾ حَتَّىٰٓ إِذَا ٱسْتَيْـَٔسَ ٱلرُّسُلُ وَظَنُّوٓا۟ أَنَّهُمْ قَدْ كُذِبُوا۟ جَآءَهُمْ نَصْرُنَا فَنُجِّىَ مَن نَّشَآءُ ۖ وَلَا يُرَدُّ بَأْسُنَا عَنِ ٱلْقَوْمِ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿١١٠﴾ لَقَدْ كَانَ فِى قَصَصِهِمْ عِبْرَةٌ لِّأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ۗ مَا كَانَ حَدِيثًا يُفْتَرَىٰ وَلَـٰكِن تَصْدِيقَ ٱلَّذِى بَيْنَ يَدَيْهِ وَتَفْصِيلَ كُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً لِّقَوْمٍ يُؤْمِنُونَ ﴿١١١﴾ **يوسف**

(١٠٩-١١١). واتە ﴿ئێمە کەسمان نەناردووە لەپێش تۆدا جگە لەپیاوانێك کە

هەڵمان بژاردوون لە خەڵکی شارو شوێنەکان و نیگایان بۆ دەنێرین (تاپەیامی ئێمە بەڕوونی بگەیەنن) ئایا نەگەڕاون لەزەویدا، تاتەماشا بکەن و سەرنج بدەن کە چۆن بوو سەر ئەنجامی ئەوانەی پێش ئەمان (کاتێك یاخی بوون) بێگومان جێگەو ڕێگەو خانووبەرەی بەهەشت لەقیامەتدا چاکترە بۆ ئەوانەی کە خوا ناس بوون و پارێزکاریان کردووە، ئایا ئەوە عەقڵ و ژیریتان ناخەنەکار ؟! (ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) وامەزانە کەئەم ڕێگەیە بەگوڵ و گوڵزار چێنراوە، بەڵکو پڕە لەناخۆشی و ئازار و گەیشتوەتە ڕادەیەك کە) : هەتا بگرە کاتێك پێغەمبەران تووشی نائومێدی و بێ هیوایی دەبن و گومانی وادەبەن کە بەڕاستی ئەوان (بەرنامەکەیان) بەدرۆ زانراوە، ئەوە ئالەوکاتی بێ هیواییەدا، سەرکەوتنی تایبەتی ئێمە یان بۆدێت، ئەوسا ئەوەی بمانەوێت و شایستە بێت ڕزگاری دەکەین، چاکەس نیە بتوانێت تۆڵەی توندو تیژی ئێمە لەکەسانی تاوانبار و تاوانکار بگێڕێتەوە و بەر پەرچی بداتەوە . سوێند بێت بەخوا بەڕاستی لەسەر گوزە شتە و بەسەرهاتی پێغەمبەراندا پەندو ئامۆژگاری هەیە بۆ کەسانی ژیرو هۆشمەند، وەنەبێت ئەم قورئانە قسەو باسێك بێت هەڵبەستراو بێت، بەڵکو بەڕاست دانەری ئەوەیە کەلە پێش خۆیەوە هاتووە (تەورات و ئینجیل) و ڕوونکەرەوە و جیاکردنەوەی هەمووشتێکی پێویستە لەئایندا، ڕێنموویی و ڕەحمەتیشە بۆ کەسانێك باوەڕ دەهێنن﴾. ئەوەتا چەندین نمونەی ژیری و لێهاتوویی نەتەوەکانی پێشوو هەن کەبەهۆی سەر پێچی کردن و گوێ نەدانە فەرمانەکانی خوا لەناو بران، وەئەم نمونانەش ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەکەن کە ئادەمیزاد چەندە لاوازو بێ دەسەڵاتە لەبەرامبەر بەدیهێنەرەکەیدا. لەلاپەڕەکانی داهاتوودا باسی ئەم نمونانە دەکەین بەپێی زنجیرە مێژوویی و کاتیەکانی.

## بەشی یەکەم تۆفانی نوح

وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمۡسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ **العنکبوت** (١٤). واتە: ﴿سوێند بەخوا ئێمە – نوح – مان ڕەوانە کرد بۆ سەر قەوم و هۆزەکەی، هەزار ساڵ پەنجا کەم لەناویاندا مایەوە، سەرئەنجام لافاوو زریان هەموویانی پێچایەوە لەکاتێکدا ئەوان ستەم کار بوون﴾.

قورئانی پیرۆز چیرۆکی زریانەکەی نوح مان بۆ دەگێڕێتەوە، کە زۆر بەی فەرهەنگە کانی جیهان بشێوە یەکی بەرفراوان باسی لێوە دەکەن، وەئایەتەکانی قورئانیش بەدرێژی باسی هەڵوێستی هۆزەکەی نوح و چۆنیەتی بەرهەڵست کارانەی ئەو قەومەو گوێ نەدان و گاڵتە پێکردنی ئامۆژگاریەکانی نوح پێغەمبەر ڕوون دەکاتەوە، وەهەروەها باسی چۆنیەتی ڕوداوی تۆفان و زریانەکەمان بۆ دەکات. خوای پەروەردگار نوح پێغەمبەری نارد (سەلامی خوای لێ بێت) بۆسەر هۆزو نەتەوەکەی تاوەکو ئاگاداریان بکاتەوە چونکە گومڕاو سەرلێ شێواو بوون و هاوبەشیشیان بۆ خوای تاك و تەنها بڕیاردەدا. وەهەروەها ئاگاداریشیان بکاتەوە کەتەنها بەندایەتی و خوا پەرستی بۆ خوای تاك و تەنها بکەن و دووورکەونەوە لەو سەرکێشی و یاخی بوونەیان، جا نوح (سەلامی خوای لەسەربێت) چەندین جار هۆزو نەتەوەکەی ئاگادار دەکردەوە و ئامۆژگاری جوانی پێشکەش دەکردن و داوای لێ دەکردن کەتەنها گوێڕایەڵی فەرمانەکانی خوای گەورە بن، وە هەروەها نەتەوە و هۆزە کەشی لە خەشم و سزای خوای گەورە دەترساند بەڵام بە پێچەوانەوە هۆزو نەتەوەکەی زیاتر سەرکێشتر دەبوون و بەر پەرچی نوح پێغەمبەریان دەدایەوە (سەلامی خوای لێ بێت)، تاوای لێهات گومڕابوون و لەبری پەرستنی خوای گەورە

هاوبەشیان بۆبڕیاردەدا وشتانێکی تریان دەپەرست، ئەوەتا ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز لەسورەتی (**المؤمنون**) دا ئەم بارو دۆخەمان پێ پیشان دەدا وەك دەفەرموێت : وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ فَقَالَ ٱلْمَلَؤُا۟ ٱلَّذِينَ كَفَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِىٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا رَجُلٌۢ بِهِۦ جِنَّةٌ فَتَرَبَّصُوا۟ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٍ ﴿٢٥﴾ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ **المؤمنون** (٢٣-٢٦). واتە: ﴿سوێند بێت بێگومان ئێمە نوح پێغەمبەرمان ڕەوانە کرد بۆ سەرقەومەکەی، جا پێی وتن : ئەی قەوم و گەلەکەم هەر خوا بپەرستن، چونکە هیچ خوایەکی ترتان نیەجگەلەو، ئایا خۆتان لەخەشم و قینی ناپارێزن ؟! جائەوانەی کە بێ باوەڕ بوون لەدەستەی دەستەلاتداری قەومەکەی وتیان :

(گوێی بۆ مەگرن) ئەم پیاوە هەر کەسێکی وەك ئێوە، زیاتر نیە، دەیەوێت خۆی بکاتە گەورەتان !! ئەگەر خوا بیویستایە پێغەمبەرێك بنێرێت ئەوە فریشتەی دادەبەزاند، ئێمە ئەم هەواڵەمان لە باوو باپیرانی پێشوەوە نەبیستووە. ئەمە جگەلەوەی کە پیاوێکە شێتی سەری لێداوە، هیچی تر نیە، کەواتە تاماوەیەك مۆڵەتی بدەن و وازی لێ بهێنن : (یان کۆڵ دەدات، یان دەمرێت).

ئەوسا نوح ووتی : پەروەردگارا، سەرکەوتنم پێ ببەخشە چونکە بڕوایان پێ نەکردم﴾. جاهەر وەك چۆن ئایەتە پیرۆزە کانی قورئان ئاماژەیان پێ کرد بەو شێوەیە گەورەو سەردارانی هۆزەکە تۆمەتی نەشیاویان خستە پاڵ حەزرەتی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) بەوەی کە داوای گەورەیی و پلەوپایە و سەروەت و سامان دەکات، هەوڵیان دا ئەوەی بەسەردا بسەلێنن کە ئەم پیاوە شێت. وەبڕیاری

ئەوەشیاندا کە بۆماوەیەك مۆڵەتی بدەن و وازی لێ بهێنن وە لە ژێر فشاری خۆیاندا بیهێڵنەوە. بەم پێیە یە خوای پەروەردگار نوح پێغەمبەری ئاگادار کردەوە و هەواڵی دایە کە بەدڵنیاییەوە سزای بێ بڕوایانی قەومەکەی دەدات و بڕوادارانیش ڕزگار دەکات. وەکاتێك ماوەی دیاری کراوی تۆفانەکە نزیك بویەوە و کانیەکانی زەوی تەقین و لەگەڵ بارانە چڕوپڕەکەدا گەیشتن بەیەك بۆئەوەی تۆفان و زریانە گەورەکە دروست ببێت، خوای پەروەردگار بە نوح پێغەمبەری فەرموو : فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ ۙ فَٱسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ ۖ وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ ۖ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾ **المؤمنون**

**(٢٧). واتە : ﴿لەهەمووجۆرێك جووتێك سوار بکە، هەروەها خاوخێزانت جگە لەوانەی کەپێشتر بڕیاری غەرق بوونیان لەسەردراوە﴾. لەڕاستیدا تەواوی ئەوانەی کەلەسەر ئەو زەویەدا بوون بەکوڕەکەی نوحی شەوە (سەلامی خوای لەسەر بێت) غەرق بوون کەوای گومان دەبرد پەنایەك پەیدا دەکات لەیەکێك لەشاخە نزیکەکانی دەوروبەری تاوەکولەو زریانە بیپارێزێت، بەڵام زریان و تۆفانەکە تەواوی قەومەکەی گرت و لەناوی بردن، جگە لەو کەسانەی کە حەزرەتی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) لەسەر کەشتیەکە هەڵیگرتبوون، جاکاتێك زەوی وشك بویەوەوَقِيلَ** يَٰٓأَرْضُ ٱبْلَعِى مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقْلِعِى وَغِيضَ ٱلْمَآءُ وَقُضِىَ ٱلْأَمْرُ وَٱسْتَوَتْ عَلَى ٱلْجُودِىِّ ۖ وَقِيلَ بُعْدًا لِّلْقَوْمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ **هود (٤٤) ئیتر ئاوەکە ڕۆچوو وە زریانەکەش کۆتایی پێهات، کەشتیەکەش لەسەر کێوی جودی وەستاو لەنگەری گرت هەروەك قورئانی پیرۆزیش ئاماژەی پێدەکات. لێکۆڵینەوە و بەدواداچوونە**

مێژوو یی و شوێنەوار ناسی و زەوی ناسەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەئەم ڕووداوە ڕوویداوە وەك چۆن قورئانی پیرۆز باسی لێوە کردووە، لەڕاستیدا لەزۆرێك لەتۆمارە مێژوو ییەکان و پاشماوە شارستانیە کۆنەکانیشدا ئەم چیرۆکە هاتووە، وێڕای جیاوازی ناوو شوێنی کەسەکان، هەمموو ئەم ڕووداوانە کەبەسەر ئەوهەمموو قەوم و نەتەوە گومڕایانەدا ڕوویانداوە وەك هەڕەشەو ئاگادارکردنەوە پیشانی مرۆڤی ئەم سەردەمە دەدرێت. جگە لە سەردەمی کۆن و سەردەمی نوێ (عەهدی قەدیم و عەهدی جدید)، تۆماری سۆمەری و بابلی و ئاشوریەکان و داستانی یۆنانی و داستانەکانی شاتاباثا و براهما و ماهاباهارتای هیندیش بۆ مانی دەگێڕنەوە، وەهەروەها داستانەکانی وێلزو لیتوانیە و تەنانەت چیرۆکە کۆنەکانی چینیش ئەم زریانەمان بەچیرۆك بۆ باس دەکەن. بەلاّم چۆن دەتوانین ئەم هەمموو زانیاریە درێژو پەیوەستدارە لەیەك بابەتدا پێکەوە کۆبکرێتەوە لەکاتێکدا ئەم زەوریانە لەڕووی جوگرافی و ڕۆشنبیری و تەنانەت لەشوێنی زریانەکەشەوە دوورن ؟ وەلاّمەکەی ڕۆشنە : گومانی تێدا نیە بوونی ئاوەها چیرۆکێك کەباس لەیەك ڕووداو دەکەن، لەتۆمارگەی ئەم شارستانیەتانەدا تەواو جیاوازن لەکاتێکدا هیچ ئەلقەی بەیەك گەیشتنێك لەنێوانیاندا نیە، ئەمەش بەلگەی تەواوە کەئەم هۆزو نەتەوانە زانستیان لەسەرچاوەیەکی خواییەوە وەرگرتووە، وەژمارەیەکی زۆری پێغەمبەران بەتێپەڕبوونی سەدەکان بۆ شارستانیەتە جیاوازەکان نێرراون و هەوالّی چیرۆکی تۆفانیشیان پێداون کەبەگەورە ترین ڕووداو دادەنرێت لە مێژووی مرۆڤایەتیدا، وەئەم هەوالانەش وەك نمونەو ئامۆژگاری بەکار هێنراونەوە بەم شێوەیە چیرۆکی تۆفان لەتەواوی شارستانیەتەکاندا بلاو بوەتەوە. وێڕای ئەوەی کەئەم چیرۆکە لە چەندین کلتورو سەرچاوەی ئاینیەوە گوێزراوەتەوە، بەلاّم چیرۆکی تۆفان و نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لەسەر بێت) دووچاری زۆرێك لەدەستکاری و گۆڕین بووەتەوە کە دوورن لەسەرچاوە ی ڕاستیانەوە، ئەویش بەهۆی ساختەکاری

سەرچاوەکانەوە، یاخود گوێزانەوەی بەهەڵە، یان دەتوانین بڵێین : بەهۆی نیەت و مەبەستی خراپەوە بووە، لێکۆڵەرەوەکان ئەوەیان ئاشکرا کردووە کەتاکە چیرۆکێك تۆکمە و یەکگرتوو بێت لەنێوان تێکڕای چیرۆکەکاندا و باسی تۆفانەکەی نوحی تیابێت. وەلەگەڵ ئەوهەموو جیاوازیانەشدا لەسەربنەمای هەمان ڕووداو بونیاد نرابێت ئەو چیرۆکەیە کە قورئانی پیرۆز گێڕاویەتیەوە و باسی دەکات .

## نوح پێغەمبەروتۆفانەکە لەقورئانی پیرۆزدا

باسی زریانەکەی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) لە زۆرێك لەئایەتەکانی قورئاندا باسکراوە، وەبەپێی زنجیرەی ڕووداوەکان ئایەتەکانی بۆ دەهێنینەوە .

## نوح پێغەمبەر بانگی گەلەکەی دەکات بۆ سەرئاینی ڕاست ودروست

لَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥٓ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٥٩﴾

**الاعراف** (٥٩). واتە : ﴿سوێند بەخوا بەڕاستی ئێمە –نوح– مان ڕەوانە کرد بۆ سەرقەومەکەی، جائەویش پێی وتن : ئەی گەل و هۆزم ئێوە هەر خوا بپەرستن، چونکە جگە لەوزاتە خوایەکی ترتان نیە، بەڕاستی من دەترسم لەڕۆژێکی گەورەدا تووشی بەلاوسزایەکی زۆر سەخت بن إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ نُوحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٠٦﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٠٧﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٠٨﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١١٠﴾

**الشعراء** (١٠٦-١١٠). واته: ﴿کاتێك -نوح – ی برایان پێی وتن : باشه ئەوەئێوه لەخوا ناترسن، پارێزکار نابن ؟! بەڕاستی دڵنیابن کەمن فرستادەیەکی ئەمین و دڵسۆزم بۆ تان....کەوابوو لەخوا بترسن و فەرمان بەرداری من بکەن....من داوای هیچ جۆره پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەری، من تەنها پاداشتی خۆم لەپەروەر دگاری جیهانەکان دەخوازم. هەمیشە لەخوا بترسن و فەرمان بەرداری من بن...﴾.

﴿ وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦ فَقَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۚ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٢٣﴾ ﴾ **المؤمنون** (٢٣). واته : ﴿سوێند بێت بێگومان ئێمه –نوح –پێغەمبەرمان ڕەوانەکرد بۆ سەرقەومەکەی، جاپێی وتن : ئەی قەوم و گەلم هەر خوا بپەرستن، چونکه هیچ خوایەکی ترتان نیه جگەلەو، ئایا خۆتان لەخەشم و قینی ناپارێزن ؟!﴾

## نوح پێغەمبەرگەلەکەی بەسزای سەختی خوایی ئاگاداردەکاتەوە

﴿ إِنَّآ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ أَنْ أَنذِرْ قَوْمَكَ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿١﴾ ﴾ **نوح** (١). واته :﴿بەڕاستی ئێمه –نوح –مان ڕەوانەکرد بۆ لای قەومەکەی، فەرمانمان پێدا کە : قەومەکەت بێدار بکەرەوە پێش ئەوەی سزایەکی بەئێش یەخەیان پێ بگرێت﴾. حەزرەتی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) دەفەرموێت : ﴿ فَسَوْفَ تَعْلَمُونَ مَن يَأْتِيهِ عَذَابٌ يُخْزِيهِ وَيَحِلُّ عَلَيْهِ عَذَابٌ مُّقِيمٌ ﴿٣٩﴾ ﴾ **هود** (٣٩). واته : ﴿جالەداهاتوودادەزانن کێ سزایەکی بۆ دێت کە ڕیسوای بکات، پاشان لەقیامەتدا دووچاری سزایەکی بەردەوام و هەمیشە دەبێت﴾ وەهەروەها

دەفەرمویت : ﴿أَن لَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٢٦﴾﴾ **هود** (٢٦). واته :﴿جگە لەخوا (کەس و هیچی تر نەپەرستن) چونکە من بەڕاستی دەترسم سزای ڕۆژێکی بەئێش یەخەتان پێ بگرێت (هەموتان لەناو بچن)﴾.

## بەدرۆ خستنەوەی گەلەکەی نوح

﴿قَالَ ٱلْمَلَأُ مِن قَوْمِهِۦٓ إِنَّا لَنَرَىٰكَ فِي ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٦٠﴾﴾ **الاعراف** (٦٠). واته : ﴿دەستەی دەسەڵات داری قەومەکەی وتیان بەڕاستی ئێمە تۆ لەنێوان گومڕاییەکی ئاشکرادا دەبینین !!﴾. ﴿قَالُواْ يَٰنُوحُ قَدْ جَٰدَلْتَنَا فَأَكْثَرْتَ جِدَٰلَنَا فَأْتِنَا بِمَا تَعِدُنَآ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٣٢﴾﴾ **هود** (٣٢). واته : ﴿خەڵکەکە وتیان : ئەی نوح بەڕاستی زۆر لەسەری چویت و زیاد لە پێویست بەربەرەکانی و شەڕە قسەت لەگەڵدا کردین ئەو سزایەمان بۆ بهێنە کە هەڕەشەی پێدەکەیت و هەمیشە باسی دەکەیت و دەمان ترسێنی پێی، ئەگەر تۆ لە ڕاست گۆیانیت﴾. ﴿وَيَصْنَعُ ٱلْفُلْكَ وَكُلَّمَا مَرَّ عَلَيْهِ مَلَأٌ مِّن قَوْمِهِۦ سَخِرُواْ مِنْهُ ۚ قَالَ إِن تَسْخَرُواْ مِنَّا فَإِنَّا نَسْخَرُ مِنكُمْ كَمَا تَسْخَرُونَ ﴿٣٨﴾﴾ **هود ئایەتی** (٣٨). واته : ﴿نوح یش دەستی کردبە دروستکردنی کەشتیەکە، هەرجارێك تاقمێك لەهۆزەکەی بەلایدا تێدە پەڕین، گاڵتەیان پێ دەکرد، (نوح) وتی : ئەگەر ئێستەئێوە گاڵتەبە ئێمە دەکەن، ئەوە بەڕاستی ئێمەش ڕۆژێك دێت گاڵتە بەئێوە بکەین وەك چۆن ئێوە گاڵتە بە ئێمە دەکەن﴾. ﴿فَقَالَ ٱلْمَلَؤُاْ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوْمِهِۦ مَا هَٰذَآ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يُرِيدُ أَن يَتَفَضَّلَ عَلَيْكُمْ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَأَنزَلَ مَلَٰٓئِكَةً مَّا سَمِعْنَا بِهَٰذَا فِيٓ ءَابَآئِنَا ٱلْأَوَّلِينَ ﴿٢٤﴾

﴿ إِنۡ هُوَ إِلَّا رَجُلُۢ بِهِۦ جِنَّةٞ فَتَرَبَّصُواْ بِهِۦ حَتَّىٰ حِينٖ (٢٥) ﴾ المؤمنون (٢٤-٢٥). واته :﴿جاله وانه ی که بیّ باوه ڕبوون له ده ستەی ده سەلاّتداری قەومەکەی وتیان: (گوێی بۆمەگرن) ئه م پیاوه هەرکەسێکی وەك ئێوەیەو زیاترنیه، دەیەوێت خۆی بکاته گه ورەتان !! ئەگەرخوا بیویستایەپێغەمبەرێك بنێرێت ئەوە فریشتەی دادەبەزاند ئێمە ئەم هەواڵەمان لەباووباپیرانی پێشووەوه نەبیستوه ئەمەجگه لەوەی کەپیاوێکه شێتی لەسەری داوەوهیچی ترنیه، کەواته تاماوەیەك مۆڵه تی بدەن و وازی لیّ بهێنن (یان کوڵ ده دات یان ده مرێت)﴾. ﴿ كَذَّبَتۡ قَبۡلَهُمۡ قَوۡمُ نُوحٖ فَكَذَّبُواْ عَبۡدَنَا وَقَالُواْ مَجۡنُونٞ وَٱزۡدُجِرَ (٩) ﴾ القمر (٩). واته: ﴿پێش ئەمانیش قەومی نوح بڕوایان بەبەندەی بەڕێزی ئێمه نەکرد و وتیان : شێته، زۆریش پیایدا هەڵشاخان و دژایەتی کرا﴾ .

# بەسووك زانینی بیّ باوەڕانی قەومی نوح بۆ ئەوانەی شوێن نوح پێغەمبەرکەوتبون (سەلامی خوای لیّ بێت)

﴿ فَقَالَ ٱلۡمَلَأُ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ مِن قَوۡمِهِۦ مَا نَرَىٰكَ إِلَّا بَشَرٗا مِّثۡلَنَا وَمَا نَرَىٰكَ ٱتَّبَعَكَ إِلَّا ٱلَّذِينَ هُمۡ أَرَاذِلُنَا بَادِيَ ٱلرَّأۡيِ وَمَا نَرَىٰ لَكُمۡ عَلَيۡنَا مِن فَضۡلِۭ بَلۡ نَظُنُّكُمۡ كَٰذِبِينَ (٢٧) ﴾ هود (٢٧). واته : ﴿جائەو دەسته دەسەلاّتدارەی کەبیّ باوەڕ بوون لەهۆزی نوح وتیان : ئێمه تۆ تەنها وەك یەکێك لەخۆمان دەبینین و نابینین ئەوانەی شوێنی تۆ کەوتوون جگه لەوانەی کەهەژار و داماوەکانمانن و دووربین نین و ژیریان کەمەو سادەن، هەروەها نابینین ئێوە هیچ شتێکی زیاترتان بەسەر ئێمەدا هەبێت بەڵکو ئێمه واگومان دەبەین ئێوە درۆزنن﴾. ﴿ قَالُواْ

أَنُؤْمِنُ لَكَ وَاتَّبَعَكَ الْأَرْذَلُونَ ﴿١١١﴾ قَالَ وَمَا عِلْمِي بِمَا كَانُوا يَعْمَلُونَ ﴿١١٢﴾ إِنْ حِسَابُهُمْ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّي لَوْ تَشْعُرُونَ ﴿١١٣﴾ وَمَا أَنَا بِطَارِدِ الْمُؤْمِنِينَ ﴿١١٤﴾ إِنْ أَنَا إِلَّا نَذِيرٌ مُبِينٌ ﴿١١٥﴾ ﴾ **الشعراء** (١١١-١١٥). واته: ﴿(هەندێ لە دەمدارانی قەومەکەی) وتیان: ئێمە چۆن باوە ڕلەبەرخاتری تۆبهێنین، لە کاتێکدا کە کەسانی هەژاروداماو شوێنت کەوتوون ا نوح وتی : جامن چوزانم ئەوان چ کاروکردە وە یە کیان ئە نجام دە دا (من بانگم کردن بۆ ئیمان و بڕوایان هێناوە) حیساب و لێپرسینەوەیان تەنهالەسەرپەروەردگاری مەنەو لەسەرکەسی ترنیە، ئەگە ر هەست و هۆشیاریتان هەیە... من هەرگیز ئیمانداران دەرناکەم و(دڵیان نائێشێنم) بەڵکو من تەنها بێدارکە رە وەیەکی ئاشکرانە بێت هیچی ترنیم﴾.

## ئامۆژگاری خوای گەورەبۆ نوح کەوا دڵتەنگ نەبێت

﴿وَأُوحِيَ إِلَىٰ نُوحٍ أَنَّهُ لَن يُؤْمِنَ مِن قَوْمِكَ إِلَّا مَن قَدْ آمَنَ فَلَا تَبْتَئِسْ بِمَا كَانُوا يَفْعَلُونَ ﴿٣٦﴾ ﴾ **هود** (٣٦). واته : ﴿سەرەنجام وەحی و پەیامی خوا ڕەوانەکرا بۆ نوح کە چاك بزانە بەڕاستی هەرگیز کەسی تربڕوا ناهێنێت لەقەومەکەت جگە لەوەی کەبەڕاستی بڕوای هێناوە، کەوابوو خەفەتبارمەبە بەوکردەوە ناشیرین و ناپەسەندانەی ئەنجامیان دەدا﴾

## پاڕانەوەی نوح (سەلامی خوای لیّ بیّت)

﴿ فَٱفۡتَحۡ بَيۡنِي وَبَيۡنَهُمۡ فَتۡحٗا وَنَجِّنِي وَمَن مَّعِيَ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿١١٨﴾ ﴾ **الشعراء** (١١٨). واته : ﴿كەواتە داواكارم سەركەوتنم پیّ ببەخشیت بەسەریاندا و دەروم لیّ بکەیتەوە و خۆم وئیماندارانی یاوەریشم ڕزگار بکەیت﴾. ﴿ فَدَعَا رَبَّهُۥٓ أَنِّي مَغۡلُوبٞ فَٱنتَصِرۡ ﴿١٠﴾ ﴾ **سورەتی القمر ئایەتی** (١٠). واته : ﴿ئەویش دوای (٩٥٠) ساڵ هاناو هاواری بۆ پەروەردگاری بردو وتی : خوایە : بەڕاستی من شکستم خواردووە و سەرکەوتنم پیّ ببەخشە﴾. ﴿ قَالَ رَبِّ إِنِّي دَعَوۡتُ قَوۡمِي لَيۡلٗا وَنَهَارٗا ﴿٥﴾ فَلَمۡ يَزِدۡهُمۡ دُعَآءِيٓ إِلَّا فِرَارٗا ﴿٦﴾ ﴾ **نوح** (٥-٦) واته ﴿دوای سەدەها ساڵ بانگەواز نوح سکاڵای کردو وتی پەروەردگارا من بەشەو بەڕۆژ بانگی قەوم و گەلەکەمم کرد بۆ یەکتا پەرستی. کەچی بانگەوازەکەی من هیچی زیاد نەکرد : تەنها ڕاکردنیان نەبیّت﴾. ﴿ قَالَ رَبِّ ٱنصُرۡنِي بِمَا كَذَّبُونِ ﴿٢٦﴾ ﴾ **المؤمنون** (٢٦). واته : ﴿ئەوسا نوح وتی پەروەردگارا سەرکەوتنم پیّ ببەخشە چونکە بڕوایان پیّ نەکردم﴾. ﴿ وَلَقَدۡ نَادَىٰنَا نُوحٞ فَلَنِعۡمَ ٱلۡمُجِيبُونَ ﴿٧٥﴾ ﴾ **الصافات** (٧٥) واته : ﴿بێگومان نوح هاناو هاواری بۆ هێناین، ئێمەیش چاکترین فریاد ڕەسێك بووین کە بەهانا و هاواریەوە چووین﴾.

## دروست كردنى كەشتى

﴿ وَٱصۡنَعِ ٱلۡفُلۡكَ بِأَعۡيُنِنَا وَوَحۡيِنَا وَلَا تُخَٰطِبۡنِي فِي ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓاْ إِنَّهُم مُّغۡرَقُونَ ﴿٣٧﴾ ﴾ **هود** (٣٧) واتە ﴿كەشتيەك دروست بكە بەچاو دێرى و فەرمانى ئێمە،(كاتى تۆفانەكە) تكامان لىٚ نەكەيت بۆئەوانەى لەسنوورى ڕاستى دەرچوون وتاوانبارن، چونكە بەڕاستى ئەوانە بڕيارى خنكاندن و تيا چوونيان بۆ دراوە﴾

## تياچوونى قەومى نوح(سەلامى خوا لىٚ بێت) بەتۆفان

﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيۡنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَآۚ إِنَّهُمۡ كَانُواْ قَوۡمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ **الاعراف** (٦٤) واتە : ﴿دواى (٩٥٠) ساڵ هەوڵ و كۆشش هەربەرنامەكە يان بەدرۆ زانى و بڕوايان پىٚ نەكرد، جا ئێمەش خۆيو ئەوئيماندارانەى كەلەگەڵيدا بوون لەكەشتيەكەدا ڕزگارمان كردن و ئەوانەى بڕوايان نەهێنا بە ئايەت و فەرمانەكانمان نوقمى زريانەكەمان كردن، چونكە بەڕاستى ئەوان گەلێكى كوێرو نابينا بوون (لەئاستى ڕاستيەكاندا) ﴿ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا بَعۡدُ ٱلۡبَاقِينَ ﴿١٢٠﴾ ﴾ **الشعراء** (١٢٠) واتە : ﴿پاشان دواى ئەوان هەرچى مايەوە (لەخەڵكە گومڕاكە) نوقمى ئاوى زريانەكەمان كرد﴾.﴿ وَلَقَدۡ أَرۡسَلۡنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوۡمِهِۦ فَلَبِثَ فِيهِمۡ أَلۡفَ سَنَةٍ إِلَّا خَمۡسِينَ عَامًا فَأَخَذَهُمُ ٱلطُّوفَانُ وَهُمۡ ظَٰلِمُونَ ﴿١٤﴾ ﴾ **العنكبوت** (١٤) واتە : ﴿سوێند بە خوا ئێمە نوح مان ڕەوانە كرد بۆ سەر قەوم وهۆزە كەى، هەزار ساڵ پەنجا كەم لەناوياندامايەوە، سەرەنجام لافاووزريان هەموويانى پێچايەوە لەكاتێكدا ئەوان ستەمكاربوون﴾. ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيۡنَٰهُ وَمَن

مَعَهُۥ فِي ٱلۡفُلۡكِ وَجَعَلۡنَٰهُمۡ خَلَٰٓئِفَ وَأَغۡرَقۡنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَاۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلۡمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾ **یونس** (٧٣) واته : ﴿کەچی بانگەوازەکەیان بەدرۆ زانی، ئینجا ئێمەش نوح و هەموو ئەوانەی کەلەگەڵیدابوو لەکەشتیەکەدا ڕزگارمان کرد و کردیشمانن بە جێنشین و هەموو ئەوانەمان نوقمی ڕەهێڵ و زریانەکە کرد کەبڕوایان بەئایەت و فەرمانەکانی ئێمە نەبوو، ئینجاتەماشاکەو سەرنج بدەو بزانە سەرەنجامی ئەو کەسانە چۆن بوو کەبێدار کرا بوونەوە و هۆشیاریان پێ درابوو﴾.

## تیاچوونی کوڕەکەی نوح (سەلامی خوای لێ بێت)

قورئانی پیرۆز ئەو وتوووێژەی کەلەنێوان نوح وکوڕەکەیدا لەقۆناغە سەرەتاییەکانی تۆفانەکەداڕوویدا بۆمانی دەگێڕێتەوە :﴿ وَهِيَ تَجۡرِي بِهِمۡ فِي مَوۡجٖ كَٱلۡجِبَالِ وَنَادَىٰ نُوحٌ ٱبۡنَهُۥ وَكَانَ فِي مَعۡزِلٖ يَٰبُنَيَّ ٱرۡكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٤٢﴾ قَالَ سَـَٔاوِيٓ إِلَىٰ جَبَلٖ يَعۡصِمُنِي مِنَ ٱلۡمَآءِۚ قَالَ لَا عَاصِمَ ٱلۡيَوۡمَ مِنۡ أَمۡرِ ٱللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَۚ وَحَالَ بَيۡنَهُمَا ٱلۡمَوۡجُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡمُغۡرَقِينَ ﴿٤٣﴾ ﴾ **هود** (٤٢-٤٣) واته : ﴿کەشتیەکەش دەیبردن بەناو شەپۆلی وەك چیادا، نوح بانگی کردە کوڕەکەی (ئەوەیان کە بێ باوەڕ بوو) لەشوێنێکی چەپەکدا گیری خواردبوو پێی وت : ڕۆڵە گیان، لەگەڵ ئێمە دا سواربەو لەگەڵ بێ باوەڕاندا مەبە، کوڕەکەی وتی پەنائەبەمە لای ئەو چیایەو دەمپارێزێت لەم زریان و ئاوە نوح وتی : ئەمڕۆ هیچ پەنا دەرێك نیە لە تۆڵە و خەشمی خوا کەس بپارێزێت مەگەر کەسێك خوا خۆی ڕەحمی پێ بکات، ئەوسا (دوای ئەم و تووێژە) شەپۆلی ئاو دای بەنێوانیاندا و جیا چووەڕیزی خنکاوەکانەوە﴾.

## ڕزگاربوونی بڕواداران لەتۆفانەکە

﴿ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَصْحَـٰبَ ٱلسَّفِينَةِ وَجَعَلْنَـٰهَآ ءَايَةً لِّلْعَـٰلَمِينَ ﴿١٥﴾ ﴾ **العنكبوت** (١٥)
واتە : ﴿ئەو کاتە ئیتر ئەومان ڕزگارکرد هاوڕێ لەگەڵ هەموو سەرنشینەکانی کەشتیەکەدا و ئەو ڕووداوو کەشتیەمان کردە بەڵگە و نیشانە بۆ هەموو لایەك و هەموونەوەکان﴾. ﴿ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ ٱلْمَشْحُونِ ﴿١١٩﴾ ﴾ **الشعراء** (١١٩)
واتە ﴿ئەوسا ئێمە خۆی و هەرچی لەگەڵیدا بوون ڕزگارمان کرد لەکەشتیە بار هەڵگرە کەدا﴾.

## سروشتی مادی بۆ تۆفانەکە

﴿ فَفَتَحْنَآ أَبْوَٰبَ ٱلسَّمَآءِ بِمَآءٍ مُّنْهَمِرٍ ﴿١١﴾ وَفَجَّرْنَا ٱلْأَرْضَ عُيُونًا فَٱلْتَقَى ٱلْمَآءُ عَلَىٰٓ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ ﴿١٢﴾ وَحَمَلْنَـٰهُ عَلَىٰ ذَاتِ أَلْوَٰحٍ وَدُسُرٍ ﴿١٣﴾ ﴾ **القمر** (١١-١٣) واتە :
﴿ئەوسا ئیتر ئێمە دەروازەکانی ئاسمانمان هاوڕێ لەگەڵ ئاوێکی خوڕدا کردەوە، هەموو زەویشمان کرد بە کانیاوو ئاومان لێ هەڵقولاند، ئیتر ئاوی ئاسمان و زەوی بەتەقدیرو ویستی خوا بەیەك گەیشتن، بەڕاستی بڕیاری لەسەر درابوو، ئەوسا نوح مان لەسەر چەند تەختەو بزمارێك هەڵگرت (مەبەست کەشتیەکەیە)﴾. ﴿ حَتَّىٰٓ إِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ قُلْنَا ٱحْمِلْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ وَمَنْ ءَامَنَ ۚ وَمَآ ءَامَنَ مَعَهُۥٓ إِلَّا قَلِيلٌ ﴿٤٠﴾ ۞ وَقَالَ ٱرْكَبُوا۟ فِيهَا بِسْمِ ٱللَّهِ مَجْر۪ىٰهَا وَمُرْسَىٰهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى لَغَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴿٤١﴾ ﴾ **هود** (٤٠-٤١) واتە : ﴿(ئەم کێشەیە بەردەوام بوو) هەتا ئەوکاتەی بڕیارمان هاتوو فەرمان دەرچوو(بەلەناو بردنی بێ

باوەڕەکان) لەتەنورە پڕ ئاگرەکەوە ئاو فوارەی کرد (کەئەوە نیشانەی تۆڵە خواییەکەبوو) ئە وسا وتمان : ئەی نوح لەهەموو نێرو مێ یەك دوان هەڵبگرە لەکەشتیەکەدا و ماڵ و خێزانت، جگە لەوانەی بڕیاریان لەسەر دراوە توشی تۆڵە بن بەهۆی بێ باوەڕیانەوە، ئەوانەش هەڵگرە کەباوەڕیان هێناوە (شایانی باسە) کەسیش بڕوای بە نوح نەکردو لەگەڵیدا نەبوو جگە لە کەسانێکی کەم نەبێت. نوح وتی : سوارببن و بڕۆنە ناوکەشتیەکەوە، بەناوی خواوەیە ڕۆشتن و وەستانی، بێگومان پەروەردگارم زۆر لێ خۆشبووە و زۆر بەبەزەییە﴾. ﴿ فَأَوْحَيْنَآ إِلَيْهِ أَنِ ٱصْنَعِ ٱلْفُلْكَ بِأَعْيُنِنَا وَوَحْيِنَا فَإِذَا جَآءَ أَمْرُنَا وَفَارَ ٱلتَّنُّورُ فَٱسْلُكْ فِيهَا مِن كُلٍّ زَوْجَيْنِ ٱثْنَيْنِ وَأَهْلَكَ إِلَّا مَن سَبَقَ عَلَيْهِ ٱلْقَوْلُ مِنْهُمْ وَلَا تُخَٰطِبْنِى فِى ٱلَّذِينَ ظَلَمُوٓا۟ إِنَّهُم مُّغْرَقُونَ ﴿٢٧﴾ ﴾ المؤمنون (٢٧) واتە : ﴿ئینجا ئێمەش ئاگادارمان کرد کە کەشتیەکە دروست بکات لەژێرچاودێری و نیگای ئێمەدا، جاهەرکاتێك فەرمانی ئێمەدەرچوو، تەنورەکە فوارەی کردوو ئاوی لێ دەرهات، ئەوەلەهەموو جۆرێك جوتێك سواربکە، هەروەها خاووخێزانت جگە لەوانەی کەپێشتر بڕیاری غەرق بونیان لەسەر دراوە، جادەربارەی ئەوانەی کە ستەمیان کردوو (باوەڕیان نەهێنا) لێم مەپاڕێرەوە، چونکە بەڕاستی ئەوانە هەموو نوقم کراون (لەزریانە کەدا)﴾.

## وەستانی کەشتیەکە لەسەر بەرزاییەکی سەر زەوی

﴿ وَقِيلَ يَٰٓأَرۡضُ ٱبۡلَعِي مَآءَكِ وَيَٰسَمَآءُ أَقۡلِعِي وَغِيضَ ٱلۡمَآءُ وَقُضِيَ ٱلۡأَمۡرُ وَٱسۡتَوَتۡ عَلَى ٱلۡجُودِيِّۖ وَقِيلَ بُعۡدٗا لِّلۡقَوۡمِ ٱلظَّٰلِمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾ **هود** (٤٤) واتە : ﴿پاشان فەرمان درا بەزەوی : ئاوەکەت باڕابچێت بەناختدا، ئەی ئاسمان : تۆش بابەس بێت و باران مەبارێنە، ئیتر ئاوەکە ڕۆچوو، فەرمانیش بەڕێکی وتەواوی ئەنجام درا، کەشتیەکەش لەسەرکێوی جودی وەستاو لەنگەری گرت و وترا : دەك دووری لەبەزەیی خوا و تیاچوون بۆ بەرەی ستەمکاران﴾.

## لایەنی ئاراستەکراو لەڕووداوی تۆفانەکە

﴿ إِنَّا لَمَّا طَغَا ٱلۡمَآءُ حَمَلۡنَٰكُمۡ فِي ٱلۡجَارِيَةِ ﴿١١﴾ لِنَجۡعَلَهَا لَكُمۡ تَذۡكِرَةٗ وَتَعِيَهَآ أُذُنٞ وَٰعِيَةٞ ﴿١٢﴾ ﴾ **الحاقة** (١١-١٢) واتە ﴿بەڕاستی ئێمە کاتێك ئاو لەسنوور دەرچوو (لەکاتی تۆفانەکەی نوح دا) ئێوەمان لەکەشتیدا هەلگرت (باووباپیرانی ئێوە). تابیکەینە یادگاری و بێدار کەرەوە بۆ ئێوە و لەگوێی بگرێت ئەوگوێیانەی هۆشمەندن﴾.

# پیاهەڵدانی پەروەردگار بۆ نوح (سەلامی خوای لێ بێت)

﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٖ فِي ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨١﴾ ﴾ **الصافات** (٧٩-٨١) واتە ﴿سلاولەسەر نوح لەلایەن سەرجەم ئیماندارانەوە لەهەمووکات و شوێنێکدا. بەڕاستی ئێمە ئابەو شێوەیە پاداشتی چاکە کەران دەدەینەوە، بەڕاستی ئەو لەبەندە ئیماندارەکانی ئێمەیە﴾.

## ئایا کارەساتی تۆفانەکە جیهانی بوو یاخود ناوچەیی

ئەوانەی کەوا بانگەشە بۆ نکوڵی کردنی ڕوودانی زریانەکەی نوح دەکەن،لەڕاستیدا هەڵوێستیان لەم نکوڵی کردنەیاندا گۆڕینی ڕوودانی زریانەکەیە لەبارێکەوە بۆ دۆبارێکی تر، وەهەروەها نکوڵی ئەوەش دەکەن کە زریانەکە هەموجیهانی گرتبێتەوە، هەروەك لەڕاستیشدامەبەستیان لەم نکوڵی کردنەبۆئەوڕووداوانەوهەرجۆرە ڕووداوێك کەباس لەزریان وتۆفان دەکەن بۆبەدرۆخستنەوەی قورئان وئەوباسانەیەکەلەقورئانداباسیان لێوەکراوە. لەڕاستیداچیرۆکی تۆفان کەلەقورئانداهاتووە —وەئەوەشی کە لە دەستکاری وگۆڕین ڕزگاری بوبێت —جیایەلەوداستان وئەفسانانەی تۆفان کە بەشێوەی جیاوازلەتەورات ولەزۆرێك لەکلتورو فەرهەنگی نەتەوەکانی دیکەدا هاتوون، وەلەبەشێك لەپێنج ئەفسارەکەی موساداهاتووە (کەیەکێکە لەپێنج کتێبە سەرەتاییانەی عەهدی کۆن) دەڵێ تۆفانەکەی نوح جیهانی بوو وەتەواوی جیهانیشی داپۆشی بوو، ئەمە جگە لەوەی قورئانی پیرۆز هیچ ئاماژەیەکی بەمە نەداوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە ئایەتەکانی قورئان باس لەوە دەکەن کەئەم زریانە ناوچەیەکی دیاری کراوی داپۆشیبوو هەموو جیهانی نەگرتبوویەوە، وەلەڕاستیشدا ئەم زریان و تۆفانەش تەنها هۆزو نەتەوەی نوحی نوقم کرد کە نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) ئاگاداری کردن، جالەفەرمانی دەرچوون و یاخی بوون، وە بەوهۆیەوە شایستەی سزاوتۆڵەی سەختی خوایی بوون. کاتێك سەرنجی باسەکانی عەهدی کۆن و قورئانی پیرۆز دەدەیت و لێی دەکۆڵیتەوە ئەم جیاوازیە بەڕوون و ئاشکرا دەبینیت.

عەهدی کۆن (لەماوەی مێژوویدا کە دووچاری زۆرێك لەزیاد کردن و گۆڕانکاری بووەتەوە بەشێوەیەك کە وەك وەحی و نیگایەکی پاك پشتی پێ نابەسترێت)، وابەم

شێوەیەوسفی سەرەتای تۆفانەکەمان بۆ دەکات : (خوای گەورە ئادەمیزادی بینی کە خراپەی لەسەرزەویدا زۆر بووە، وەهەرچی ئەندیشەو بیرو بۆچوونی ناودڵی هەیە لەوەیەکە هەمووڕۆژێك شەڕەنگێزوخراپەکار بێت، ئەوسا خوای گەورە زیزبوولەوەی کەمرۆڤ بەکارێکی نەگونجاوهەستاوە ئەوسادڵی یەزدان پڕبوولەداخ و وتی لەومرۆڤەی کە دروستم کردووە لەسەر زەویدا لەگەڵ تەواوی ئاژەڵ و ئەوانەی بەسەرزەویدا دەڕۆن و تەنانەت باڵندەی ئاسمانەکانیش دەسڕمەوە و لەناویان دەبەم، چونکە خەفەت دەخۆم کەوا من بەکارم هێناون، جا نوح لەچاوەکانی یەزداندافەڕو نیعمەتی بینی). بەڵام لەقورئانی پیرۆزدا ئایەتەکان ئەوە ڕۆشن دەکەنەوە کەتەنهاقەومی نوح تیاچوون نەك تێکڕای جیهان، هەروەك چۆن هود پێغەمبەر بۆ قەومی عاد بەتەنها نێررا، وە ساڵحیش بۆ ثە مود، وەلەگەڵ تەواوی ئەو پێغەمبەرانەی کەلەپێش پێغەمبەری ئیسلام (موحەممەد) (درودی خوای لێ بێت) بەتایبەت بۆ قەومەکانیان نێررا بوون، بەو شێوەیەش نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) تەنها بۆ قەومەکەی خۆی نێرراوە، وەئەو زریان و تۆفانەش تایبەت بوو بەتیاچوونی ئەو قەومە نەك هۆزو نەتەوەکانی تر، ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت : وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا نُوحًا إِلَىٰ قَوْمِهِۦٓ إِنِّى لَكُمْ نَذِيرٌ مُّبِينٌ ﴿٢٥﴾ أَن لَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ ۖ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ أَلِيمٍ ﴿٢٦﴾ هود (٢٥-٢٦) واتە : ﴿سوێند بە خوا بەڕاستی ئێمە نوح مان نارد بۆ لای قەوم و خزمەکانی، پێی وتن : بێگومان من بۆ ئێوە داچڵەکێنەرێکی ئاشکرام (ئەگەر لەفەرمانی خوا دەرچن تووشی سزا دەبن،خۆ ئێوە باش من دەناسن) کەجگەلە خوا ((کەس و هیچی تر)) نەپەرستن، چونکە من بەڕاستی دەترسم سزای ڕۆژێکی بەئێش یەخەتان پێ بگرێت ((هەمووتان لەناو بچن))﴾. وەبەڕاستی ئەو قەومەی کەتیاچوون ئەوانە بوون کە سوکایەتیان بەپەیامی پێغەمبەر دەکردوو سوور بوون لەسەر سەرپێچی کردن و بێ

فەرمانی خوای گەورە،وە ئایەتەكانی دواتریش بەڵگەن بۆ ئەمە : ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَأَنجَيْنَٰهُ وَٱلَّذِينَ مَعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَآ ۚ إِنَّهُمْ كَانُوا۟ قَوْمًا عَمِينَ ﴿٦٤﴾ ﴾ **الاعراف** (٦٤) واتە:﴿ (دوای نۆسەدوو پەنجا ساڵ هەوڵ و كۆشش) هەربەرنامەكەیان بەدرۆزانی و بڕوایان پێ نەكرد، جا ئێمەش خۆی و ئەوئیماندارانەی لەگەڵیدا بوون لەكەشتیەكەدا ڕزگارمان كردن و ئەوانەی بڕوایان نەهێنا بەئایەت و فەرمانەكانمان نوقمی زریانەكەمان كردن، چونكە بەڕاستی ئەوان گەلێكی كوێرونابینا بوون، لەئاستی ڕاستیەكاندا﴾. ﴿ فَكَذَّبُوهُ فَنَجَّيْنَٰهُ وَمَن مَّعَهُۥ فِى ٱلْفُلْكِ وَجَعَلْنَٰهُمْ خَلَٰٓئِفَ وَأَغْرَقْنَا ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِنَا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿٧٣﴾ ﴾ **یونس** (٧٣) واتە : ﴿كەچی بانگەوازەكەیان بەدرۆزانی، ئینجا ئێمەش نوح و هەموو ئەوانەی كەلەگەڵیدا بوون لەكەشتیەكەدا ڕزگارمان كردن و كردیشمانن بەجێنشین و هەموو ئەوانەمان نوقمی ڕهێڵ و زریانەكە كرد كە بڕوایان بە ئایەت و فەرمانەكانی ئێمە نەبوو، ئینجا تەماشا بكەو سەرنج بدە و بزانە سەرئەنجامی ئەوكەسانە چۆن بوو كەبێدار كرابوونەوە و هۆشیاریان پێدرابوو﴾.

هەروەك چۆن قورئانی پیرۆز هەواڵمان پێدەدات كە پەروەردگار هیچ هۆزو نەتەوەیەك لەناو نابات هەتاوەكو لەخۆیان پێغەمبەرێكیان بۆ ڕەوانە نەكات، جاتیاچوونەكەش تەنها كاتێك ڕوودەدات كەلەناو قەومەكەدا پێغەمبەرێك هەبێت كەئاگاداریان بكاتەوە، خوای گەورە لەسورەتی (القصص) دا دەفەرموێت : ﴿ وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ ٱلْقُرَىٰ حَتَّىٰ يَبْعَثَ فِىٓ أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِنَا ۚ وَمَا كُنَّا مُهْلِكِى ٱلْقُرَىٰٓ إِلَّا وَأَهْلُهَا ظَٰلِمُونَ ﴿٥٩﴾ ﴾ **القصص** (٥٩) واتە: ﴿پەروەردگاری تۆ هیچ وڵات و شارێكی كاول نەكردوە، تالە پایتەختەكەیدا

پێغەمبەرێکی نەناردبێت کە ئایەتەکانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنێتەوە، وەنەبێت ئێمە شارو ولاتانمان کاول کردبێت بەبێ هۆ، مەگەر کاتێك نەبێت کە دانیشتوانی ستەمکار بوون﴾.

کەواتەخوای گەورە هیچ هۆزو نەتەوەیەك لەناونابات هەتاوەکو لەخۆیان پێغەمبەرێکیان بۆ نەنێرێت.وە نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) وەك پێغەمبەرێك هات بۆ قەومەکەی تاوەکو ئاگاداریان بکاتەوە، لەبەرئەوە خوای پەروەردگار هیچ هۆزو نەتەوەیەکی تری لە سەردەمی نوح دا لەناو نەبردووە ئەگەر پێغەمبەری بۆ رەوانە نەکردبن.

لەم ئایەتانەدا ئەتوانین لەوە دڵنیا بین کەزریانەکەی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) جیهانگیری نەبووە بەڵکوتەنها هەرێمێکی گرتووەتەوە .لەڕاستیدا ئەو هەڵکۆڵەرە شوێنەوار ناسانە کەلەناوچە شوێنەواریەکاندا کاریان ئەنجامداوە ئەوەیان دەرخستووەکەپێویستە ئەوشوێنەوارە ناوچەی زریانەکەبێت کەلەداهاتودا باسی دەکەین و پیشانی دەدەین، گومانی تێدانیە زریانە کە گشتگیرنە بووە و تێکڕای جیهان نوقم بکات، بەڵکو کارەسات و ڕووداوێکی گە ورەبوو کە لە سەربەشێك لەناوچەی دۆڵی دوو ڕووباردا ڕوویداوە.

## ئایا تێکڕای ئاژەڵان لەسەر کەشتیەکە هەڵگیراون ؟

تەفسیرەکانی ئینجیل بڕوایان وایەکە نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)- هەرچی ئاژەڵ هەیە لەسەر ڕووی زەویدا خستیە سەر کەشتیەکەولەگەڵ خۆیدا بردنی، بەم شێوەیەش تێکڕای ئاژەڵەکان لەفەوتان ڕزگاریان بووە، بەپێی ئەم چیرۆکە ڕزگاربوونی ئەو ئاژەڵانە لەسایەی -نوح- ەوە بووە (سەلامی خوای لێ بێت)، چونکە هەرچی بەلەسەرزەویدا دەژیا بەهەموو جۆرەکانیەوە لەنێو کەشتیەکە کۆی کردنەوە. ئەوانەی کە پارێزگاری لەم بیرو ڕایە دەکەن هەڵبەت ڕووبەڕووی زۆرێک لە پرسیار گەلی جیاواز بوونەتەوە کەناکۆکن لەگەڵ بیروڕاکەیاندا، جائەو پرسیارەی کە دێنەئارازە بریتی یە لەوەی : چۆن خواردنیان بەو هەموو گیانلەبەرە داوە لەسەر کەشتیەکەدا ؟ وەچۆن لەیەکتری جیایان کردوونەتەوە و لەکوێدا دەنوستن ؟ وەڵامی ئەمەش مەحاڵە. پرسیارێکی دیکەی تریش کە گرنگیەکی ئەو تۆشی نیە ئەوەیە : چۆن توانرا هەموو ئاژەڵەکان لە کیشوەرە جیاوازەکاندا کۆبکەنەوە، هەرلە کەنغەری ئوسترالیەوە تاوەکو گامێشی ئەمریکی ؟ وەبەدوای ئەمەشدا پرسیارێکی تر دێت : چۆن توانرا کە ئاژەڵە ژەهراویەکان بگرن وەك مارو دووپشك، ئەی ئاژەڵە درندەکان ؟ چۆن توانرا لەو ژینگە سروشتیەیاندا جیایان بکەنەوە تائەو کاتەی زریانەکەتەواو بوو ؟ ئەمە پرسیار گەلێکن کەڕووبەڕووی (عەهدی کۆن) دەبنەوە، لە قورئانی پیرۆزدا شتێکی بەم شێوەیەمان نیە کەئاماژە بەوە بکەن کە هەموو ئاژەڵەکانی سەرزەوی لەسەر کەشتیەکەدا هەڵگیرابن، وەك چۆن لەپێشدا تێبینی ئەوەمان کرد کە گێژاو و زریانەکە لەناوچەیەکی دیاریکراودا ڕوویدا، لەبەر ئەوە ئەو ئاژەڵانەی کەلەسەر کەشتیەکەدا هەڵگیراون ئەوانە بوون کەلەو ناوچەیەدا بوونیان هەبوو بەتایبەت ناوچەی هۆزونەتەوەکەی -نوح- (سەلامی خوای لێ بێت).

لەگەڵ ئەوەشدا ئەستەم نیە ئەگەر تێکڕای ئەو ئاژەڵانەی کەلەو ناوچەیەدا دەژین

کۆ بکرێنەوە، لەڕاستیدا نارەحەتە لەسەر نوح (سەلامی خوای لێ بێت) و ئەو بڕوادارە کەمەی کەلەگەڵیدا بوون بڕۆن بگەڕێن بەهەمووشوێنێکدا بۆئەوەی لەهەموو نێرو مێ یەکی ئاژەڵەکان کۆ بکەنەوە کەلەچوار دەوریاندابوون، وەئەوەش ناچێتە ئەقڵەوە کەبتوانرێت هەرچی جۆری مێروو هەیە کۆ بکرێتەوە، یاخود بتوانرێت نێرو مێ لەیەکتر جیابکرێتەوە ! لەبەرئەوە ئەوەی لەڕاستیەوە نزیکە ئەوەیەکە نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) هەستاوە بەکۆ کردنەوەی ئەو جۆرە ئاژەڵانەی کە هۆگرن وکۆکردنەوەیان ئاسانە وەك مەڕومانگاو ووشترونەسپ ونەوئاژەڵانەشی لەوانەدەچن، چونکە ئەم جۆرە ئاژەڵانە پێویستن بۆ بونیاد نانەوەی ژیانێکی تازە و نوێ لەوناوچەیەدا کەبەهۆی زریانەوە ژمارەیەکی زۆری مەڕومالآت تیا چووبن. خاڵێکی گرنگی تر لێرەدا ئەمەیە : حیکمەتی خوایی کەفەرمانی کرد بە نوح (سەلامی خوای لێ بێت) کەلەهەموو جۆرێك جوتێك هەڵگرێت وەئەم حیکمەت و داناییە لەوەدا دەردەکەوێت ئەو جۆرانەی کۆکردەوە کە پێویستن بۆ بونیاد نانی ژیانێکی تازە و نوێ لەدوای زریانەکەوە، نەك پارێزگاری کردن لەڕەگەزی ئاژەڵان کەلەکاتێکدا زریانەکە جیهانی نەبووە، جالەبەر ئەوە شتێکی بەو شێوە بەناوی تیاچوونی ڕەگەزی ئاژەڵەکان نەهاتووە، لەڕاستیدا پێدە چێت کەزۆرێك لەئاژەڵەکانی دەوروبەری ناوچەکە دوای کۆتایی هاتنی زریان و گێژاوەکە هاتبنە ناوچەکەوە، کەواتە خاڵی گرنگ و سەرەکی بابەتەکە ئەمەیە کەژیانێکی تازەو نوێ لەدوای زریان و تۆفانەکە لەو ناوچەدا بونیاد بێت، وەلەپێناو بەدەست هێنانی ئەمەشدا بوو ئاژەڵەکان کۆ کرانەوە.

## ئاوەکە تاچ بەرزاییەك گەیشت ؟

بابەتێکی تری ڕووداوی زریانەکە کەقسەو باسی لەسەرە ئەوەیە : ئایا ئاوەکە شاخەکانی داپۆشی ؟ قورئانی پیرۆز هەواڵمان دەداتێ کە کەشتیەکە لەدوای زریانەکەوە لەسەر (جودی) داگیرسایەوە، وە (جودیش) ناوی شاخێکی دیاری کراوە، هەرچەند وشەی (جودی) لەزمانی عەرەبیدا بەمانای (شوێنی بەرز) دێت، لەبەر ئەوە دەبێت خۆمان بێ ئاگا نەکەین لەوەی کە بەدروستی بزانین کە جودی لەقورئانی پیرۆزدا باسکراوە ئاماژە نیە بە شاخێکی دیاری کراو، بەڵکو لەڕاستیدا ئاماژەیە بۆئەوەی کەشتیەکە لەسەر شوێنێکی بەرزدا لەنگەری گرتووە، هەروەها ئەم واتایە بۆ (جودی) بەمانای ئەوە دێت کە ئاوەکە تائاستێکی دیاری کراو گەیشتووە، بەڵام نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە لە لوتکەی شاخەکەدا بێت، کەواتە ئەتوانین بڵێین کەلە ڕاستیدا گێژاوو زریانەکە تەواوی زەوی و شاخەکانی نەگرتووەتەوە و داینەپۆشیوە وەك چۆن لە (عەهدی قەدیم) دا هاتووە، بەڵکو ناوچەو هەرێمێکی دیاری کراوی داپۆشیوە.

## ناوچەی زریانەکەی نوح (سەلامی خوای لێ بێت)

رایان داناوە کە دۆڵەکانی ناوچەی دۆڵی دوو ڕووبار بریتیە لە ناوچەی زریانەکە، چونکە لەوناوچەیەدا پێش کەوتوو ترین شارستانیەتەکان کە لەمێژوودا ناسراوو بوون هاتوونەتە بوون، ئەمەجگە لەوەی کەشوێنەکەی لەنێوان هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات دایە وادەکات کەئەمە ناوچەی زریانەگەورەکە بێت، وە پێدەچێت بڵێین کەبوونی ئەم دوو ڕووبارە گەورەیە یەکێك بوو بێت لەوپاڵنەرانەی کە بوونە هۆی ڕوودانی زریانەکە، چونکە بۆی هەیە ئەم دوو ڕووبارە هەڵچووبن و ناوچەکەیان نوقم کردبێت. هۆیەکی دیکەش بۆ دانانی ئەم ناوچەیە کە ناوچەی زریانەکەیە

هۆکاری مێژووییە لەڕاستیدا لەتۆماری زۆرێك لەو شارستانیانەی کە بەم ناوچەیەدا هاتوون چەند بەڵگەنامەیەك دۆزراوە ئەوە کە باس لەزریانێك دەکات کە لەو ناوچەیەی ژێر ئاو خستووە، لەهەمان کاتداوتراوە ئەو شارستانیەتانەشی کەتیاچوونی هۆزەکەی نوح یان بینیووە بیریان لەوە کردوەتەوە و بەپێویستیان زانیوە کەئەم ڕووداوە تۆماربکەن، چۆن زریانەکە ڕوویداو ئەنجامەکەی بەکوێ گەیشت، لێرەدا دەبینین کە زۆربەی ئەو داستان و چیرۆکانەی ئەو شارستانیەتانە هێناویانە ئەو چیرۆك و داستانانەن شوێن و ناوچەی زریانە کەیان دیاری کردووە لەهەمان جێگەدا، وەشوێنەوار ناسەکانیش پاڵپشتی ئەم قسانەیان کردووە، سەلماندویانە کەزریانێکی گەورە لەم ناوچەیەدا ڕوویداوە، لەلاپەڕەکانی داهاتوماندا ئەوەدەبینین کەماوەیەك لەم ناوچەیەدا شارستانیەتەکانی لێ دابڕاوە و نەماوە، وەلەماوەی هەڵکەندنی شوێنەوارەکاندا شوێنەواری گەورەی ئەم کارەساتە دەرکەوتن کەلەناوبران.

شوێنەوارناس و هەڵکۆڵەرەکان لەناوچەی دۆڵی دوو ڕووباردا ئەوەیان دەرخستووە کەئەم ناوچەیە دووچاری زۆرێك لەکارەساتەکان بووەتەوە ئەویش لەئەنجامی ئەولافاوانەی کەبەهۆی هەردوو ڕووباری دیجلە و فوراتەوە هەڵساون، بۆ وێنە : یەکێك لە ساڵەکان کەلە سەردەمی (ئیبین) ی فەرمانڕەوای شاری (ئور) دابوو کە کەوتووەتەخواروی دۆڵی دوو.ڕووبارەوە وەلەنزیکەی هەزارەی دووەمی پێش زایندا بەساڵی ((دوای زریان ناودەبرێت کەلەنێوان ئاسمان و زەویدا سنورەکانی لابرد))[1] وەلەسەردەمی حامورای بابلیشدا، واتە ساڵی (١٧٠٠) پێش زاین، ساڵێك هەیە ئاماژەی پێ دەکرێت ئەویش ساڵێك بەر لە نوقم بوونی شاری (ئیشونا) بەزریانی زیان بەخش ناودەبرێت. لەسەدەی دەیەمی پێش زایندا و لەسەردەمی (نبوموکین

---

[1] ماکس مالوان ، نظرة جدیدة في طوفان نوح (ع) ، العراق ٤ – xxvi ،٤ ،١٩٦٤ ، صفحة ٦٦

ئابال) ی فەرمانڕەوادا زریانێکی گەورە لەشاری بابل ڕوویدا[1]، وەلەدوای هاتنی حەزرەتی عیسا شدا (سەلامی خوای لێ بێت)، واتە لەسەدەی هەشت و نۆ و دە و یانزە و دوانزە ی زاینیشدا ناوچەکە دووچاری لافاوی گەورە بوویەوە، وەلەسەدەی بیستیشدا لەساڵەکانی (١٩٢٥-١٩٣٠-١٩٥٤)[2]. دا بەم شێوەیە ڕوودا و ڕوویدا، ئەوەی ڕاستی بێت کەئەم ناوچەیە هەمیشە جێگەی لافاو بووە، بێگومان پێدە چێت وەك چۆن لەقورئانی پیرۆزیشدا باس کراوە کە ئەم ناوچەیە تووشی زریانێکی گەورە بووە و خەڵکەکەشی تیاچوون.

## بەڵگەی شوێنەواری بۆ تۆفانەکە

لەم ڕۆژگارەی ئەمڕۆشماندا ڕێکەوت نیە ئەگەر بگەین بەشوێنەواری ئەو نەتەوانەی کەلە قورئانی پیرۆزدا باسی تیاچوونیانی بۆ کردووین، وە بەڵگەی شوێنەوارناسیشمان پێش کەش دەکات و دەفەرموێت هەرکاتێك نەتەوەیەك کتوپڕ لەناوچووبن ئەوکات توانای گەڕان بەدوای شوێنەوارو بۆ ماوەیاندا زیاتر دەبێت، وەهەرکاتێکیش نەتەوەیەك لەنەتەوەکان بەشێوەیەکی کتو پڕ دیارنەمابن، ئەوە زۆرجار بەهۆی کارساتە سروشتیەکان و یاخود کۆچی لەناکاوو جەنگەوێرانکاریەکانەوە بووە، ئەوسا شوێنەواری ئەم نەتەوانە بەشێوەیەکی باشتر پارێزراو دەبێت، وەلەکاتێکی کورتیشدا هەموو ئەو کەلوپەلانەی کەلەژیانی ڕۆژانەیاندا بەکاریان هێناوە دەبن بەژێر خاکەوە، وەبۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەدەستی مرۆڤ دەپارێزرێت تاوەکو لەدوایدا دەربهێنرێت و زانیاری زیاترو گرنگی رابردوو پیشان بدات. بەم شێوازە توانرا زۆرێك لەشوێنەوارەکانی تۆفانەکەی نوح لەڕۆژگاری ئێستاماندا ئاشکرا بکرێت، وێرای ئەوەی کە تۆفانەکە سێ سەدە پێش

---

[1] المرجع السابق
[2] موسى إلمي سيغ ، جذور القرآن ، العهدالقديم والعهدالجديد في سومر ، أستنبول : كيناك ١٩٩٦.

زاین ڕوویداوه، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم زریانە کۆتاییەکی خێرای بۆ شارستانیەتێکی تەواو دانا، بۆ ئەوەی لەشوێنیدا شارستانیەتێکی نوێ درووست ببێت، وەبەم شێوەیەش توانراوە هەزاران ساڵ پارێزگاری لەشوێنەوارەکان بکرێت تاوەکو تێکڕای جیهان ئاگادار بکرێتەوە.



وێنەی زریانەکەی نوح

وەلەکاتی گەڕان و پشکنینی شوێنەواری تۆفانەکەدا ژمارەیەکی گەورە

لەهەڵکۆڵەران دەستیان کرد بە پشکنینی جێگای تۆفانەکە کە دەکەوێتە دۆڵی دوو ڕووبارەوە، وەلەکاتی گەڕان و بەدوادا چونیان شوێنەواری تۆفانەکەیان دۆزیەوە کە چوار شاری سەرەکی لەوناوچەیەدا داپۆشی بوو، وەبەشێوەیەکی تایبەتیش ئەم تۆفانە بەتۆفانێکی وێرانکار دادەنرێت وەئەم شارانەش کەداپۆشراون بەگەورەترین شاری (دوو ڕووبار) هەژمار دەکرێن کە بریتین لەشارەکانی (ئور، ئیریك، کیش، شورپاك) وەتەواوی ئەم شوێنەوارە هەڵکەنراوانەش بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەئەم شارانە بەشێکی بەرفراوان بوون بۆ ئەو زیانە وێرانکاریەی کەلەهەزارەی سێ یەمی پێش زایندا ڕوویدا.

سەرەتا دەچینە ناو ئەو هەڵکەندنانەی کەلە شاری ئوردا جێ بە جێ کرا لەپێشترین شوێنەوارێك دۆزرایەوە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لەو شارستانیانەی کەلەکاتی هەڵکۆڵینیاندا لەشاری توردا ئەنجام درا کەلەئەمڕۆماندا پێی دەڵێن (تل المقیّر) مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ هەزارەی حەوتەمی پێش زاین، بەو پێیەی نشینگەی یەکێکەلەشارستانیە کۆنەکان ئەوەی ڕاستی بێت شاری (ئور) شوێنی نیشتە جێ بوونی زۆرێك لەشارستانیەتەکان بوون کەبەو ناوچەیەدا هاتوون، پشکنین و لێکۆڵینەوە شوێنەواریەکانیش لەم ناوچەیە دەکرێنە بەڵگە لەسەرئەوەی کە ئەم ناوچەیە دابڕانێکی سەختی بەسەردا هاتووە بەهۆی زیانێکی گەورەوە، وەشارستانیەتەکانی تریش لەدوای ئەو دەرکەوتن، (ر، هـ، هول) کەلەمۆزەخانەیەکی بەریتانیدا بوو هەستابەیەکەم هەڵکەندن لەم ناوچەیەدا، وە (لیونارد وولی) یش بەرپرسیارێتی و بەدوادا چوونی کارەکەی (هول) ی گرتە نستۆ، ئەوسا هەستا بەسەرپەرشتی کردنی شوێنەوارە هەڵکەنراوەکان کە پێشتر لەلایەن مۆزەخانەی بەریتانیا و زانکۆی بنسلفانیاوە ڕێك خرابوو، هەڵکەندنەکان کە (لیونارد وولی) پێیان هەستا وکە دەنگدانەوەیەکی گەورەی جیهانیان بەخۆیانەوە بینی بەردەوام بوون لەساڵەکانی (١٩٢٢ هەتا ١٩٣٤)، وەناوەڕاستی

بیابانیش کە کەوتۆتە نێوانی بەغداد ودووروگەی عەرەبیەوە بوویوویە شانۆی ئەم هەڵکەندنانە. وەیەکەمین کەس کەشاری (ئوری) دۆزیەوە، نەتەوەیەك بوون لەباکوری دۆڵی دوو ڕووبارەوە هاتبوون ناوی خۆیان نابوو (عبیدین) وەلەسەرەتاوە ئامانج لەم هەڵکەندنانە ئەوە بوو زانیاری تەواو لەسەر ئەو نەتەوە و هۆزە کۆبکرێتەوە، گۆڤاری (Rea ders Digest) بەم شێوەی خوارەوە وەسفی هەڵکەندنەکانی (وولی) کردووە : (وولی) بەدۆزینەوەی گۆڕی پاشاکانی ئوور زۆر خۆشحاڵ بوو کاتێك بەخاکەنازەکەی شوێنەواری گۆڕی پیاوە گەورەکانی سۆمەری هەڵدایەوە و گۆڕی کەڵەکە بووش دەرکەوتن وەلەقولاٌیی پەنجا پێ بەرەو خوارووی پەرستگاکەشەوە ڕیزێکی درێژ لەگۆڕی پیاوە بەرێزەکان دەرکەوتن. وەلەگۆڕەکانیشدا گەنجینەیەکی ڕاستەقینەش دەرکەوت، کەلەڕاستیدا پڕ بوون لەجام و کاسەی گرانبەها وەك : (قۆری و قاپ و قاچاغی باش و کەلوپەلی برۆنزی سەرسفرەو خوان). کەلە موزاییك و بەردی لازورد دروست کرابوون، وەئەو لاشانەی کەتووشی ڕزین هاتبوون بەزیو چوار دەورە درابوون، وەئامێری گیتاریش بەدیوارکانەوە دەبینران، لەیادە وەریەکانیدا نوسیویەتی : (هەموو ئەمانە لەیەك ساتدا ڕوویان دا) وەبەدوای هەڵکەندنەکاندا چووین کە گومانەکانمانی لابرد، ڕاستەوخۆ لەژێرزەویدا گۆڕێکمان دۆزیەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێك لە پاشاکان وەلەگەڵ چینێك لەتەختەی خەڵوزی و ژمارەیەکی گەورە لەتابلۆی قوڕیش هەبوون، کەنەخشی لەسەر هەڵکەنرا بوو کە زۆر لەپێشتر بوو لەوانەی کەلەناو گۆڕەکانداد ۆزرانەوە. وەبە پێی سروشتی ئەو نوسراوانە کەلەسەریان تۆمار کرابوون مێژووە کەیان بۆ هەزارەی سێهەمی پێش زاین دەگەڕێتەوە، بەم شێوە دووسەدە یان سێ سەدە لەگۆڕەکان لەپێشترە. هەرکات هەڵکەندنەکان زیاتر قوڵ ببنەوە پاشماوەجیاوازەکانی شوێنەوارەکان زیاتر دەردەکەوتن، ئەمە گۆڕی پاشاکانە لەشاری ئووردا کە گۆڕی پاشاو پیاو ماقوڵان و سەردارانی سۆمەری تێدا نێژراوە،

لێکۆڵەرەوەکان ژمارەیەك گەنجینەی هونەری باشیان پەیدا کرد وەك : شمشێر و ئامێری مۆسیقا، شوێنەوارە هونەریەکان کەلەئالتون و بەردی بەنرخ دروست کراون. جۆرێکی گرنگی تری لێ بوو وەك : ژمارە مێژوویەکان بە شێوازێکی زۆر چاك بەرزچوونی بەرز تیایاندا لەسەرچەند تابلۆیەکی لەقوڕ دروست کراو. وەهەروەها لێکۆڵەرەکان لەشاری ئور دا چەند نوسینێکیان دەست کەوت کەهەمان ناوی تێدا بوو کەلەلیستی پاشاکانی (ئور) دا بوو، تەنانەت ناوی یەکەمین دامەزرێنەری خێزانی پاشایەتی (ئور) یان دۆزیەوە، (وولی) ئەو ڕاستیەی بۆ دەرکەوت کەئەم گۆڕانە مێژووەکەیان بۆ پێشتر لەخێزانی فەرمانڕەوای (لاور) دەگەڕێتەوە. واتە گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەلەپێش شاری ئور دا شارێکی گەورەی تر هەبووە، دوای وردبینی بۆ ئەم شوێنەوارانە (وولی) بڕیاری بەردەوام بوونی دا لەهەڵکەندنی چاڵەکان دا کەزیاتر قوڵ بێتەوە بۆ ژێر ئەم گۆڕانە، وە کرێکارەکان بەئەندازەی مەترێك چوونە ناوقوڵاییەکان لەژێر خشتەکاندا کە گۆڕابوون بۆ قوڕ، دەستیان کرد بەدەرهێنانی کەل و پەل و شت و مەکەکان پاشان لەپڕێکدا هەموشتێکیان وەستاند.

(وولی) نوسیویەتی : لەوشوێنە هیچ کەل و پەل و قاپ و قاچاغ و ژمارەی قوڕینەکان نەماون. بەڵکو تەنها قوڕێکی پاڵفتە ماوە کە ئاو دایماڵیوە. (وولی) لەهەڵکەندنەکانیدا بەردەوام بوو، وەدوای تێپەڕ بوونی ٢,٥ مەترو لەچینی قوڕی پاڵفتە، هەڵکەندنەکان بەردەوام بوو بۆ زیاتر قوڵبوونەوە، وەلە پڕێکدا کرێکارەکان چەندئامێرو کەل و پەلێکیان دەست کەوت کەلە بەردی ڕێکخەر دروست کرابوون وە مێژووەکەشی دەگەڕێتەوە بۆ کۆتایی چاخی بەردین.




خوێنەرارە دۆزراوەکان ئەوە دەسەلمێنن کە ڕووبانەکەی نوح لەدەشتاییەکانی دۆڵی دوو ڕووباردا ڕوویداوە، کە ئەم دەشتاییانە شێوازێکی جیاوازیان هەبوە وەك لەوەی ئێستا هەیە، ئەو هێڵە باریکەی کە لەوێنەکەی سەرەوەدا کراوە ئاماژە بەوە دەکات کە سنوری ئێستای ئەم دەشتاییانەیە، بەڵام بەشێکی گەورەی کە لەدواوەی ئەم هێڵە باریکەوەیە لەڕاستیدا لەئێستادا بەشێکی گەورە لەدەریا پێك دەهێنێت.

وەلەدوای تەواو بوونی کارەکان کە پاکردنەوەی قوڕەکە بوو ئاشکرا بوو کە لەم قولاییەدا شارێکی داپۆشراو هەیە، وەشوێنەوارەکان بەڵگەن لەسەر ئەوەی کەزریانێکی گەورە لەم ناوچەیەدا ڕوویداوە، هەروەك شیکارە وردبینەکان ئاماژەیان بەچینێکی زۆر ئەستور لەقوڕی خاوێن کردووە (**Fullers earth**)، وەئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کەزریانێکی ترسناك بووە کە ڕوویداوە و بووەتەمایەی ئەوەی کەشارستانیەتی سۆمەر لەناو ببات و بیسڕێتەوە، وەبەم شێوەیەش داستانی گلگامیش و چیرۆکی زریان و تۆفانەکەی نوح یەکدەگرنەوە لەبیرێکی قوڵی سەردەشتاییەکانی دۆڵی دووڕووبار[1]. شیکارە وردبینەکان دەریان خستووە کە نیشتنی ئەم قوڕە کەلەژێر ئەم بان و تەپانەی شاری ئوردا ڕوودەدەن لەئەنجامی ئەو زریانە گەورەیەوە بووە کە شارستانیەتی سۆمەری کۆنی لەگەڵ خۆی ڕاماڵیوە، لەبەرئەوە لەڕاستیدا داستانی گلگامیش و چیرۆکی نوح لەم دەروازەیەدا کەلەژێر بیابانەکانی دۆڵی (دوو ڕووبار) دا شاراونەتەوە و یەك دەگرنەوە. (ماکس مالوان – **Max Mallowan**) لەسەر بیرو بۆ چونەکانی (لیو نارد وولی–

---

[1] فیرنر کیللر ، الأنجیل کتاریخ ، إثبات کتاب الکتب ، نیویورك : ویلیام مورو ، ١٩٦٤ الصفحات ٢٥ _ ٢٩

Leonard Wolley) که هەستا بەو هەڵکەندنانە دەیگێڕێتەوە : ئەم پارچە قوڕە گەورەیە کە لەماوەی یەك سەردەمدا دروست بووە ناکرێ نەڵێین لەئەنجامی کارەساتی زریانێکی گەورەوە بووە، وەك چۆن (وولی) وەسفی دۆخی زریانەکە دەکات کەشاری (ئوری) سۆمەری بەشاری (عبید) ، وە گرێ دەدات، کە دانیشتوانەکەی ڕاهاتبون بەبەکارهێنانی کەل و پەلەکانی پاشماوەی ئاوەکە، بەو پێ یەی کەشوێنەواری زریانە گەورەکەیە [1]، لەمەوە ئەوە دەردەکەوێت کەشاری ئور یەکێکە لەو ناوچانەی کەکاری گەر بوون بەزریانە گەورەکە، (وورنر کیلر) گرنگی ئەم هەڵکەندنانەمان کەلەپێشدا باسکرد بۆ شی دەکاتەوە و دەڵێ : ئەم پاشماوانەی کەلەدۆخی قوڕی ژێرەوەیاندا لە هەڵکەندنی شوێنەوارەکاندا دەرکەوتن بەڵگەن لەسەر بوونی ڕووداوی زریانێك لەناوچەکەدا [2].




پاشماوەی شوێنەوار ناسەکان کە لیونارد وولی لەدەشتاییەکانی دۆڵی دوو ڕوبارا لە ئەنجامیدا دەریانخستوە، کە ٢/٥ مەتر لەچینی قوڕی سورەوە بوو لەم جێگایەدا بوونی هەیە. ڕای زۆرینە ئەوەیە کە ئەم چینە لەتۆپەڵی قوڕی سوورەوە بوو پێك هاتوە کە لەگەڵ ئاوی زریانەکەدا هەڵگیراوەو وە لەتەواوی جیهاندا لەم نمونەیە نیە مەگەر لەژێر دەشتاییەکانی دۆڵی دوو ڕوباردا نەبێت. ئەمەش بەڵگەیەکی تەواوە کە دەیسەلمێنێت کە زریانەکە تەنها لەدۆڵی دوو ڕوباردا ڕویداوە.

شاری دووەم کەشوێنەواری زریانە گەورەکەی هەڵگرتووە ئەویش شاری (کیشی سۆمەریە) کەئەمڕۆ بە (تل الأحمر) دەناسرێ، وەبەپێی سەرچاوە کۆنەکانی سۆمەری، ئەم ناوچەیەش هەرلەیەکەم نەوەی فەرمانڕەوایەتیدا سەربەخۆ بووە لەدوای زریانەکەوە [1]. هەروەها سەبارەت بەشاری (شورپاک) یش کەدەکەوێتە خوارووی دۆڵی (دوو ڕووبار) ، وە کەئەمڕۆ بە (تل الفعرة) ناودەبرێت، کە شوێنەواری زریانە گەورەکەی تێدا دەرکەوتووە، هەڵمەتی شوێنەوار ناسەکانیش لەم ناوچەیەدا (ئیرك شمیدت) بوو کەلەزانکۆی بنسلفانیادا لەنێوان ساڵەکانی (١٩٢٠-١٩٣٠) دا بەڕێوەبەرایەتی دەکرد، ئەم هەڵکەندنانەش سەرەتای دروست بوون و گەشەسەندنی شارەکەی پیشاندا کەلەپێش (٢٠٠٠-٣٠٠٠) ساڵ دەبوو لەپێش زایندا. وەشوێنەواری ئەم شارەش لەدۆخە جیاوازەکانی هەڵکەندنەکاندا ڕوون و دیار بوو، سێ دۆخ لە نیشتەجێکانی درێژ دەبنەوە بۆ دوایین ساتەکانی مێژوو، وەتەنانەت سێهەم نەوەی فەرمانڕەواکانی شاری ئوور لەساڵەکانی (٢٠٠٤-٢١١٢ پێش زایین) زۆریەی ئەو پشکنینە دیارانە دارو پەردووی ئەومالانەن کە شێوەیەکی پتەوو بەهێزیان هەیە، لەگەڵ ئەوتابلۆسۆمەریانەی کەتۆماری ئیداری و لیستی وشەکانی هەڵگرتووە، ئاماژە بەکۆمەڵگایەکی زۆر پێشکەوتوو دەکەن کەلەکۆتایی هەزارەی چوارەمی پێش زایندا دەرکەوتووە [2].

خاڵێکی زۆر گرنگ لێرەدا ئەوەیە : لەساڵانی (٢٩٠٠-٣٠٠٠) پێش زایین زریانێکی بەهێزو گەورە لەم شارەدا ڕوویدا، وەبەپێی ئاماژەکەی (مالوان) (شمیدت) گەیشتووەتە قولایی (٣-٤) مەتر لەژێرزەویەوە، لەوێ دۆخێك لەخۆڵی زەردی دۆزیوەتەوە (کەبە هۆی ڕوودانی زریانەوە پەیدابووە)، کە ئەم دۆخەش لەڕووی خۆڵ پێك هاتووە نزیکترە لەو ئاستەی کەئاسان بێت ببێتە خۆڵی کەڵەکە

[1] کیش ، دائرةالمعارف البريطانية الصغيرة مجلد ٦ الصفحة ٨٩٣
[2] شوربلك ، دائرةالمعارف البريطانية الصغيرة مجلد ١٠ الصفحة ٧٧٢

بوو... (شمیدت) پێناسەی ئەم دۆخە تێکەڵییە دەکات کەلە قوڕوو خۆڵ پێك هاتووە بریتیەلە پاشماوەی سەردەمی شانشینی، (شمیدت نەسر) بەوە وەسفی کردووە کەلە لمێکەوە هاتووە کەسەرچاوەکەی ڕووبارە، وەپەیوەستی کردووە بە زریان و تۆفانەکەی (نوح) ە وە (سەلامی خوای لێ بێت) [1].

لەماوەی ئەو هەڵکۆڵینانەلە شاری (شورباك) دا شوێنەواری زریان بەدەرکەوتن کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نزیکەی (٢٩٠٠-٣٠٠٠) ی پێش زایین، کەواتە ئەستەم نیە کە شاری شورباك یش وەك تەواوی شوێنەواری شارەکانی دیکە دووچاری زریان هاتبێت [2]. دواین شاریش کەدووچاری زریان بووبێت شاری (ئیریك) ە، کەئەمیش ئەمڕۆ پێی دەڵێن (تل الورقة) هەروەك شارەکانی تر ئەم شارەش دۆخێك لەقوڕی زریانەکەیان دەرخستووە، کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵەکانی (٢٩٠٠-٣٠٠٠) ی پێش زایین [3]. وەك ئەوەی کەزانراوە هەردوو ڕووباری دیجلە و فورات دۆڵی (دوو ڕووبار) لەباکورەوە بۆ باشوور دەبڕن، وەپێدەچێت لەحاڵەتی ڕوودانی زریانەکەدائەم دووڕووبارە هەڵسابن و لەگەڵ چەند سەرچاوەیەکی تری ئاویدا لافاویان دروست کردبێت، وەئاوەکانی زەویش لەگەڵ ئاوی ئاسماندا یەکیان گرتبێت و بوو بێتەمایەی ئەوەی زریانەگەورەکە ڕوبدات، وەقورئانی پیرۆزیش ئەم وەسفەمان بۆ دەکات وەدەفەرموێت : ﴿ فَفَتَحْنَا أَبْوَابَ السَّمَاءِ بِمَاءٍ مُّنْهَمِرٍ (١١) وَفَجَّرْنَا الْأَرْضَ عُيُونًا فَالْتَقَى الْمَاءُ عَلَىٰ أَمْرٍ قَدْ قُدِرَ (١٢) ﴾ القمر (١١-١٢) واتە ﴿ئەوسا ئیتر ئێمە دەروازەکانی ئاسمانمان هاوڕێ لەگەڵ ئاوێکی خوڕدا کردەوە، هەموو زەویشمان کرد بەکانیاوو ئاومان لێ هەڵقوڵاند، ئیتر ئاوی ئاسمان وزەوی بەتەقدیرو ویستی

---

[1] ماکس مالوان ، فترة السلالة الحاكمة المبكرة في وادي الرافدين ، التاريخ القديم ١ – ٢ ، كامبريدج ١٩٧١ صفحة ٢٣٨ :

[2] جوزيف كامبيل ، علم الأساطير الشرقية صفحة ١٢٩

[3] Bilim ve utopya ، تموز ١٩٩٦ ، ١٧٦ ، صفحة ١٩ .

خوا بەیەك گەیشتن، بەراستی بڕیاری لەسەر درابوو﴾. کاتێك یەك بەدوای یەکی پاڵنەری زریانەکان تاوتوێ دەکەین، ئەوەدەردەکەوێت کەئەوەدیاردەیەکی سروشتی یە، بەلاّم ئەوەی کەدەبێتە موعجیزە ئەمەیە کە هەموو ئەم ڕووداوو کارەساتانە لەیەك کاتدا ڕوویانداوە، وەلەدوای ئامۆژگاری و ئاگادار کردنەوەکانی نوح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) ئەم کارەساتانە ڕوویان داوە. بەڵگەکان دەریان خستووە کە دواین توێژینەوە دەرکراوە : ئەوەیە کەناوچەی زریانەکە بەپێوەری زەوی (٦٠٠) کیلۆمەتری بەدرێژایی باکوور بەرەو باشوری داپۆشیوە ئەمەئەوە دەگەیێنێ کە زریانەکە تەواوی دەشتاییەکانی دۆڵی (دوو ڕووباری) داپۆشیوە، ئەگەر بەووردی سەرنجی ڕێکخستنی شارەکانی (ئوور و ئیریك و شوریاك و کیش) بدەین کەشوێنەواری زریانەکەیان هەڵگرتووە و پێیا ئەوە دیارە، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە هەمووئەم شارانە دەکەونە ئەم ڕێگەیەوە، وەبەم شێوەیە پێدەچێت زریانەکە تێکڕای ئەم شارانە و دەوروبەریانی گرتبێتەوە، لەگەڵ ئەمەشدا دەبێت بێ ئاگانەبین لەوەی کە پێکهاتەی زەوی ناسی ئەوکاتەی دەشتاییەکانی دۆڵی دوو ڕووبار لەگەڵ ئەمڕۆماندا تەواو جیاوازە، لەوکاتەدا حەوزی ڕووباری فورات بە ئاراستەی ڕۆژ هەلاّتەوە بوو بەلادانێکی گەورە وەك لەوەی کەئەمڕۆ هەیە، ئەم ڕێڕەوەش هاوتاو یەکسانەلەگەڵ ئەوهێڵەی کەبەرەو شارەکانی (ئوور و ئیریك و شوریاك و کیش) دەڕوات، وەلەگەڵ تەقین و دەرچونی کانی و چەمەکانی زەوی و ئاوی ئاسماندا ڕووباری فوراتیش هەڵساو لافاوی بەرپاکرد و ئاوی ڕووبارەکەش بەڕووی ئەو چوار شارەدا ڕۆشت کەلەسەر ڕێگاکەیدا بوون و خاپوور کاولی کردن و تێکیدان.

## ئەوئاین و شارستانیانەی کەباسی زریانەکەیان کردووە

چیرۆکی تۆفانەکەی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) لای هەموو گەل و نەتەوەکانی جیهان ناسراوە، لەرێگەی پێغەمبەرانەوە (سەلامی خوایان لێ بێت) کەبەئاینێکی ڕاست و دروستەوە هاتوون، لەگەڵ ئەوەی کە دەست کاری کراوە و گۆڕاوە بۆ داستان و چیرۆکەکان کەلەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر گوازراوەتەوە و زیادەیان خستوەتەسەری و باسەکانی خراپ کراون و شێوێنراون، خوای گەورە خەڵکی لە چیرۆکی نوح و قەومەکەی ئاگادار کردووەتەوە ئەویش لەرێگەی پێغەمبەران و کتێبەکانیەوە کە بۆ زۆرێك لە نەتەوە و هۆزەکانی ناردووە تاوەکو ئاگاداریان بکاتەوە و ببێتە پەندوئامۆژگاری و ترسێنەر بۆیان، وەهەمووجارێك دەقەکە شێوێنراوە و دەستکاری واتای ڕاستی کراوە و چیرۆکی تۆفان گۆڕاوە بۆ داستان و چیرۆکە خەیاڵیەکان. قورئانی پیرۆز تاکە سەرچاوەیەکە کەبەبێ دەست کاری کردن ماوەتەوە، وەدەقەکانی هاوڕان لەگەڵ ئەو پشکنین و لێکۆڵینەوە هەڵگۆزراوانەو تیۆرە بەرهەم هێنەرانەدا، تەنها قورئان ماوەتەوە بەپارێزراوی و بەبێ ئەوەی هیچ دەستکاریەك بکرێت لەتەنها پیتێکیشیدا. لەبەر ئەوەی خوای پەروەردگار لە هەموو دەستکاری و گۆڕانکاریەك پاراستوویەتی، وەك دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر (٩). واتە: ﴿بەڕاستی ئێمە قورئانمان دابەزاندووە و بێگومان هەر ئێمەش پارێزگاری لێ دەکەین﴾. بەم شێوەیە خوای پەروەردگار قورئانی پاراستووە. لەدوایین برگەی ئەم بەشەدا چیرۆکی تۆفان پیشان دەدەین و دەیخەینە ڕوو ئەویش لە زۆرێك لەو شارستانیەتانە و (عەهدی قدیم و عەهدی جدید) کە ڕیوایەت کراون، ئەمە لەگەڵ ئەو هەموو دەستکاریە گەورەیەی کەلێی کراوە.

## تۆفانی نوح لە عەهدی قەدیمدا

تەوارت ئەو کتێبە ڕاستیەیە کەدابەزیوەتەسەر موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لەڕاستیدا بەتێپەڕ بوونی کات لەلایەن ڕێبەرانی یەهودەوە شێوێنراوە و دەستکاری کراوە. ئەمەسەبارەت بەتەواوی ئەو پەیامانەش کە دوای موسا پێغەمبەر بۆ نەوەکانی ئیسرائیل نێرراون. هیچ شتێکی تێدا نەماوەتەوە دەستکاری نەکرابێت و نەشێوێنرا بێت، لەبەرئەوە ئەمە پاڵمان پێوە دەنێت کەوا دابنێین تەورات پەیوەندی بەتەوراتی سەرەکیەوە پچڕێنراوە، ئەوەندەی زیاتر کتێبێکی مێژوویە کتێبێکی پیرۆزی ئاسمانی نیە، زۆر ئاسان ئەتوانین تێبینی ئەو پێنج (ئەسفارانە) و شتەدژیەیەکەکان بکەین کەلەباسی تۆفاندا ڕیوایەت کراون و شێوێنراون تیایدا، ئەمە جگە لەبوونی هەندێ لێك چوونیش لەگەڵ ڕیوایەتەکانی قورئان لەهەندێ بەش و ئەسفارانەدا. بەپێی ڕیوایەتی عەهدی قەدیم : خوای گەورە هەواڵی دابە نوح (سەلامی خوای لێ بێت) کە هۆزو نەتەوەکەی لەناو دەبات جگە لەبڕواداران، چونکە زەوی پڕبوو بوولە خراپەو ستەمکاری، لەبەرئەمە فەرمانی کرد بەدروست کردنی کەشتیەك و بەدرێژی هەواڵی پێدا کەچۆن بەم کارە هەستێت، هەروەها فەرمانی پێدا کەلەگەڵ خۆیدا خێزانەکەی و هەرسێ منداڵ و ئافرەتەکانی هەڵبگرێت، وەلەهەر گیاندارێکیش دوودانە لەنێرو مێ یان هەڵبگرێت وەلەگەڵ هەندێ خۆراکیشدا .

دوای حەوت ڕۆژ کاتێك وادەی تۆفانەکە هات، کانی و چەمەکانی زەوی تەقین و دەرگاکانی ئاسمانیش کرانەوە بە لێزمە باران، وەتۆفانێکی گەورە ڕوویدا و هەمووشتێك نوقم و ژێر ئاو کەوت، ئەم تۆفانەش چل شەوو ڕۆژی خایاند، کەشتیەکە لەسەر ئاودا گوزەری دە کرد کە تێکڕای شاخ و بەرزاییەکانی دا پۆشیبوو، بەم شێوەیەش هەموو ئەوانەی کە نوح لەکەشتیەکەیدا هەڵی گرتبوون

ڕزگاریان بوو، وەئەوانەشی مابوونەوە بەئاوی زریانەکە خنکان و نوقمی ئاوەکە بوون، بارانەکەش دوای زریانەکە کە چل شەوو چل ڕۆژی خایاند وەستایەوە، وەزەویش لەدوای (١٥٠) ڕۆژ ئاوەکەی هەڵ لووشییەوە و قووتی دا. لەدوای ئەوەش وەلەڕۆژی حەڤدەی مانگی حەوتدا، کەشتیەکە لەسەر شاخەکانی (ئارارات) دا لەنگەری گرت و وەستایەوە، ئەوسا نوح چەندجارێك کۆترێکی هەڵدا و ناردی ئاوەکو ببینێ و بزانێت کە ئاوەکە تەواو بووە و ووشك بووەتەوە یان نا، وەلەکاتێکدا بۆ جاری کۆتایی کۆترەکەی ناردو نەگەڕایەوە بۆی دەرکەوت کە ئاوەکە نەماوە و ووشکانی پەیدا بووە، خوای گەورەش فەرمانی پێکرد کە خۆیو ئەوانەی لەگەڵیدان لەکەشتیەکە دابەزن و بڵاو ببنەوە بەسەر زەویدا. یەکێك لەو دژوارە دیارانەی کە پەیوەندی بەم چیرۆکەوە هەیە لەعەهدی قەدیمدا ئەودەقەیە کەلەو نوسخەی (یاهواە) دا هاتووە، کە دەڵێ: خوای گەورە فەرمانی کرد بە نوح کە حەوت گیانلەبەری نێرو مێ هەڵبگرێت کە پێی دەڵێن (النظيفة) واتە پاك و پوخت، وەهەروەها لەو هاوسەرانەش کە پێی دەڵێن (الوسخه) واتە پیس ئەمەش دژبەو دەقەیە کەلەسەرەوەدا باسمان کرد، هەروەها ئەو زانیاریانەشی کەدەربارەی ماوەی تۆفان و زریانەکەشە جیاوازە، ئەوەتا لەڕیوایەتی (یەهوید) دا هاتووە کە بەرز بوونەوەی ئاوەکە چل ڕۆژ بەردەوام بوو، ئەمەلەکاتێکدا لەڕیوایەتی (لیمان) دا دەڵێ (١٥٠) ڕۆژ بەردەوام بوو.

ئەمەش بەشێکە لەو بڕگانەی کەتۆفانی نوح مان بۆ دەگێڕێتەوە لە عەهدی قەدیمدا بە پێی ڕیوایەتی لیمان : **﴿فقال الله لنوح : نهاية كل بشر قد أتت أمامي، لأن الأرض امتلأت ظلماً منهم، فها أنا مهلكهم مع الأرض، اصنع لنفسك خشباًمن جفر، فها أنا آت بطوفان الماء على الأرض لأهلك كل جسد فيه روح حياة من تحت السماء، كل ما في الأرض يموت، ولكن أقيم عهدي معك فتدخل الفُلكَ انت وبنوك وامرأتك ونساء بنيك معك، ومن كل حي من كل ذي جسد اثنين من كل**

**تدخل إلى الفُلكِ لأستبقائهامعك، ففعل نوح حسب كل ما أمره به الله، هكذا فعل.﴾** (التكوين ٦: ١٣ -٢٢) واتە: (خواى گەورە بەنوحى فەرموو: لەراستيدا كۆتايى تێكڕاى مرۆڤايەتى كەوتوەتە ژێردەسەلاتم، چونكەزەوى پڕبووە لەستەم بەهۆى ئەوانەوە، ئەوەتامنيش ئەوان و زەوى پێكەوەلەناو ئەبەم.تۆش ئەى نوح لەتەختە كەشتيەك بۆخۆت دروست بكە، ئەوامن زريانێكى ئاوى گەورە بەسەرزەويدادەهێنم بەمەبستى لەناوبردن و نەهێشتنى هەموولاشەيەك كەگيانى تيابێت لەژێرئاسماندا، هەرچى لەسەرزەويدابێت سەرجەم دەمرێت جگە لەتۆو شوێنكەوتوانت، بەلام من پەيمانى خۆم لەگەلّ تۆدادەمەزرێنم خۆت وكوڕەكانت و ئەوژنانەت كەباوەڕيان پێت هێناوە و ژنى كوڕەكانت لەباوەڕداران، وەلەهەمووزيندويەكى گيانەوەرى خاوەن لاشە نێر و مێ يەك و هەموويان لەگەلّ خۆت لەناو كەشتيەكەتاندا دابنێ بۆئەوەى ڕەگەزيان بمێنێتەوە، نوح پێغەمبەريش داخوازى و فەرمانى خوايى بەجێهێنا بەوشێوازەى كرد كەخواى گەورە فەرمووبووى). **﴿واستقر الفُلكُ في الشهر السابع في اليوم السابع عشرمن الشهر على جبال آرارات﴾** (التكوين ٨: ٤) واتە: (كەشتيەكەش لەڕۆژى حەوتى مانگى حەڤدە لەسەر شاخەكانى ئارارات لەنگەرى گرت و وەستا). **﴿من جميع البهائم الطاهرة تاخذ معك سبعة سبعة ذكراً وأنثى، ومن البهائم التي ليست بطاهرة إثنين ذكراً وأنثى، ومن الطيور السماء أيضاً سبعة سبعة ذكراً وأنثى، لأستبقاء نسل على وجه كل الأرض﴾** (التكوين ٢ : ٧ -٣) واتە: (لەسەرجەم ئاژەلّە پاكەكان حەوت حەوت نێرو مێ لەگەلّ خۆت هەلّدەگرى وەلە و ئاژەلانەى كە پاك نين، دوو دوو نێرو مێيان لێ هەلّدەگرى، وەهەروەها لەبالّندەكانى ئاسمانيش حەوت حەوت هەلّدەگرى بۆ ئەوەى ڕەگەزى هەمووان لەسەر زەويدا بمێنێتەوە). **﴿أقيم ميثاقي معكم فلا ينقرض كل ذي جسد أيضاً بمياه الطُوفان، ولا يكون أيضاً طوفان ليخرب الأرض﴾** (التكوين ٩: ١١) واتە: (پەيمانى خۆم لەگەلّ ئێوە

دادەمەزرێنم بەم شێوازە بەناوی زریانەکە هەموو خاوەن لاشەیەك لەناو ناچێت، وەهەروەها زریانێکی تر نابێت بەمەبەستی لەناو بردنی زەوی). بە پێی ڕیوایەتی عە هدی قەدیم (هە رچی لەسەر زە وی دایە دەبێت بمرێت) بەوتۆفانەی کەهەمووجیهانی داپۆشی، بێگومان تێکڕای مرۆڤەکان ئەوسزایە گرتنیەوە، جگەلەوکەسانەی کەلەگەڵ نوح دا لەناوکەشتیە کەدابوون.

## تۆفانی نوح لـە عەهدی جەدیددا

عەهدی جدیدیش باشتر نەبووە لەعەهدی قەدیم، لەبەر ئەوە ناکرێت بە کتێبێکی ئاسمانی دابنرێت، ئەمەش لەوە دەرناچێت کە بریتی بێت لە زۆرتر لەوشە و کردەوەی (عیسا) پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)، عەهدی جدید سەرەتا بە چوار ئینجیل دەست پێ دەکات کەیەك سەدە دوای (عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) نوسراون، کەسانێکیش نوسیویانن کە حەزرەتی عیسایان بەچاو نەبینیوە و هاوەڵا یەتیشیان نە کردووە کەئەمانەن (مەتا، مەرقس، لوقا، یوحەنا)، جیاوازی لەنێوان ئەم چوار ئینجیلەدا زۆر بەڕۆشنی دیارن، بەتایبەت ئینجیلی یوحەنا کەزۆر جیاوازە لەهەر سێ ئینجیلەکەی تر، کەوای دادەنێن کە هاوڕایە لەنێوان یەکتردا تائەندازەیەك نەك بەشێوەیەکی تەواو، کتێبەکانی تری عەهدی جدید لەو پەیامانە پێك دێن کە حەواریەکان و قەشە (بولس) نوسیویانن کەکرداری پێغەمبەران لەدوای عیسا (سەلامی خوای لێ بێت) وەسف دەکەن. لەبەر ئەوە ناتوانین لەئەمڕۆدا عەهدی جدید بەکتێبێکی ئاسمانی ناو ببەین، بەڵکو زیاتر نزیکە لە کتێبێکی مێژووییەوە، عەهدی جدیدیش وەسفی تۆفانی نوح بەکورتی دەکات وەك ئەمەی لای خوارەوە : نوح پێغەمبەر نێررا بۆ گەل و نەتەوەیەکی یاخی و گومڕا، وەگەل و نەتەوەکەشی شوێن پەیامەکەی نەکەوتن،

بەلکو سور بوون لە سەر سەرەڕۆیی و مل نەدان بۆی، بەوپێیەش شایەنی ئەوەبوون هەرای گەورە سزایان بدات، جانەوکاتەش دڕێژنەکان نوقمی ژێر ئاو کرد بەهۆی تۆفانەکەوە، وە نوح و ئەوانەشی بڕوایان بە نوح هێنا ڕزگاری کردن کەلەسەر کەشتیەکەسواری کردبوون، چەند بڕگەیەك لەعەهدی جەدیدیش کەوەسفی چیرۆکەکە دەکات دەخەینە ڕوو : ﴿وكما كانت أيام نوح كذلك أيضايكون مجيء ابن الانسان لأنه كما كانوا في الأيام التي قبل الطوفان يأكلون ويشربون ويتزوجون ويزوجون إلى اليوم الذي دخل فيه نوح الفُلكَ ولم يعلموا حتى جاء الطوفان وأخذ الجميع. كذلك يكون أيضاً مجيء ابن الانسان.﴾ (متى ٣٧-٣٩).

﴿ولم يشفق على العالم القديم، بل إنما حفظ نوحاً ثامناً كارزاً للبر، إذ جلب طوفاناً على عالم الفجار﴾ (بطرس:٥) ﴿وكما كان في أيام نوح كذلك يكون أيضا في أيام ابن الانسان. كانوايأكلون ويشربون ويزوجون ويتزوجون إلى اليوم الذي فيه دخل نوح الفُلكَ وجاء الطوفان وأهلك الجميع.﴾ (لوقا ١٧ : ٢٦-٢٧). ﴿إذعصت قديما حين كانت أناة الله تنتظر مرة في أيام نوح، إذكان الفُلك يبنى الذي فيه خلص قليلون أي ثماني أنفس بالماء﴾ (بطرس ٣ : ٢٠).

﴿لأن هذا يخفى عليهم بارادتهم أن السماوات كانت منذ القديم، والأرض بكلمة الله قائمة من الماء وبالماء اللواتي بهن العالم الكائن حينئذ فاض عليه الماء فهلك﴾ (بطرس ٣ : ٥-٦).

# ڕیوایەتی شارستانیەتەکانی تر لەبارەی تۆفانەوە

سۆمەریەکان : (ئینلیل) ی خوا هەواڵی بەخەڵکی دا کە خواکانی تر بەنیازن مرۆڤەکان لەناوببەن، بەڵام هەرخۆشی دەیەوێت ڕزگاریان بکات، پاڵەوانی چیرۆکەکەش (زیو سودرا) یە کە پادشای شاری (سیبور) ە، (ئینلیل) زیو سودرا ی ئاگادار کردەوە کەچ کارێك ئەنجام بدات هەتاوەکوو لەتۆفانەکە دەرباز بێت، ئەو دەقەی کەپەیوەستە بەدروست کردنی کەشتی لێرەدا بوونی نیە، بەڵام بەشەکانی دیکەی چیرۆکەکە کەباس لەدەرباز بوونی پاڵەوانەکە دەکەن لەو تۆفانە، ئەوە دەردەخەن کە ئەم بڕگەیەی تێدایە، وەبەپشت بەستن بەڕیوایەتی بابلیەکان بۆ چیرۆکەکە دەگەینە ئەو ئەنجام و ڕاستیە کە پێدەچێت نوسخەی تەواوی سۆمەریەکان هەموو وردەکاری و هۆکار و چۆنیەتی دروست کردنی کەشتیەکەشی بە درێژی لەخۆ گرتبێت.

بابلیەکان : (ئوت نابیشتیم) پاڵەوانی بابلی بەرامبەر بە (زیو سودرا) ی پاڵەوانی سۆمەری، وەکەسایەتی گرنگی سێهەمیش بریتیە لەکەسایەتی (گلگامش) بەپێی داستانەکە، ئەوسا گلگامش بڕیاری ئەوەی دا کە کەلانی شمشێرەکەی بدۆزێتەوە تابگات بە نهێنی مانەوەی، گلگامش ترسێنرا لەو سەختی و لەم پەرانەی کەلەم گەشتەیدا دێنە ڕێ یوو چاوەڕێی دەکەن، پێیان وت : کە خۆی بەسەر شاخەکانی ماشو و ئاوی مردودا ڕادەبورێ ، وەئەم گەشتەش کەس پێی هەڵنەستاوە تاکو ئێستا جگەلە خوای خۆر (شامشا) ی خوا، لەگەڵ ئەوەشدا گلگامش بە ئازایەتی و لێهاتوویی هەموو ئەو مەترسیانەی بڕی و گەیشتە ئوت نابیشتم. لێرەدا دەقەکە دەپچڕێت، لەکاتێکدا گلگامش و نابیشتم بەیەك دەگەن، وەکاتێك جارێکی تردەگەرێتەوە بەردەوام دەبێت لەقسەکردن بۆ گلگامش : خواکان نهێنی مردن و ژیانیان بۆ خۆیان پاراستووە، واتە (نابێت هیچ کەسێك شارەزایی تێیاندا

هەبێت)، جالیێرەدا گلگامش پرسیاری لێ دەکات : چۆن دەتوانین نەبەردی و مانەوە بەدەست بهێنرێت ؟ ئەویش لە وەلامی پرسیارەکەیدا چیرۆکی تۆفانەکەی بۆ باس کرد. وەهەروەها ڕیوایەتی تۆفان لە داستانی گلگامش لە (الموائد الأثنا عشرة) دا هەیە، سەرەتا ئوت نابیشتم دستی کرد بە وتووێژ کەئەم چیرۆکەی بۆ گلگامش دەگێرێتەوە بریتیە لە نهێنیەك لە نهێنیەکانی خواکان، ووتی لەراستیدا ئەو لە شاری (شوریاك) ە وە هاتووە کەیەکێکە لە کۆنترین شارەکانی زەوی ئەکەدیەکان، بەپێی ڕیوایەتەکەیان خوا کەیان کەناوی (ئی) بوو بانگی لێ کردوە، لەپشتی دیواری کوخەکەوە کەلە قامیش دروست کرابوو هەواڵی پێدا کە خواکان بڕیاریانداوەکەهەرچی زیندەوەرە لەناو ببات، بەتۆفانێك نوقمی ژێر ئاوی کردن و خنکاندنی، بەلام هۆکاری ئەم بڕیارەشیان لە چیرۆکی بابلیەکاندا نەهاتووە وەك چۆن لەریوایەتی سۆمەریەکانیشدا نەهاتبوو، (ئوت نابیشتم) ووتی : خوا کەیان کەناوی (ئی) یە هەواڵی پێداوە کەکەشتیەك دروست بکات و بچنە ناویەوە. (وەتوخمی هەموو زیندەوەرێك لەگەڵ خۆیدا سەربخات) وەشارەزای ئەندازەی کەشتیەکەشی کردن کە درێژی و پانی و بەرزی یەکسان بێت، زریان و گێژاوەکە هەموو شتێکی سەرەو خوار کرد، وەنزیکەی شەش ڕۆژ بەردەوام بوو، پاشان لەڕۆژی حەوتەمیندا گێژاوەکە هێور بوویەوە، وە (ئوت نابیشتم) بینی کە هەموو شتێ بووە بەقوڕ و کەشتیەکەش لەسەر (مت نیصیر) لەنگەری گرتوو وەستایەوە. وەبەپێی تۆماری بابلی و سۆمەریەکانیش : (ئیکز وفروس) یاخود (خاسیساترا) خۆی و خێزانەکەی و هاوڕێکانی و هەندێ لە ئاژەڵ و باڵندەکان لەتۆفانەکە دەرباز بوون کەلەناو کەشتیەکەدا بوون، کەبەرزی یەکەی دەگەیشتە نزیکەی (٩٢٥) مەتر، وەدەڵێن (ئاوەکان بەرەو ئاسمان بەرز بوونەوە، زەریاو کەناراوەکانی داپۆشیبوو وە ڕووبارەکانیش هەڵسان و لافاویان دروست کرد)، وەلە کۆتایشدا کەشتیەکە لەسەر کێوی (کوریدیان) وەستاو لەنگەری گرت.

وەبە پێی ڕیوایەتی ئاشوری و بابلیەکانیش : (ئوبرا توتو) یاخود (خاسیساترا) خۆی و خێزانی و خزمەت کارو ئاژەڵە ماڵیەکانی کەلەناو کەشتیەکەدابوون ڕزگاریان بوو، وەدرێژی کەشتیەکەش (٦٠٠) باڵ و بەرزیەکەشی (٦٠) باڵ و هەروەها پانیەکەشی (٦٠) باڵ دەبوو، تۆفانەکەش شەش ڕۆژو شەش شەو ی خایاند، وەکاتێك کەشتیەکە گەیشتەکێوی (نزار) کۆترە سپیەکە گەڕایەوە کەلەسەر کەشتیەکەوە هەڵفڕی بوو، بەڵام قەلە ڕەشەکە نەگەڕا یەوە. وەهەروەها بە پێی هەندێ لەتۆماری سۆمەری و ئاشوری و بابلیەکانیش : (ئوت نابیشتم) خۆی و خێزانەکەی لەناو کەشتیەکەدا لەتۆفانەکە ڕزگاریان بوو کە شەش شەوو شەش ڕۆژ بەردەوام بوو، (وەلە ڕۆژی حەوتەمدا (ئوت نابیشتم) تەماشایەکی دەرەوەی کرد، هێمنی باڵی کێشابوو بەسەر شوێنەکەدا، جارێکی تر مرۆڤ گەڕایەوە بۆ لای قوڕ)، وەکاتێکیش کەشتیەکە لەسەرکێوی (نزار) دا نیشتەوە و لەنگەری گرت، کۆترێك و قەلەڕەشێك و چۆلەکەیەکی نارد، دەبینێ قەلەڕەشەکە مایەوە و دانەوێڵەی دەخوارد لەسەر زەوی بەڵام کۆترو چۆلەکەکە نەگەڕانەوە .

هیندیەکان:. (شاتاباڤا) ی بەراهیمیەکان و داستانی (ماهاباتای هیندی) دەڵێ : پیاوێك بەناوی (مانوو) لەگەڵ (ڕیشیتز) لەتۆفانەکە ڕزگاریان بوو، بەپێی ڕیوایەتی داستانەکە : ئەو ماسیەی کە مانوو لەناو دەریاکەدا گرتی گەورە بوو وەلەژیاندا هێشتیەوە، لەپڕێکدا پێی ووت کە کەشتیەك دروست بکات وەبی بەستێتەوە بەهەردوو شاخی ماسیەکەوە، ئەم ماسیە دەرخستەیەك بوو لەدەرخستەکانی خوای (فیشنۆ)، وەماسیەکە لەئاوەکەدا کەشتیەکەی بەرێدەکرد تاوەکو بیگەێنێتە کێوی (هیسما ڤات).

ویلز :. بە پێی داستانەکانی ویلز : هەر یەك لە (دوین وین و دوین ڤاك) لەکارەساتەگەورەکە ڕایان کردوو خۆیان شاردەوە وسواری کەشتیەکە نەبوون، وەکاتێك تۆفانە گەورەکە کۆتایی پێ هات کەلە گێژاوو لافاوەکانی (لینلیون)

ڕوویدا که پێی دەڵێن : (دەریاچە شەپۆلاویەکان) ئەوسا هەریەك لە دوین وین و دوین فاك جێگیر بوون و سەرلەنوێ لەبەریتانیادا نیشتە جێ بوون.

ئەسکەندەنافیا : داستانەکانی (ئیدا) دەڵێن :. بیرغالمیر و هاوسەرەکەی لەزریانە گەورەکە و کەشتیە گەورەکە هەڵهاتن و خۆیان شاردەوە.

لیتوانیا لەداستانی (لیتوانیە) ش بۆمان دەگێڕێتەوە که کەمینەیەك لە خێزانەکانی مرۆڤ و ئاژەڵەکان لەکەشتیەکەدا ڕزگاریان بوو لە توێکڵێکی گەورەدا لەسەر لوتکەی یەکێك لە کێوە بەرزەکان، کاتێك گێژاوو ڕەشەباکە هەڵیکرد وە ئاوەکانیش هەڵسان و بوونە لافاو کە دوانزە شەوو ڕۆژی خایاند وەگەیشتە شاخەبەرزەکە بۆئەوەی هەرچیەکی بەسەرەوەیە هەمووی قووت بدات، خوای بەدیهێنەر توێکڵێکی گەورەی بۆ ناردن، ئەوانەی لەسەرشاخەکە بوون ئەم توێکڵەیان کردە کەشتیەك و خۆیانیان پێ ڕزگار کرد.

چین :. سەرچاوە چینیەکان دەگێڕنەوە کە پیاوێك بەناوی (یاو) یان (فالی) لەگەڵ خێزان و ماڵ و منداڵەکانی و حەوت کەسی تریش کەلەکەشتیەکەدا بوون کەلەو زریانە گەورە و زەمین لەرزەیە ڕزگاریان بوو، وەدەڵێ : (لەڕاستیدا زەوی تەواو ڕێران بوو بوو، ئاوەکانیش تەقی بوون و هەموو شتێکیان داپۆشی بوو). وەلەکۆتایشدا ئاو چواردەوری دابوون.

تۆفانی نوح لەداستانە ئیغریقیەکاندا :. (زیوس) ی خوا هەموو ڕۆژێك بڕیاری زریان و ژێر ئاو خستن و نوقم کردنی خەڵکی دا لەبەر ئەوەی زەویان پڕکردبوو لەخراپەکاری، ئەوسا (دیوکالیون) و (بیرای) هاوسەری بەتەنها لەزریانەکە ڕزگاریان بوو، ئەویش لەبەر ئەوەی برومیشیوسی باوکی دیوکالیون ئامۆژگاری ئەوەی کرد کە هەستێت بە دروست کردنی کەشتیەك، پاشان هەردوو هاوسەر دوای نۆ ڕۆژ لەسەرکەوتنی کەشتیەکە دابەزینە سەر کێوی (بیرنا سوس). هەموو ئەم داستانانە بەڵگەی ڕاستی مێژوو یەکی دیارو ڕۆشنن، تێکڕای نەتەوەکان

پێغەمبەرێکیان بۆ ڕەوانە کراوە و سروشی خوایان پێ گەیان دوون، جالەبەرئەوە ژمارەیەکی زۆری شارستانیەتەکان چیرۆکی تۆفانیان ناسی، بەلاّم بەداخەوە کاتێك خەلّکی دەستیان کرد بە دەستێوەردان و دەستکاری کردنی ناوەرۆکی سروش و نیگای ڕاستی ئاسمان، دەستکرایە تانەو تەشەر لێدان و شێواندنی ئەم ڕووداوە تاوەکوو گۆڕیان بۆ داستانە هەلّبەستراوەکان. قورئانی پیرۆز تاکە سەرچاوەیەکە کەدەتوانین چیرۆکی نوح و گەلەکەی تێدا بدۆزینەوە کەبەدرۆیان خستبوویەوە چونکە تاکە سەرچاوەیەکی سروشە کەدەستکاری نەکراوە. قورئانی پیرۆز زانیاری تەواو و ڕاستمان پێشکەش دەکات، نەك تەنها لەسەر چیرۆکی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) بەلّکو لەسەر نەتەوەکانی پێش و ترو هەروەها ڕووداوە مێژوویەکانیش، لەبەشەکانی داهاتوماندا چیرۆکی ڕاستەقینەی ئەم هۆزو نەتەوانە پیشان دەدەین.

## بەشی دووەم

## ژیانی ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت)

﴿ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾ ﴾ **آل عمران (٦٧-٦٨)** واتە :. ﴿(ئاشکرایە) کە ئیبراهیم نە جوولەکە بووە و نەگاور، بەڵکو ملکەچ و فەرمانبەردار و موسڵمان بووە و لەدەستەی موشریك و هاوەڵگەران نەبووە. نزیکترین کەس لە ئیبراهیمەوە : ئەو کسانەن کەلەسەردەمی خۆیدا شوێنی کەوتبوون، هەروەها ئەم پێغەمبەرەش (سەلامی خوای لێ بێت) و ئەوانەی کەباوەڕیان هێناوە بە (پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم و موسا و عیسا و موحەممەد و هەموو پێغەمبەران بە گشتی علیهم السلام)، بێگومان خوا یارو یاوەرو پشتگیری ئیماندارانە﴾. چەند جارێك لەقورئانی پیرۆزدا و لەچەند بۆنەیەکدا باسی ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) کراوە، وەخوای گەورەش بەپێشەنگی مۆڤایەتی وەسفی کردووە، وە ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) هەستا بەگەیاندنی پەیامی خوای گەورە بۆ هۆزو نەتەوەکەی کەدارو بەردیان دەپەرست وەلەهەمان کاتیشدا ئاگاداری کردنەوە کەدەست لەو کارانە هەڵبگرن ولە خوا بترسن، بەڵام هۆزو نەتەوەکەی گوێیان لەخۆیو بانگەوازەکەشی نەدەگرت، بەڵکو بەردەوام پێچەوانەی حەزرەتی ئیبراهیم

دەبوونەوە، وەکاتێکیش نەیارانی گەلەکەی زۆر بوون، ئەوکات ئیبراهیم پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) ئەوەی لەسەر بوو کە لەگەڵ خێزانەکەی و (لوط) پێغەمبەرو هەندێ برِوادارردا کۆچ بکەن بۆ شوێن و جێگایەکی دیکە.
قورئانی پیرۆزیش ئاماژەبەوە دەکات کە حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) شوێن بەرنامەی (نوح پێغەمبەر کەوتووە.(سەلامی حوای لێ بێت) وەلەنەوە و وەچەی ئەو پێغەمبەرەشە :.﴿ سَلَٰمٌ عَلَىٰ نُوحٖ فِي ٱلۡعَٰلَمِينَ ﴿٧٩﴾ إِنَّا كَذَٰلِكَ نَجۡزِي ٱلۡمُحۡسِنِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّهُۥ مِنۡ عِبَادِنَا ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٨١﴾ ثُمَّ أَغۡرَقۡنَا ٱلۡأٓخَرِينَ ﴿٨٢﴾ ۞ وَإِنَّ مِن شِيعَتِهِۦ لَإِبۡرَٰهِيمَ ﴿٨٣﴾ ﴾ **الصافات** (٧٩-٨٣) واتە :. ﴿سلاو لەسەر نوح لەلایەن سەرجەم ئیماندارانەوە لەهەموو کات و شوێنێکدا. بەراستی ئێمە ئابەو شێوەیە پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە (یادیان دەهێڵینەوە). بەراستی ئەو لەبەندە ئیماندارەکانی ئێمەیە. لەوە و دوا ئەوانی ترمان نوقمی زریان کرد. بێگومان لە شوێن کەوتەو پەیرەوانی نوح –ئیبراهیم- ە (سەلامی خوایان لێ بێت)﴾. زۆربەی ئەو کەسانەی کەلەسەردەمی ئیبراهیم دا بوون (سەلامی خوای لێ بێت) نیشتە جێی دۆڵی (دوو رووبار) و بانی (ئەنا دۆڵ) بوون کە خەڵکەکەی ئاسمان و ئەستێرەکانیان دەپەرست، وەبەناو بانگ ترینی خواکانیان (سن) ی ناو بوو کە مانگ بوو، وەهەروەها وەك مرۆڤ شێوەیان بۆ کێشا بوو کە ریشێکی درێژ و پۆشاکێکی سپیان لەبەرکردبوو وەمانگیشی لەدەستێکدا لەشێوەی مانگی یەك شەوە داهەڵگرتبوو، ئینجا ئەمانە هەڵدەستان بە وێنە کێشان و پەیکەر داتاشین بۆ ئەم خوایانە و دەیان پەرستن، ئیتر بت پەرستی بوویە یاساو رێسا بەشێوەیەکی بەرفراوانیش بڵاو بوویەوە.
لەراستیدا خاکێکی بەپیت و گونجاو لەناوچەی رۆژهەڵاتدا دۆزرایەوە ئەوەی مسۆگەر کرد کەبۆ ماوەیەکی درێژ خەڵکی بەردەوام ئەم بتانەیان دەپەرست

هەتارەکوو سالّی (٦٠٠) زاینی، لەئەنجامی ئەم بیرو باوەڕەشدا جۆرەها بیناو خانوو دەبینران بەدرێژایی ئەوناوچەی کە دەکەوێتە نێوان دۆڵی دوو ڕووبار و بالەکانی ناوەوەی ئەنادۆڵ کەناوی لێنرا بوو (زقورات)، ئەم خانوانەش وەك پەرستگاو شوێنی گەردوون زانەکان بەکار دەهێنران وەهەر لێرەدا خوای مانگ کەناوی (سن) بوو دەپەرسترا [1].

ئەم ئاینەی کەلەپێش شوێنەوارە هەلکەنراوەکانی ئەم سەردەمە ئاشکرا نەکرابوو، قورئانی پیرۆز بۆمانی باسکردووە کە ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) پەرستن و بەندایەتی بۆ کردنی ئەم بتانەی ڕەت کردووەتەوە، ڕووی کردووەتە پەرستنی خوای تاکو تەنها، لەم ئایەتانەی لای خوارەوە دا چۆنیەتی هەڵس و کەوتی حەزرەتی ئیبراهیم مان (سەلامی خوای لێ بێت) بۆ دەردەخات کە لەبەرامبەر ئەم بیرو باوەڕەدا هەڵوێستی چۆن بووە :.

﴿ ۞ وَإِذْ قَالَ إِبْرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ ءَازَرَ أَتَتَّخِذُ أَصْنَامًا ءَالِهَةً ۖ إِنِّىٓ أَرَىٰكَ وَقَوْمَكَ فِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿٧٤﴾ وَكَذَٰلِكَ نُرِىٓ إِبْرَٰهِيمَ مَلَكُوتَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَلِيَكُونَ مِنَ ٱلْمُوقِنِينَ ﴿٧٥﴾ فَلَمَّا جَنَّ عَلَيْهِ ٱلَّيْلُ رَءَا كَوْكَبًا ۖ قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَآ أُحِبُّ ٱلْءَافِلِينَ ﴿٧٦﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلْقَمَرَ بَازِغًا قَالَ هَٰذَا رَبِّى ۖ فَلَمَّآ أَفَلَ قَالَ لَئِن لَّمْ يَهْدِنِى رَبِّى لَأَكُونَنَّ مِنَ ٱلْقَوْمِ ٱلضَّآلِّينَ ﴿٧٧﴾ فَلَمَّا رَءَا ٱلشَّمْسَ بَازِغَةً قَالَ هَٰذَا رَبِّى هَٰذَآ أَكْبَرُ ۖ فَلَمَّآ أَفَلَتْ قَالَ يَٰقَوْمِ إِنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٧٨﴾ إِنِّى وَجَّهْتُ وَجْهِىَ لِلَّذِى فَطَرَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ حَنِيفًا ۖ وَمَآ أَنَا۠ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٧٩﴾ ﴾ (الأنعام ٧٤-٧٩) واتە : ﴿(بەسەرهاتی سەدەکانی ڕابوردوو بێنەوە یادیان) کاتێك ئیبراهیم

[1] إيفيرت بلاك ، آناإدموندز ، المواقع الأنجيلية في تركيا ، أستنبول : دارالأحمر للطباعة والنشر.

بەباوکی وت : ئایا ڕاستە چەند بتێك بکەیتە خوا ؟! بەڕاستی من دەبینم تۆش و قەومەکەشت لەناو گومڕاییەکی ئاشکرادان. بەو شێوەیەش دەستەلاتی تۆکمەمان لەئاسمانەکان و زەویدا نیشانی ئیبراهیم دەدەین بۆ ئەوەی بەلگە بەدەست بێت و لەڕیزی دلنیاکاندا بێت. ئینجا کاتێك شەوبالی کێشا بەسەر ئیبراهیم دا ئەستێرەیەکی (گەشی گەورەی) بینی، بۆیە وتی : ئاگادارین، وادابنێین ئەمە پەروەردگارمە، کاتێك ئەستێرەکەی لێ ئاوا بوو وتی : من شتی لەبەر چاو ون بووم خۆش ناوێت و نایپەرستم. ئینجا کاتێك مانگی بینی هەلهات، وتی : ئاگادارین، وادابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، کاتێك ئەویش ئاوا بوو وتی : سوێند بێت بەخوا ئەگەر پەروەردگارم هیدایەتی نەدامایا، ئەوە بێگومان لەڕیزی دەستەی گومڕاکاندا دەبووم. ئینجا کاتێك خۆری بینی هەلهات، وتی : ئاگادارین، وادابنێین ئەمەیان پەروەردگارمە، ئەمەگەورە تریشە کاتێك ئەویش ئاوا بوو وتی : ئەی خەلکینە، ئەی خزمینە، بەڕاستی من بەریم لەوشتانەی ئێوە کردووتانە بەهاوەل و شەریك بۆ (پەروەردگار). بەڕاستی من ڕووی خۆم و دلم لەپەرستندا کردۆتە ئەوزاتەی ئاسمانەکان و زەوی فەراهەم هێناوە، لەکاتێکدا ڕووم لەهیچ شتێکی ترناکەم، بەدلنارامی تەواویشەوە (دەلێم کە) هەرگیز من لەڕیزی موشریك و هاوەلگەراندا نیم﴾. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا بەدرێژی باسی شوێن و لەدایك بوونی حەزرەتی ئیبراهیمی بۆ نەکردوین ، بەلکو باسی ئەوەی کردووە کە حەزرەتی ئیبراهیم و حەزرەتی **لوط** (سەلامی خوایان لێ بێت) لەدوو ناوچەی نزیکدا بوون و لەیەك سەردەمیشدا پێغەمبەرایەتیان کردووە، بەلگەش بۆ ئەم وتەیە قورئانی پیرۆزە کەباس لەوە دەکات کە چەند نێرراوێکی پەروەردگار دەچوون بۆ سزادانی هۆزو نەتەوەی **لوط** پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) پێش ئەوەی بگەنە شارەکەی **لوط** لایاندایە لای حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لەوێشدا مژدەیان دایە خێزانەکەی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) کە

منداڵێکی چاوگەشی دەبێت.

لێرەدا بابەتێکی زۆر گرنگ هەیە لە چیرۆکی حەزرەتی ئیبراهیم دا (سەلامی خوای لێ بێت) کەعەهدی قەدیم باسی نەکردووە، ئەویش دروست کردنی کە عبەی پیرۆزە لەقورئانی پیرۆزدا ئەوە دەبینین کە کەعبەی پیرۆزبەدەستی حەزرەتی ئیبراهیم وحەزرەتی ئیسماعیل بونیادنرا، تاکە شتێك کە مێژوو نوسەکانی ئەمڕۆ دەیزانن دەربارەی ڕابووردووی کەعبە ئەوەیە کە ئەم شوێنە لەدێرزەمانەوە شوێنێکی پیرۆزبووە، بەڵام ئەوپەیکەرو بتانەی کەلەناو کەعبەی پیرۆزدا بوون لەسەردەمی نەفامی و لەپێش حەزرەتی موحەممەد دا (درودی خوای لێ بێت)، بۆ ئەو مەبەستە هاتووە کەئاینی حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) بشێوێنێت کە لەلایەن پەروەردگارەوە نیگای بۆهاتبوو کە دووركەونەوەلێی و لابدەن لێی.



ئەو ئاینانەی کەلەسەر هاوەڵ پەیداکردن بۆ خوا لەسەردەمی حەزرەتی ئیبراهیمدا (سەلامی خوای لێ بێ)



باو بوو لەدۆڵی دوو ڕووباردا. جا (سن) کە خوای مانگ بوو یەکێك بوو لەگەورەترینی بتەکان لایان، خەڵکی هەستان بەداتاشینی پەیکەر بۆ ئەم خوایانەو دەیان پەرستن. پێدەچێ پەیکەرەکانی (سن) کەلەلای چە پەوەن هەروەك چۆن هێمای مانگ کەلەسەر سنگی پەیکەرەکە زۆر بەڕونی دەر دەکەوێت.



خەڵکی ئەو سەردەمە بەتەکنیکی زۆر پێشکەوتووی ئەوسەردە ئەم بینایانەیان دروستکرد وەك پەرستگاو روانگەی ئەستێرە نا لەیەك کاتدا بەکار دەهێنا، وە ئەستێرەکان و خۆرو مان لەپەرستراوە سەرەکیەکانیان بوو، لەبەر ئەوە ئاسمان گرنگ تایبەتی خۆی هەبوو لەلایان.



# ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) بەپێی ڕیوایەتی

## عەهدی قەدیم

عەهدی قەدیم تەنها سەرچاوەیەکە کەزۆرێك لەوردەکاریەکانی ژیانی ئیبراهیم پێغەمبەری تێدایە (سەلامی خوای لێ بێت) لەگەڵ ئەوەی کە زۆربەی ئەوسەرچاوانەش بڕوا پێکراو نین، بەپێی ڕیوایەتەکانی تەورات حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لەشاری (ئوور) لەساڵی (١٩٠٠) پێش زایین لەدایك بووە کەیەکێك بووە لەگرنگترین شارەکانی ئەوسەردەمە، کەدەکەوێتە بەشی خوارووی ڕۆژهەلاتی دەشتاییەکانی دۆڵی دوو ڕووبارەوە، کاتێك ئیبراهیم لەدایك بوو ئەوناوەی نەبوو، بەڵکو ناوی (ئەبرام) بوو، بەڵام دواجار خواکەیان (یەهوە) ناوەکەی گۆڕیوە بۆ ئیبراهیم.

ڕۆژێك لەڕۆژان خواکەی داوای لە ئەبرام کردووە کەشارو هۆزو نەتەوەکەی بەجێ بهێڵێ و بەرەو شوێنێکی نادیار بڕوات و لەکۆمەڵگایەکی تازەدا نیشتەجێ ببێت، ئەبرام کە گوێی لەم بانگەوازە بوولەوکاتەدا تەمەنی حەفتاو پێنج ساڵ بوو، جاخۆی و سارای خێزانی کەئەمزۆك بوو - کەلەدوایدائەو ناوەدەبێت بە (سارة) کە بەمانای شاژن لێکدەدرێتەوە — لەگەڵ لوط ی برازایدا دەرچوون، وەلەکاتی ڕۆشتنیان بۆ ئەو شوێنەی کە بۆیان هەڵبژێررابوو، لە (حەران) لایانداو وەستان پاشان ڕێگەیان گرتەوەبەر، وەکاتێك گەیشتنە زەوی کەنعان کە خوا پەیمانی پێدابوون، هەواڵیان پێدرا کەئەم زەویە هەڵبژێرراوە بەتایبەتی پێشکەشی ئەوان کراوە، ئەبرام کاتێك تەمەنی گەیشتە نەوەدوو نۆساڵی لەگەڵ خوا پەیمانی بەست و ناوی لە (ئەبرام) ەوە گۆڕڕا بۆ (ئیبراهیم).

وەلەتەمەنی سەدوپەنجاو حەوت ساڵیدا کۆچی دوایی کرد، وەلەئەشکەوتێك لە

(ماتشبیله) له نزیك شاری حەبرونی (ئەلخەلیل) نێژرا لەکەناری ڕۆژ ئاوارە کە جولەکە داگیری کردووە، ئەم زەویەی کە ئیبراهیم لەبەرامبەر بڕێك پارەدا کڕی، یەکەمین سەروەتی خۆی و خێزانەکەی بوو لەو زەویەدا.

## شوێنی لەدایك بوونی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت)

## بەپێی ڕیوایەتی عەهدی قەدیم

ئەم بابەتە بووەتە جێگای مشت و مڕێکی بەردەوام و هەرواش ماوەتەوە،کاتێك گاورو جولەکەکان دەڵێن : حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لەخوارووی دۆڵی دوو ڕووبار دا لەدایك بووە، ئەوەی ڕاستی بێت بیرو باوەڕی ڕاستی ئیسلامیش پێی وایە کە حەزرەتی ئیبراهیم لەناوچەیەکی نزیك لە ئۆرفاو حەران دا لەدایك بووە، وەشوێنەوار ناسەتازەکانیش ئەوەیان بۆ دەرکەوتووە کە تێڕوانینی گاورو جولەکە پێچەوانەی ڕاستیەکان نیە. گاورو جولەکەکان لەڕیوایەتەکانیاندا پشتیان بەعەهدی قەدیم بەستووە، کەباس لەوەدەکات کە ئیبراهیم لەشاری ئوور لەدایك بووە کە دەکەوێتە خوارووی نێوان هەردوو ڕووبارەوە، دوای ئەوەی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لەوشارەدا پێگەیی، لەگەشتێکی دوورو درێژدا بەرەو میسر کۆچی کرد، وەبەناوچەی حەرانی تورکیاشدا تێ پەڕیوە.
وەلەڕاستیدا هێڵێك بەم تازەییە دۆزراوەتەوە کە گومان دروست دەکات لەڕاستێتی ئەم زانیاریانە، لەم هێڵە ئیفریقیەدا کە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێهەمی پێش زایین وەبەکۆنترین نوسخەی عەهدی قەدیمیش دادەنرێت کەتاوەکو ئێستا دۆزرابێتەوە، بەهیچ شێوەیەك باسی شاری ئووری نەکردووە، وەئەمڕۆش لە هەندێك لەوتوێژینەوانە کە لەعەهدی قەدیم دەکۆڵنەوە ئەوەیان تێدادەردەکەوێت کەوشەی ئور ڕوون نیە یاخود زیادەیەکی هێنراوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە

ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لەشاری ئووردا لەدایك نەبووە و، وەرِەنگە لەژیانیشیدا دۆڵی دوو ڕووباری نەبینیبێت. وێڕای ئەوەی کەناری هەندێ لەوناوچەو ماناکانیان بەپێی کات دەگۆڕێن، وەلەڕۆژگاری ئەمڕۆشماندابڕگەی دەشتەکانی دۆڵی دووڕووباریەشێوەیەکی گشتی ئاماژە بە تەپۆلکەکانی خوارووی دیجلەوفورات دەکات لەخاکی عێراقدا، بەلاّم بەرلە دووهەزارساڵ دۆڵی دوو ڕووبار زیاتر بەرەو باشوور درێژدەبویەوە تاگەیشتە حەران و لەوێش دەچووە ناوخاکی تورکیاوە، جانەگەرواماں دانا کە دەشتاییەکانی دۆڵی دوو ڕووبار کە لەعەهدی قەدیمدا باس کراون ڕاستن، ئەوکاتە هەڵەیە بڵێین دۆڵی دوو ڕووبار هەمان ئەو دۆڵی دوو ڕووبارەیە کەبەرلە دووهەزار ساڵ هەبووە. بەلاّم ئەگەر گومان لەوەدا هەبوو کەشاری ئور شوێنی لەدایك بوونی ئیبراهیم بووبێت (سەلامی خوای لێ بێت) لەڕاستیدا بە گشتی یەکدەنگیەك لەوەداهەیە کەدەڵێ کەحەزرەتی ئیبراهیم لەناوچەی حەران و دەوروبەریدا نیشتە جێ بووە.

لەسەرو ئەمانەشەوە چەند زانیاریەکی بچووك لەعەهدی قەدیمدا هەیە کە پاڵپشتی ئەوە دەکات کە حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لەحەران دا لەدایك بووە، بۆ نمونە : عەهدی قەدیم ناوچەی حەران بەناوچەی (ئارامیەکان) دادەنێت ﴿سفر التكوين ١١-١٣ و ٢٨:١٠﴾ ئەم دەقانەوە دەردەخات کەنەوەی حەزرەتی ئیبراهیم هەمان نەوەووەچەی ئارامیەکانن،وەلە ڕاستیدا دیاریکردنی ناسنامەی ئیبراهیم بەوەی کە (ئارامیە) ئەوە دەگەیەنێت کەژیانی لەوناوچەیەدا بەسەر بردووە، بەڵگە ئیسلامیەکان ئەوە دەڵێن کە حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) لە حەران و ئورفەدا لەدایك بووە، وەلە ئورفەشدا کەبەشاری پێغەمبەران ناو دەبرێت زۆرێك لەو داستانانە کە لە بارەی حەزرەتی ئیبراهیمەوە گێڕراونەتەوە بونیان هەیە.

## بۆچی عەهدی قەدیم گۆڕا

پێدە چێت عەهدی قەدیم و قورئانی پیرۆز وەکو بلێیی ئەم دووانە چیرۆکێك دەگێڕنەوە لەبارەی دوو کەسی جیاوازەوە ئەوانیش بریتین لە ئەبراهام و ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت)، جالەقورئانی پیرۆزدا حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) خوای گەورە وەکو پێغەمبەرێك بەپەیامێکی ئاسمانییەوە ناردی بۆ سەر هۆزو نەتەوەیەك کە ئاسمان و ئەستێرە و مانگ و بتی جۆراو جۆریان دەپەرست، حەزرەتی ئیبراهیم هەوڵی زۆریدا لەگەڵ گەلەکەیدا تاوەکو دووریان بخاتەوە لەگومڕایی و سەلێ شێواوی وەبەرەو ڕێگای ڕاست و درووست بیانبات، بەڵام بێ ئاکام بوو لەئەنجامیشدا ڕق و تووڕەییان لەبەرامبەر حەزرەتی ئیبراهیم دا جولآو دژایەتیان دەکرد، وەیەکێك لەبت پەرستە سەرسەختەکانیشی باوکی بوو کەبەردەوام دژایەتی دەکرد. لەڕاستیدا شتێکی لەم شێوەمان لەعەهدی قەدیمدا نیە، وەهەروەها چیرۆکی فڕێدانی ئیبراهیم بۆ ناوئاگرەکە و پێش ئەوەش شکاندنی ئیبراهیم بۆ بتەکانی هۆزەکەی لە عەهدی قەدیمدا باس نەکراوە، وەعەدی قەدیم باس لەوە دەکات کە ئیبراهیم باپیرەی جولەکەکانە، بێگومان ئەم بیرو بۆچوونەش لەگەورە پیاوانی جولەکەوە وەرگیراوە کەلەهەوڵی ئەوەدان ڕەگەز پەرستی و وەچەزادەیی بسەلێنن، چونکە جولەکە بڕوایان وایە کەگەلێکی تایبەتن و خوای گەورە لەناو تەواوی نەتەوەکانی دیکەدا هەڵی بژاردوون، وەبەم کارەشیان هەستان بەمەبەستی گۆڕینی کتێبە ئاسمانیەکەیان، وەشتانێکی زیادەیان خستەسەری تاوەکو لەگەڵ ماناو ناوەڕۆکی مەبستەکەیاندا هاوڕابێت، لەبەر ئەم هۆیە وادادەنێن کە حەزرەتی ئیبراهیم لەتەورات دا باپیرە گەورەیانە.

وەئەو گاورانەشی بڕوایان بەتەورات هەیە دەڵێن ئیبراهیم باپیرەی جولەکەیە، لەگەڵ جیاوازیەکی کەمدا کە گاورەکان پێیان وایە ئیبراهیم گاور بووە نەك جولەکە،

گاورەکان کە بایەخ نادەن بەماناو ناوەڕۆکی وەچەزادەیی وەك چۆن جولەکەکان بایەخی تەواوی پێدەدەن دەست لەمەلانێ لەگەڵ ئەم بۆچونەدا بەشێوەیەکی بەهێز کە بووەتەهۆی جیاوازی و ناکۆکیەك لەنێوانیان و لە نێوان جولەکەکاندا، وە قورئانی پیرۆزیش لەم بارەوە ئەم ناکۆکی و جیاوازیەمان بۆ ڕوون دەکاتەوە کە دەفەرمویت ﴿يَٰٓأَهْلَ ٱلْكِتَٰبِ لِمَ تُحَآجُّونَ فِىٓ إِبْرَٰهِيمَ وَمَآ أُنزِلَتِ ٱلتَّوْرَىٰةُ وَٱلْإِنجِيلُ إِلَّا مِنۢ بَعْدِهِۦٓ ۚ أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٦٥﴾ هَٰٓأَنتُمْ هَٰٓؤُلَآءِ حَٰجَجْتُمْ فِيمَا لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ فَلِمَ تُحَآجُّونَ فِيمَا لَيْسَ لَكُم بِهِۦ عِلْمٌ ۚ وَٱللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ ﴿٦٦﴾ مَا كَانَ إِبْرَٰهِيمُ يَهُودِيًّا وَلَا نَصْرَانِيًّا وَلَٰكِن كَانَ حَنِيفًا مُّسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنَ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿٦٧﴾ إِنَّ أَوْلَى ٱلنَّاسِ بِإِبْرَٰهِيمَ لَلَّذِينَ ٱتَّبَعُوهُ وَهَٰذَا ٱلنَّبِىُّ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ۗ وَٱللَّهُ وَلِىُّ ٱلْمُؤْمِنِينَ ﴿٦٨﴾

آل عمران (٦٥-٦٨) واتە: ﴿ئەی خاوەن کتێبەکان، ئێوە بۆ لە ئیبراهیم دەدرێن و (هەریەکەتان واادەنێت کەلەسەر ئاینی ئەوە) خۆ تەورات و ئینجیل دوای ئەو ڕەوانە کراون، ئەوە بۆ عەقڵ و ژیریتان ناخەنەکارو تاکەی ژیرنابن ؟! ئەوە ئێوەن موجادەلەو باس و خواستان لەسەر ئەو شتانە دەکرد کەزانیاریتان دەربارەی هەبوو... کەوابوو بۆچی دەم لەوشتانەشەوە دەدەن کەهیچ زانیاریتان دەربارەی نیە ؟ دیارە هەرخوا ئەوشتانە دەزانێت، ئێوە نایزانن. (ئاشکرایە) کە ئیبراهیم نەجولەکە بووە و نەگاور، بەڵکو مل کەچ و فەرمانبەردار و موسڵمان بووە و لەدەستەی

موشریکان و هاوەڵگەران نەبووە. نزیکترین کەس لە ئیبراهیمەوە : ئەوکەسانەن کەلەسەردەمی خۆیدا شوێنی کەتبوون، هەروەها ئەم پێغەمبەرەش (دروودی خوای لێ بێت) و ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوە (بە پێغەمبەرایەتی ئیبراهیم و موسا و عیسا و محمد و هەموو پێغەمبەران بەگشتی سەلامی خوایان لێ بێت)، بێگومان خوا یارو یاوەرو پشتگیری ئیماندارانە.﴾. ڕەنگە جیاوازی نێوان قورئانی پیرۆزو تەورات تەواو ڕۆشن بێت، ئەوەتا لە قورئانی پیرۆزدا باسی حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت) دەکات کە پێغەمبەری خوایەو خوای گەورەش ناردوویەتی بۆ گەلەکەی تاوەکو ئاگاداریان بکاتەوە و بانگەوازیشیان بکات، لەبەر ئەمەش لەبەرامبەریاندا وەستایەوە و دژایەتیشی کردن، وەبەردەوام ئامۆژگاری هۆزو نەتەوەکەی دەکرد ئەوانەیان کە دارو بەردیان دەپەرست، وەهەر لەوکاتەوەی کە لاووگەنج بوو ئامۆژگاری دەکردن کە دوور کەونەوە و وازلەو بت پەرستیە بهێنن، وە هۆزو نەتەوەکەی لەبری ئەوەی کە گوێڕایەڵی ئامۆژگاریەکانی بکەن وەڵامیان خۆئامادەکردنیان بوو بۆ کوشتنی و لەناو بردنی، دوای ئەوەی کەلەدژایەتی و ڕق و کینەی گەلەکەی دەرباز بوو، کۆتا ڕێگای گرتەبەر ئەویش کۆچ کردنی بوو...

## بەشی سێهەم

# قەومی **لوط** و ئەوشارەی کە ژێرا و ژوورکرا

﴿ كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ بِالنُّذُرِ ﴿٣٣﴾ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ حَاصِبًا إِلَّا آلَ لُوطٍ نَّجَّيْنَاهُم بِسَحَرٍ ﴿٣٤﴾ نِّعْمَةً مِّنْ عِندِنَا كَذَٰلِكَ نَجْزِي مَن شَكَرَ ﴿٣٥﴾ وَلَقَدْ أَنذَرَهُم بَطْشَتَنَا فَتَمَارَوْا بِالنُّذُرِ ﴿٣٦﴾ ﴾ **القمر** (٣٣-٣٦) واتە : ﴿هۆزی **لوط** یش بڕوایان بەهیچ بێدارکردنەوەیەك نەکرد. بێگومان ئێمە ئەوانیشمان بەردباران کرد (هەروەها ژێرەو ژووریش کران)، جگە لەلوط وخاووخێزانی ئیمانداری کەلەبەرەبەیاندا ڕزگارمان کردن. ئەوڕزگارکردنەنازوونیعمەتێکی تایبەتی بوولەلایەن ئێمەوە، جاهەرئاواپاداشتی کەسێك دەدەینەوە کە سوپاس گوزاری کردبێت. بەڕاستی **لوط** پێشترئاگاداری کردبوون لەتۆڵەی توندوبەهێزی ئێمە، کەچی گومانیان هەبوو لەوئاگادارییەو بڕوایان پێی نەبوو﴾. حەزرەتی **لوط** پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لەهەمان سەردەمی حەزرەتی ئیبراهیم دا ژیا کە خوای گەورە ناردی بۆ هەندێ هۆزو نەتەوەی دەورو پشتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت)، ئەم گەلەوەك خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بۆمان باس دەکات جۆرێك لەکاری ناڕەوایان ئەنجام دەدا کەلە پێش ئەواندا مرۆڤایەتی ئەم کارەیان نەناسیوە ئەویش نێربازیە، جالەکاتێکدا حەزرەتی **لوط** ئامۆژگاری ئەوەی دەکردن کە دەست لەم کارەناشیرینەیان هەڵبگرن و دوور کەونەوە لێی ئەگینا خوای گەورە تۆڵەیان لێدەکاتەوە و سزایان دەدات، بەڵام هۆزو نەتەوەکەی زیاتر بەردەوام دەبوون لەسەر ئەوکارەیان و بە درۆزنیان دادەناو نکوڵی ئەوەشیان دەکرد کە پێغەمبەری خوایە، لەکۆتایشدا ئەو نەتەوەیە تیاچوون ولەناو بران بەوەی کەخوای گەورەتوشی کارەساتێکی زۆرسەخت ودژواری

کردن.

لەعەهدی قەدیمدا ئاماژە بەناوچەیەك دەكات كە حەزرەتی (لوط) ی تێدا ژیاوە كەبریتیە لە ناوچەی (سدوم)، وەلەڕاستیدا ئەم ناوچەیەش دەكەوێتە باكووری دەریای سوورەوە، وەشوێنەوار ناسەكان ئەوەیان دەرخستووە كە ئەم ناوچەیە بەتەواوەتی وێران بووە وەك چۆن قورئانی پیرۆز بۆمانی باس كردوە، شوێنەوارناسەكان ئەوەدەسەلمێنن ئەم شارە لەناوچەی دەریای مردوودا بووە كەبە سنورەكانی ئوردون و فەلەستین دا درێژدەبێتەوە. پێش ئەوەی هەستین بەپشكنی شوێنەواری ئەم ڕووداوە، دەتوانین ووردبینەوە و بیربكەینەوە لەهۆكارەكانی پشت ئەم سزایەی كە بەسەر نەوەی **لوط** پێغەمبەردا هات. قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە كەچۆن حەزرەتی **لوط** (سەلامی خوای لێ بێت) هۆزو نەتەوەكەی ئاگادار كردوەتەوە و بەچیش وەلامیان داوەتەوە : ﴿كَذَّبَتْ قَوْمُ لُوطٍ الْمُرْسَلِينَ (١٦٠) إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ لُوطٌ أَلَا تَتَّقُونَ (١٦١) إِنِّي لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ (١٦٢) فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ (١٦٣) وَمَا أَسْأَلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ إِنْ أَجْرِيَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ الْعَالَمِينَ (١٦٤) أَتَأْتُونَ الذُّكْرَانَ مِنَ الْعَالَمِينَ (١٦٥) وَتَذَرُونَ مَا خَلَقَ لَكُمْ رَبُّكُمْ مِنْ أَزْوَاجِكُمْ بَلْ أَنْتُمْ قَوْمٌ عَادُونَ (١٦٦) قَالُوا لَئِنْ لَمْ تَنْتَهِ يَا لُوطُ لَتَكُونَنَّ مِنَ الْمُخْرَجِينَ (١٦٧) قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُمْ مِنَ الْقَالِينَ (١٦٨)﴾ الشعراء (١٦٠-١٦٨) واتە ﴿قەومی **لوط** یش بڕوایان بەپێغەمبەران نەكرد...كاتێك (لوط) ی برایان پێی وتن : باشە ئەوە ئێوە لە خواناترسن. بەڕاستی دڵنیابن كەمن فرستادەیەكی ئەمین و دڵسۆزم بۆتان...كەوا بوو لەخوا بترسن و فەرمانبەرداری من بكەن... من داوای هیچ جۆرە پاداشتێكتان لێ ناكەم لەسەری، من تەنها پاداشتی خۆم لە پەروەردگاری جیهانەكان دەخوازم. ئایا لەناو ئەو هەموو خەڵكەدا ئێوە بەشوێن نێرینەدا دەگەڕێن و دەتانەوێت ئارەزووی جووت

بوون لەگەڵ ئەواندا جێ بە جێ بکەن ؟... وازیش دەهێنن لەهاوسەران و هاو جوتانی خۆتان کە پەروەردگارتان بۆی دروست کردوون، بەڵکو ئێوە هەرقەومێکی نالەبارو بەدڕەوشت و نارەسەنن. تاوانباران وتیان : ئەی لوط، ئەگەر کۆڵ نەدەیت لەدەربەدەر کراوان دەبیت. لوط وتی : بەڕاستی من بێزارم لەکارو کردەوەتان و لەفرەتی لێ دەکەم و بێدەنگ نابم.﴾. نەتەوەکەی لوط (سەلامی خوای لێ بێت) هەڕەشەیان لەحەزرەتی لوط کرد کاتێك بانگی دەکردن بۆ سەر ڕێگای ڕاست، لەڕاستیدا زۆریان ڕق لێی بوو چونکە بانگی دەکردن بۆ سەر ڕێگای ڕاست و پاکداوێنی، وەبڕیاریاندا کە خۆی و ئەوباوەڕدارانەی کە لەگەڵیدا بوون دەریکەن، وەك چۆن ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز پیشانمان دەدەن : ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾ وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ ﴾ الأعراف (٨٠-٨٢). واته : ﴿یادی (لوط پێغەمبەریش) بکە کاتێك بەقەومەکەی وت : چۆن ئێوە گوناهو تاوانێکی وادەکەن کەتا ئێستا هیچ کەس پێش ئێوە لە جیهاندا گوناهو تاوانی وای نەکردووە ؟! چونکە بەڕاستی ئێوە ئارەزووی (جنسی) خۆتان لەگەڵ پیاواندا ئەنجام دەدەن لەباتی ژنانی هاوسەرتان، نەخێر ئێوە قەومێکی ناپوخت و سنوور بەزێن و زیادە ڕەون. وەڵامی قەومە نالەبارەکەی تەنها ئەوە بوو کە وتیان : ئەوانە شار بەدەر کەن چونکە ئەوانە کەسانێکن خۆیان پاك ڕادەگرن (داوێن پاکن و وەك ئێمە ناکەن !!﴾

حەزرەتی لوط (سەلامی خوای لێ بێت) هەموو ڕاستیەکانی پیشانی گەلەکەی داو بە شێوازێکی ڕاست و دروست ئاگاداری کردنەوەو ترساندنی. بە سزای خوایی،

بەلام ئەوان بایەخێکیان بەدابەهیچ هەڕەشەیەکی حەزرەتی **لوط** کە بەسزای سەختی خوایی دەیترساندن، ئەمەلەکاتێکدا هۆزو نەتەوەکەی بەردەوام دژایەتی و هەڕەشەیان لێ دەکرد و بەهەموو شێوازێکیش بەدرۆیان دەخستەوە، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلْفَٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٨﴾ أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ ٱلسَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِى نَادِيكُمُ ٱلْمُنكَرَ ۖ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوا۟ ٱئْتِنَا بِعَذَابِ ٱللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ **العنكبوت** (٢٨-٢٩) واتە : ﴿یادی (**لوط**) یش بکە کاتێك بەقەومەکەی ووت : ئێوە بەڕاستی تاوانێکی گەورە دەکەن، ئێوە گوناهێکی ناشیرین ئەنجام دەدەن، هیچ کەس بەر لەئێوە بەکاری وا هەڵنەساوە !!! ئایا ئێوە بەڕاستتانە نێربازی دەکەن و ڕێگە بەخەڵکی دەگرن و لە یانە کەتاندا کاری نابەجێ و ناشیرین و نادروست ئەنجام دەدەن ؟! کەچی وەڵامی قەومی (بەدخوو) تەنها ئەوەبوو کە وتیان : ئادەی کوا سزاو تۆڵەی خوا، ئەگەر تۆ ڕاست دەکەیت ؟! بۆ مان بهێنە؟﴾ دوای ئەوەی حەزرەتی **لوط** (سەلامی خوای لێ بێت) ئەم وەڵامەی وەرگرت ڕووی کردە خوای گەورەو داوای کۆمەکی لەپەروەردگاری کرد : ﴿ قَالَ رَبِّ ٱنصُرْنِى عَلَى ٱلْقَوْمِ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴿٣٠﴾ ﴾ **العنكبوت** (٣٠) واتە: ﴿(**لوط** دوعای لێکردن) وتی : پەروەردگارا، سەرکەوتنم پێ ببەخشە بەسەر ئەم قەومەی کە تۆوی خراپە دەچێنن.﴾.

﴿ رَبِّ نَجِّنِى وَأَهْلِى مِمَّا يَعْمَلُونَ ﴿١٦٩﴾ ﴾ **الشعراء** (١٦٩) واتە : ﴿ئەوسا کەنائومێد بوو لێیان، نزای کردو وتی : پەروەردگارا خۆم و ماڵ و خێزانم ڕزگاربکە لەوکارو کردەوانەی ئەمانە دەیکەن﴾. بەم شێوەیە خوای گەورە وەڵامی پێغەمبەرەکەی دایەوە و دوو فریشتەی لەشێوازی دوو پیاودا ڕەوانە کرد بۆیان، پێش ئەوەی ئەم

دوو فریشتەیە بگەنەلای **لوط** پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لایان دایە لای حەزرەتی ئیبراهیم (سەلامی خوای لێ بێت)، وەلەوێدا مژدەیان بەخێزانەکەی ئیبراهیم دا (سەلامی خوای لێ بێت) کە منداڵێکی دەبێت، پاشان دوو فریشتەکە هۆکاری ئەم ڕۆشتنەیان بۆ سەر هۆزەکەی **لوط** بۆ حەزرەتی ئیبراهیم ڕۆشن کردەوە چونکە بێگومان خوای گەورە بڕیاری ئەوەی داوە بەسەرئەو هۆزو نەتەوەیەدا کەلەناویان ببات....﴿ إِلَّآ ءَالَ لُوطٍ إِنَّا لَمُنَجُّوهُمْ أَجْمَعِينَ ﴿٥٩﴾ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ قَدَّرْنَآ ۙ إِنَّهَا لَمِنَ ٱلْغَٰبِرِينَ ﴿٦٠﴾ ﴾ **الحجر** (٥٩-٦٠) واتە : ﴿بەڵام خانەوادەی **لوط** هەموویان ڕزگار دەکەین. جگە هاوسەرەکەی، بەڕاستی بڕیارمانداوە ئەویش لە ڕیزی تیاچووەکاندا بمێنێتەوە چونکە بێ باوەڕە﴾. دوای ئەوەی دوو فریشتەکە لەلای حەزرەتی ئیبراهیم دەرچوون و گەیشتنە لای حەزرەتی **لوط** (سەلامی خوا لەهەردووکیان بێت)،لەسەر ڕوخساری دوو پێغەمبەر حەزرەتی **لوط** بەهاتنی ئەو دوو نێرراوە لەناکاودا زۆر خەمبار بوو چونکە لە پێشتردا نەی دیبوون، بەڵام دواجار کە دووفریشتەکە. وتووێژیان لەگەڵ حەزرەتی **لوط** دا کرد ئینجا حەزرەتی **لوط** یش (سەلامی خوای لێ بێت) هێوربویەوە، وەك خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا بۆمانی گێڕاوەتەوە : ﴿ وَلَمَّا جَآءَتْ رُسُلُنَا لُوطًا سِيٓءَ بِهِمْ وَضَاقَ بِهِمْ ذَرْعًا وَقَالَ هَٰذَا يَوْمٌ عَصِيبٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ **هود** (٧٧) واتە : ﴿کاتێکیش وەفدی فریشتەکانی ئێمە هاتنە **لای لوط**، ناڕەحەت بوو پێیان، زۆر دڵتەنگ بوو (چونکە لە شێوەی چەند لاوێکی پێکەوتوودا هاتبوون، لەدڵی خۆیدا) وتی : ئەمە ڕۆژێکی سەختە (منی تێکەوتووم)﴾ وەهەروەها لەشوێنێکی تردا دەفەرموێت : ﴿ قَالَ إِنَّكُمْ قَوْمٌ مُّنكَرُونَ ﴿٦٢﴾ قَالُوا۟ بَلْ جِئْنَٰكَ بِمَا كَانُوا۟ فِيهِ يَمْتَرُونَ ﴿٦٣﴾ وَأَتَيْنَٰكَ بِٱلْحَقِّ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿٦٤﴾ فَأَسْرِ بِأَهْلِكَ بِقِطْعٍ مِّنَ ٱلَّيْلِ

وَٱتَّبِعْ أَدْبَٰرَهُمْ وَلَا يَلْتَفِتْ مِنكُمْ أَحَدٌ وَٱمْضُوا۟ حَيْثُ تُؤْمَرُونَ ﴿٦٥﴾ وَقَضَيْنَآ إِلَيْهِ ذَٰلِكَ ٱلْأَمْرَ أَنَّ دَابِرَ هَٰٓؤُلَآءِ مَقْطُوعٌ مُّصْبِحِينَ ﴿٦٦﴾ **الحجر** (٦٢-٦٦) واته : ﴿پێی وتن : بەڕاستی ئێوە کەسانێکی نەناسراون... دوای ئەوەی فریشتەکان خۆیان پێ ناساند وتیان : دڵت هیچ نەکات بەڵکو ئێمە هاتووین بۆلای تۆ بۆ ئەوەی ئەو هەڕەشانەی تۆ دەتکردو ئەو بێ ڕەوشتانە گومانیان لێ دەکرد، بیهێنینەدی... ئەمڕۆ ئیتر بۆ بەرپاکردنی ئەو ڕاستیە هاتووین و بێ گومان ڕاستیش دەڵێین... بەشێکی شەو بمێنێت خۆت و خانەوادەت دەچن و تۆ دوایان بکەوە، باهیچ کامتان ئاوڕ نەداتەوە، بڕۆن بەرەو ئەوشوێنەی کەفەرمانتان پێ دەدرێت. ئێمە نیگامان نارد بۆلای-**لوط** — و بڕیارماندا کەبە ڕاستی لەکاتی بەرەبەیاندا دوای ئەوانە بڕاوەو دەیاریان نەماوە﴾.

لەم کاتەدا هۆزو نەتەوەکەی **لوط** زانیان کە لوط میوانی هاتووە، هەستان بەرەو ماڵی حەزرەتی **لوط** (سەلامی خوای لێ بێت) کەوتنەڕێ بەمەبەستی نیازە گلاوەکانیان، ئینجا دایان لەدەرگای ماڵی **لوط** پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) وەچاوەڕێی هاتنە دەرەوەی میوانەکانیان دەکرد، حەزرەتی لوط یش (سەلامی خوای لێ بێت) ترسی میوانەکانی هەبوو کەلەلایەن گەلەکەیەوە تووشی ئازاربێن لەبەر ئەوە حەزرەتی **لوط** (سەلامی خوای لێ بێت) ڕووی کردە گەلەکەی و پێی وتن : ﴿ قَالَ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ ضَيْفِى فَلَا تَفْضَحُونِ ﴿٦٨﴾ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُخْزُونِ ﴿٦٩﴾ ﴾ **الحجر** (٦٨-٦٩) واتە : ﴿**لوط** وتی : بەڕاستی ئەوانە میوانی منن و حەیای من مەبەن، شەرمەزارم مەکەن و ئابڕووم مەبەن، لەخوا بترسن و ڕیسوام مەکەن (لەشەڕواڵ پیسی کۆڵ بدەن)﴾. گەلەکەشی وەڵامیان دایەوەو وتیان :﴿ قَالُوٓا۟ أَوَلَمْ نَنْهَكَ عَنِ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٧٠﴾ ﴾ **الحجر** (٧٠) واتە : ﴿ (شەڕواڵ پیس و ناپوختەکان)

وتیان : ئایا ڕێگری ئەوەمان لێ نەکردیت کەحەقی کەست نەبێت وە بەرگری لەکەس نەکەیت﴾. حەزرەتی **لوط** (سەلامی خوای لێ بێت) واگومانی دەبرد کە خۆی و میوانەکانی دووچاری ئەو دەست درێژیە شەیتانیەی گەلەکەی ببنەوە، لەبەر ئەوە حەزرەتی **لوط** (سەلامی خوای لێ بێت) ووتی : ﴿ قَالَ لَوْ أَنَّ لِي بِكُمْ قُوَّةً أَوْ ءَاوِيٓ إِلَىٰ رُكْنٖ شَدِيدٖ ﴿٨٠﴾ ﴾ **هود** (٨٠) واتە : ﴿**لوط** وتی : خۆزگە بەڕاستی هێزێکم دەبوو لەخۆتان (بۆ بەرامبەری ناپاکەکانتان) یان پەنایەکی بەهێزم دەست دەکەوت و دەڕژیشتم بۆی (تاتۆڵەتان لێ بکەمەوە و تەمێتان بکەم)﴾. پاشان میوانەکان بە **لوط یان ووت ویادیان خستە وە:** کەئەوان نێرراوی خوان بۆلای **لوط** وپێیان ووت:

﴿ قَالُواْ يَٰلُوطُ إِنَّا رُسُلُ رَبِّكَ لَن يَصِلُوٓاْ إِلَيۡكَۖ فَأَسۡرِ بِأَهۡلِكَ بِقِطۡعٖ مِّنَ ٱلَّيۡلِ وَلَا يَلۡتَفِتۡ مِنكُمۡ أَحَدٌ إِلَّا ٱمۡرَأَتَكَۖ إِنَّهُۥ مُصِيبُهَا مَآ أَصَابَهُمۡۚ إِنَّ مَوۡعِدَهُمُ ٱلصُّبۡحُۚ أَلَيۡسَ ٱلصُّبۡحُ بِقَرِيبٖ ﴿٨١﴾ ﴾ **هود** (٨١) واتە : ﴿میوانەکان وتیان : ئەی **لوط** بەڕاستی ئێمە فریشتەی نێرراوی پەروەردگاری تۆین، ئەوتاوانبارانە هەرگیز ناگەنەلات (تا بتوانن دەست درێژی بکەنە سەر ئێمە) و جاتۆ خاوو خێزانت لەبەشێکی شەودا دەربکە و کەس لە ئێوە لانەکاتەوە و ئاوڕ نەداتەوە، جگە لەهاوسەرەکەت (کەلاسارە و بەگوێت ناکات) چونکە بەڕاستی ئەو سزایەی کەتاوانبارانی گرتوەتەوە ئەویش دەگرێتەوە، بەڕاستی کاتی سزاکەشیان لەبەرەبەیاندایە، ئایا بەرەبەیانی ئەم شەو نزیک نیە ؟!﴾. وەکاتێك نیازوو ئارەزوواتە ناڕەواکانی گەلەکەی **لوط** (سەلامی خوای لێ بێت) گەیشتە لوتکەی تاوانباری، خوای گەورە **لوط** پێغەمبەری دەربازکرد، ئەویش بەیارمەتی و کۆمەکی ئەو دوو فریشتەیەی کەناردبووی بۆیان، وەبۆ بەیانیەکەی خوای گەورە هۆزو نەتەوەکەی لەناوبردن بەوکارەساتە وێرانکەرەی کە پێشتر لەلایەن حەزرەتی **لوط** وە (سەلامی خوای لێ

بێت) ئاگادارکرابوونەوە پێی، وەك قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت : ﴿ وَلَقَدْ رَاوَدُوهُ عَن ضَيْفِهِ فَطَمَسْنَآ أَعْيُنَهُمْ فَذُوقُوا۟ عَذَابِى وَنُذُرِ ﴿٣٧﴾ وَلَقَدْ صَبَّحَهُم بُكْرَةً عَذَابٌ مُّسْتَقِرٌّ ﴿٣٨﴾ ﴾ القمر (٣٧-٣٨) واته : ﴿ئەو خەڵکە بەدڕەوشتە چاویان بڕیبووە میوانەکانی و (دەیان ویست دەست درێژییان بکەنەسەر) ئێمەش چاومان کوێر کردن، بینایمان لێ سەندنەوە، دەبچێژن سزاو سەرەنجامی هۆشیارکردنەوەی من. بێگومان سەرلەبەیانیەکی زوو سزای توند و بەئێش چوار دەوری گرتن و دایگرتن﴾.

وەئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیش وەسفی ئەو تیاچوونی ئەم نەتەوەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت : ﴿ فَأَخَذَتْهُمُ ٱلصَّيْحَةُ مُشْرِقِينَ ﴿٧٣﴾ فَجَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِمْ حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ ﴿٧٤﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَٰتٍ لِّلْمُتَوَسِّمِينَ ﴿٧٥﴾ وَإِنَّهَا لَبِسَبِيلٍ مُّقِيمٍ ﴿٧٦﴾ ﴾ الحجر (٧٣-٧٦) واته ﴿جاهەرلە بەرەبەیاندا دەنگە سامناکەکە و بوومەلەرزەیەك یەخەی پێ گرتن. ئینجا شارەکەمان ژێرە و ژوور کردوو بەسەنگڵ بەرد بارانمان کردن. بێگومان ئاڵەو بەسەرهاتەدا بەڵگە و نیشانەی زۆر هەیە بۆ کەسانێك کەپەندو ئامۆژگاری وەرگرن. بێگومان ئەوشارە وێرانە دەکەوێتە سەرەرێیەکی بەردەوامی کاروان چیانەوە﴾. ﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ مُّسَوَّمَةً عِندَ رَبِّكَ وَمَا هِىَ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ بِبَعِيدٍ ﴿٨٣﴾ ﴾ هود (٨٢-٨٣) واته ﴿جاکاتێك فەرمانی ئێمە بۆ تیاچوونیان هات، شارۆچکەکەیانمان ژێرە و ژوورکردو بەقوڕی سوزەوە کراوی وەك بەرد، چین لەسەر چین بەرد بارانمان کرد. هەموو ئەو بەردانە دیاری کراوبوون،لەلایەن پەروەردگارتەوە (کەبدات بەسەر تەوقەسەری کێدا) ئەم کارەسات و ئەم بەربارانەش وەنەبێت زۆر

دوور بێت لەستەمکارانەوە﴾، ﴿ ثُمَّ دَمَّرْنَا ٱلْـَٔاخَرِينَ ﴿١٧٢﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ ﴿١٧٣﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَـَٔايَةً وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٧٤﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿١٧٥﴾ ﴾ الشعراء (١٧٢-١٧٥) واتە : ﴿لەوە و دوا ئەوانی ترمان ڕیشەکەن کرد. بەسەختیش بەرد بارانمان کردن، ئای کەخراپ و سەخت و دژوارە بارانی بێدار کراوەکان. بەڕاستی ئالەوەدا بەڵگە و نیشانەی (بەهێز هەیە لەسەر دەسەلاتی خوای پەروەردگار) کەچی زۆربەیان باوەڕدار نەبوون. بەڕاستی هەر پەروەردگاری تۆ (ئەی محمد (دروودی خوای لێ بێت)، ئەی ئیماندار) بالا دەستە (بەسەر بێ باوەڕاندا) بەسۆزو میهرە بانیشە (بە ئیمانداران)﴾. وەکاتێك گەلەکەی تیاچوون و لەناو بران جگە لەپێغەمبەر (لوط) (سەلامی خوای لێ بێت) و ئەوکەسانەی کەبڕوادار بوون لەگەڵیدا هیچ کەسێك ڕزگاری نەبوو. وەئەو کەسانەشی کەلەگەڵ حەزرەتی لوط دا (سەلامی خوای لێ بێت) ڕزگاریان بوو لەژمارەی یەك خێزان تێپەڕی نەدەکرد. تەنانەت هاوسەرەکەی خۆشی تیانەبوو بڕوای پێ نەهێنا بوو، لەبەرئەوە خوای گەورە ئەویشی لەگەڵ بێ بڕوایاندا لەناوبرد. خوای گەورە لەزاری حەزرەتی لوط وە (سەلامی خوای لێ بێت) لەقورئاندا دەفەرموێت : ﴿ وَلُوطًا إِذْ قَالَ لِقَوْمِهِۦٓ أَتَأْتُونَ ٱلْفَـٰحِشَةَ مَا سَبَقَكُم بِهَا مِنْ أَحَدٍ مِّنَ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٨٠﴾ إِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ ٱلرِّجَالَ شَهْوَةً مِّن دُونِ ٱلنِّسَآءِ ۚ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ مُّسْرِفُونَ ﴿٨١﴾ وَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِۦٓ إِلَّآ أَن قَالُوٓا۟ أَخْرِجُوهُم مِّن قَرْيَتِكُمْ ۖ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ ﴿٨٢﴾ فَأَنجَيْنَـٰهُ وَأَهْلَهُۥٓ إِلَّا ٱمْرَأَتَهُۥ كَانَتْ مِنَ ٱلْغَـٰبِرِينَ ﴿٨٣﴾ وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا ۖ فَٱنظُرْ كَيْفَ كَانَ عَـٰقِبَةُ ٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٨٤﴾ ﴾ الأعراف (٨٠-٨٤) واتە: ﴿یادی (لوط پێغەمبەر) یش بکە کاتێك بەقەومەکەی وت : چۆن ئێوە گوناهو تاوانێکی

وادەکەن کەتا ئێستا هیچ کەس پێش ئێوە لەجیهاندا گوناهو تاوانی وای نەکردووە ؟! چونکە بەڕاستی ئێوە ئارەزووی خۆتان لەگەڵ پیاواندا ئەنجام دەدەن لەباتی ژنانی هاوسەرتان، نەخێر ئێوە قەومێکی تا پوخت وم سنور بەزێن و زیادە ڕەون. وەڵامی قەومە نالەبارەکەی تەنها ئەوە بوو کەوتیان : ئەوانە شار بەدەرکەن چونکە ئەوانە کەسانێکن خۆیان پاك ڕادەگرن !! ئێمەش لوط و خانەوادەکەیمان ڕزگارکرد، جگە لەهاوسەرەکەی چونکە ئەویش لەو کەسانەبوو کە تیاچوون (لەبەر ئەوەی باوەڕی بە لوط پێغەمبەر نە بوو). ئەوسا (بەردمـان) بەسەردا باراندن، جاتەماشا بکە و سەرنج بدەو پەند وەرگرەو بزانە، سەرەنجامی تاوانباران و بێ ڕەوشتان چۆن بوو﴾ .

بەم شێوەیە حەزرەتی لوط (سەلامی خوای لێ بێت) ڕزگاری بوو لەگەڵ ئەوکەسانەی کە بڕوادار بوون لەگەڵیدا و هاوڕێ لەگەڵ خانەوادە کەشیدا ئەمە جگە لەهاوسەرەکەی کەلەگەڵ بێ بڕواکاندا تیاچوو. وەهەروەها لەتەوراتیشدا هاتووە کەدەڵێ : حەزرەتی لوط لەگەڵ حەزرەتی ئیبراهیم دا (سەلامی خوای گەورە لەهەردووکیان بێت) کۆچیان کرد دوای ئەوەی کەگەلە گومڕاکە لەناو بران وشوێنەواری ماڵەکانیشیان لەسەر زەویدا سڕایەوە.

## ئایەتە ڕۆشنەکان لە دەریاچەی لوط دا

ئایەتی ٨٢ ی سورەتی هود چۆنیەتی ئەو سزاسەختەی کەدرابەسەر گەلەکەی حەزرەتی **لوط** دا (سەلامی خوای لێ بێت) ڕۆشن دەکاتەوە : ﴿ فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ﴿٨٢﴾ ﴾ هود (٨٢ ) واتە : ﴿جاکاتێك فەرمانی ئێمە بۆ تیاچونیان هات، شارۆچکەکەیانمان ژێرە و ژور کردو بەقوڕی سورەکراوی وەك بەرد، چین لەسەر چین بەرد بارانمان کرد﴾. لەئایەتەکەدا ڕستەی (جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا ) ئاماژە دەکات بۆ ئەوەی کە ئەو شوێنە توشی زەمین لەرزەیەکی بەهێز هاتووە، وە لێرەدا دەبینین کە دەریاچەی **لوط** ئەو شوێنەیە کە سزا سەختەکەی تێدا ڕوویدا، وە چەند بەڵگەیەکی سەلێنراوی ڕۆشن لەسەر کارە ساتێکی لەم جۆرە هەڵدەگرێت.

زانای شوێنەوارناسی ئەڵمانی (فیرنر کیلر) دەڵێ : ژێر ئاو کەوتنی دۆڵی سەدیم کە پێکهاتەی (سەدوم غومورا) یە لەگەڵ ئەولەتبونە گەورەیە کەبەتەواوی ئەوناوچەیەدا دەڕوات لەتاکە ڕۆژێکدا چووە بەناخی زەویدا، ئەم کاولکاریە بەهۆی کاریگەری زەمین لەرزەیەکی سەختەوە بووە بە هاوڕای هەندێ تەقینەوە، وەچەند تیشکدانەوەیەك کە گازێکی سروشتی به هۆیەوە پەیدا بوو لەگەڵ ئاگر کەوتنەوەیەك کە ئەو ناوچەی گرتەوە[1]. لەڕاستیدا شوێنەواری دەریای مردوو یا دەریاچەی لوط بەناوچەیەکی زەمین لەرزەیەی چالاك دادەنرێت، واتە : ناوچەیەکی هەردەم لەرزە، کە دەکەوێتە سەر درزێکی ڕەگ و ڕیشاوی لەرزاوە، وەئەم دۆڵەش بەدرێژایی (٣٠٠) کم لەباکوری دەریاچەی تەبەریەوە درێژ دەبێتەوە بۆ ناوەڕاستی

[1] فیرنر کیللر ، الأنجیل کتأریخ ، إثبات کتاب الکتب ، نیویورك : ویلیام مورو ، ١٩٦٤ الصفحات ٥٧ _ ٧٦

دۆڵی (عربة) لەباشوردا [1]. وەبەشی کۆتایی ئایەتەکەش کەدەفەرموێت (وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ عَلَيْهَا ڕەنگە مەبەستی بەرپا بوونی تەقینەوەیەکی بورکانی بێت لەسەر تەپۆلکەکانی دەریاچەی لوط دا، لەبەرئەمە ئەو بەردانەی کە تەقینەوە (مِّن سِجِّيلٍ ) لە سەنگە گڵی وەك بەرد دەچوون، بەهەمان شێواز لەئایەتی (١٧٣) سورەتی (الشعراء) دا هەمان وێنەمان پێ پیشان دەدات و دەیفاتە ڕوو کەدەفەرموێت : (وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهِم مَّطَرًا فَسَآءَ مَطَرُ ٱلْمُنذَرِينَ لَهُمْ واتە : ﴿بەسەختیش بەردبارانمان کردن، ئای کەخراپ و سەخت و دژوارە بارانی بێ دارِ کراوەکان﴾. لەم بارەیەوە (فیەنر کیلر) دەڵێت : ئەو هێزە بورکانیانەی کەبەدرێژایی ئەو چالانە لەقولاییەکاندا خەفە بوو بوون هاتنە دەرەوە و تەقینەوە، وەبەردەوام دەمی بورکانەکان بوو بوویە دیاردەیەکی ئاشکرا کەلەدۆڵی سەرەوەی تەپۆلکەکانی خۆرئاوادا بێدەنگ و کپن. بەلام لەکاتێکدا ئەم بورکانە ئاگرینە سوتاوە دەنیشێت لەسەر ڕووبەرێکی فراواندا چەند چینێکی قوڵ لە بەردی بازلتی ڕەش دادەنێت، وەئەم بەردە سوتاوانە لەگەڵ چینەکانی بەردی ڕەشی (بازلت) دا ئەوە پیشان دەدەن کەئەم ناوچەیە لەسەردەمێك لەسەردەمەکاندا توشهاتی زەمین لەرزەیەکی توند و بەهێز بووەتەوە [2]. وەئەم شوێنەوارانەی کەوەك چینێکی بەردینی لێهاتووە ئەوە پیشان دەدەن کە لەم ناوچەیەدا زەمین لەرزەیەکی توندو بورکانێکی بەهێز لەسەردەمێك لەسەردەمەکاندا ڕوویداوە، وەڕەنگە ئەم ئایەتەی کە دەفەرموێت : (وَأَمْطَرْنَا عَلَيْهَا حِجَارَةً مِّن سِجِّيلٍ مَّنضُودٍ ) مەبەستی لەمە بێت، چونکە قورئانی پیرۆز لەزۆر بەی ئەگەرەکاندا ئاماژە بەم تەقینەوە بورکانیە دەدات، خواش

---

[1] عالم الأنجيل ، علم الآثار والتاريخ تموز _ آب ١٩٩٣.
[2] فيرنر كيلر ، الأنجيل كتأريخ ، إثبات كتاب الكتب ، نيويورك : ويليام مورو ، ١٩٦٤ صفحة ٧٦

زانا ترە، خوای گەورە دەفەرموێت : (فَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا جَعَلْنَا عَٰلِيَهَا سَافِلَهَا عَلَيْهَا ئاماژەیە بۆپەرپابوونی ئەو زەمین لەرزەیەی کە بورکانەکەی وورووژاند، تاوەکو لەسەر زەویدا بتەقێتەوە، وەچەند شوێنەوارێکی کارلکاری و کەرت بوو خۆڵە مێش بەدوای خۆیدا جێ بهێلێت، خواش زانا ترە.




ناوچەی گەلی (لوط) کە بەمانگی دەستکرد وێنەکەی گیراوە

بەلگە سەلێنراوەکان و تایەتە ڕوون و ئاشکراکان کەلەدەریاچەی (لوط) دەردەکەون ووردژێنەری ئامانجەکانن، بەشێوەیەکی گشتی ئەو ڕوو داوانەی کە قورئانی پیرۆز باسیان دەکات دەکەونە ڕۆژ هەلاتی ناوەڕاستەوە، دوورگەی عەرەبی و میسر لەناوەڕاستی ئەم شوێنانەدان بەتەواوەتی. وەهەروەها دەریاچەی لوط یش بەتەواوەتی دەکەوێتە ناوەڕاستی ئەم ناوچانەوە، وەهەروەها دەریاچەی لوط و ناوچەکانی دەوروو بەریشی بوونەتەمایەی گرنگی پێدانی زەوی ناسەکان، چونکە ئەم دەریاچەیەش (٤٠٠) مەتر لەئاست دەریای سپی ناوەڕاستەوە نزم دەبێتەوە وەبەوەی کە نزم ترین خالی ئەم دەریاچەیە هەتا (٤٠٠) مەتر قوڵ دەبێتەوە بەڕووی دەریاکەوە، کەواتە ناخی دەریاچەکە قولاییەکەی (٨٠٠) مەتر نزم دەبێتەوە لەسەر ڕووی دەریاوە،

کەئەمەش نزم ترین خاڵی سەر ڕووی زەویە، چونکە ئەو ناوچانەی لەسەر ڕووی دەریاکەوەن قوڵاییەکەیان ناگاتە (١٠٠) مەتر زیاتر، تایبەتمەندیەکی تری ئەم دەریاچەیە جیا لەدەریاچەکانی تر بریتیە لە چڕی ڕێژەی خوێ تیایدا، کەدەگاتە ڕێژەی (٣٠٪) وەبەم ڕێژەیەش هیچ جۆرە زیندەوەرێکی دەریایی وەك ماسی و قەوزە و زیندەوەرەکانی دیکە ناتوانن ژیانی تێدا بەرنەسەر، وەلەبەر ئەم هۆیەشە ناوی ئەم دەریایە بەدەریای مردوو ناودەبرێت کەلەئەدەبی ڕۆژ هەڵاتیشدا پێی دەوترێت : (Dead Sea).

بەم پێیە : چیرۆکی گەلەکەی لوط (سەلامی خوای لێ بێت) کەلەقورئانی پیرۆزدا باس کراوە مێژووەکەی دەگەڕێتەوە بۆ (١٨٠٠) ساڵ پێش زایین، کیلر لەو ماوەیەدا کە لێکۆڵینەوە و بەدوادا چوونی بۆ شوێنەوارەکان کردووە ئەوەی بۆ دەر کەوتووە کە هەردوو شاری (سدوم وغومورا) لە دۆڵی (سديم) دا بوون، کەلەبەشی خوارەوەی دەریاچەی لوط ، وەیە لە دەریاچەی لوط یش نزم ترە. وەلەڕاستیدا ئەم ناوچەیە یەکێك بووە لەوناوچانەی کە زۆرترین دانیشتوانی هەبووە لەسەر زەویدا، زۆرترین تایبەت مەندیە سروشتی یەکانی ئەم ناوچەیەش ئەو بەڵگانەن کە ڕووداوە کاولکاریەکانمان پیشان دەدەن کە قوورئانی پیرۆز بۆمانی گێڕاوەتەوە. وەبەشێکی ئەم ناوچەیەش کەلەشێوەی زماندایە نیوە دوورگەی ڕۆژهەڵاتی دەریاچەی لوط پێکدێنێت. کەبەرەو ناوەوەی دەریاچەکە درێژ دەبێتەوە، وەئەم بەشەش لای عەرەبەکان بەناوی (اللسان) ناوزەد کراوە چونکە لە شێوەی زماندایە، وەناخی دەریاچەکەش لەژێرئاودا دەکات بە دووبەشەوە.





وێنەی دەریاچەی لوط لەڕێگەی مانگی دەستکردەوە



**دەریاچەی لوط، یان دەریای مردوو**

ئەوەش بەسەر وشکاییەوە لەبەر چاوان دیار نیە و نابینرێت، لەگەڵ ئەوەدا کەناخەکەی لەلای ڕاستی نیوە دوور گەکەوە بە قولایی (٤٠٠) م ڕۆ دەچێت، بەڵام کەلەلای چەپی تائەندازەیەکی سەرنج ڕاکێش تەنکاوە، وەئەو تاقیکردنەوەیەی پێش چەند ساڵێك کرا دەری خستووە کە قولایی ئاو لێرەدا زیاترلە (١٥-١٦) مەتر دەبێت، ئەم ناوچە تەنکاوە لەم دواییانەدا دروست بووە و پێکهاتووە لەئەنجامی ئەو زەمین لەرزانەدا، وەئەوەی کەبەدوایاندا هات لەکەڵەکە بوونی دارمانە گەورەکان کەلەدوای ئەوانەوە بەرپا بوو، وەئەم ناوچەیە بریتیە لەناوچەی (سدوم و غامورا) کە گەلی **لوط** تیایدا ژیاون، ورنر کیلر ئەم بەشەتەنکاوەی تێبینی کرد، کە لەم دواییەوە دۆزراوەتەوە و دروست بووە، کەلەئەنجامی زەمین لەرزەکە و دارمانە گەورەکە کەزەمین لەرزەکە هێنایە کایەوە پەیدا بووە، ئەم ناوچەیە ئەوشوێنەیەکە (سدوم و غومورا) ی تێدا دەژیا واتە نیشتیمانی گەلی **لوط**. لەسەردەمە کۆنەکاندا دەکرا بەپیادە ڕەوی بەرەو گردەکانی بەرامبەر بە پیادە ڕەوی بڕۆیت بەڵام ئێستا بەشی خوارەوەی دەریای مردوو شارەکانی (سدوم و غومورا) ی

داپۆشیوە، کەدەکەونە دۆڵی (سدیم) ە وە، وەبەهۆی داڕمانی بنکەکەوە کەبەهۆی کارساتی سروشتی ترسناکەوە لەهەزارەی دووەمی پێش زایندا ڕوویدا، ئاوی سوێر لەباکورەوە بەرەو ئەم بۆ شاییە هاتووە هاوکات ئەو وشکاییەی کە ڕوویدا هاوڕای بوو، وەئەم بەشەی بەتەواوەتی گرتەوە [1].



وێنەی لای چەپ ئەوە دەر دەخات شۆڕشێکی گڕکانی بەدوایدا هاتوە، هۆکەشی ئەوەبوو کە پشتیان لەراستی کردبوو.
لەلاپەڕەی دواتردا، دیمەنێکی دووری دەریاچەی (لوط)ە

[1] المرجع السابق الصفحات ٧٣ ــ ٧٤



وێنەیەك لەبەرزاییەوە، ئەوە دەردەخات کەلەچواردەوری دەریاچەی (لوط)دا چەند شاخێك هەبوە.

ڕەنگە شوێنەوارەکانی گەلی لوط زۆر ڕۆشن و دیاربن... لەکاتێکدا بتەوێت بەبەلەمێك بەناو دەریاچەی لوط دا گوزەر بکەی هەتا دوایین خاڵی باکووری، وەکاتێکیش تیشکی خۆر دەدات بەلای ڕاستی ئەو دەریاچەیەدا ئەوسادیمەنێکی سەرنج ڕاکێش دەبینیت، لەدووری کەنار ڕووبارە کەوە و لەژێر ئاوی ڕوونی دەریاکەشەوە بەشێوازێکی زۆر ڕۆشن سنوری دارستانەکان دەردەکەون کە سوێری دەریای مردوو پاراستوونی : لق و پۆپی زۆر کۆن و ڕەگ و ڕیشە تێکدراوەکانیش کەلەکۆنەوە لەژێر ئاوە سەوزە درەوشاوەکەدا هەن. دۆڵی سدیم جوانترین ناوچەی ئەو شوێنەوارە بوون لەوسەردەمەدا، ڕۆژگارێك بووە کەئەم لق و پۆپی درەختانە سەوزو پێگەیشتوو بوون وە کۆڕیکەی گوڵ و گوڵزارەکانیش کرابونەوە... لێکۆڵینەوە زەوی ناسەکان لەبواری دینا میکی دا بۆ کارەساتی گەلەکەی لوط دەڵێت : ئەو زەمین لەرزەی کە ئەو گەلەی لەناوبرد لەئەنجامی شەق بونێکی درێژی زەویدا هات (هێڵی

شەق بوون) کەڵەدووری (١٩٠) کم بوو بۆ ئەوەی حەوزی ڕووباری (شەریعە) پێك بهێنێت، ڕۆچوونی ڕووباری شەریعەش بەرەو خوار نزیکەی (١٨٠) کم دەبێت، لەپاڵ نزم بونەوەی دەریای مردوو بەئەندازەی (٤٠٠) م لەڕووی زەویەوە بەوەی کە ڕووداوێکی جیۆ لۆجی بایەخدار ڕەوگەی خۆی بینی لە یەکێك لەکاتەکاندا.

پێکهاتەی وروژێنەر بۆ ڕووباری شەریعە و دەریاچەی لوط تەنها بەشێکی کەم پێکدەهێنێت لەکەرت بوون دا کەبەم ناوچەیەدا تێ پەڕ دەبێت، وەلەڕاستیدا شوێن و درێژی ئەم درزو کەرت بونانە تەنها لەم کاتەی ئێستاماندا ئاشکرا کراوەو دۆزراوەتەوە. ئەم درزانەش لەناوچە شاخاریەکانی تۆرۆسەوە دەست پێ دەکات بەرەوباشور هەتا دەریاچەی لوط، وەدرێژیەکەی بەردەوام دەبێت بەسەر بیابانی عەرەبیدا هەتاکو دەگاتە دوورگەی عەقەبە، وەبەردەوام دەڕوات بەناو دەریای سووردا هەتا لەئەفریقا تەواو دەبێت، وەلەسەر درێژبونەوەی ئەم درزە چەند کاردانەوەیەکی بورکانی ڕوویان داوە، کە دەکرێ تێبینی ئەوبەردە (بازلتیە) بورکانیە ڕەشانە بکرێت کە لەشاخی جەلیل لە فەلەستین وئەوناوچە پان و بەرینانەو و بەرزاییەکانی وڵاتی ئەردەن و دوورگەی عەقەبە و ناوچەکانی دەوروو بەریانداهەن.



پاشماوەی شارەکە کەترازاوە بۆ دەریاچەی لوگ، وەلەکەنارەکانی دەریاچەکەدا دۆزراوەتەوە ئەم پاشماوانە بەلگەن لەسەر ئەوەی کە ئەم گەلە لەئاستێکی بژێوی بەرزدا بوون





**چیرۆکی کاولکاری گەلی لوط لای زۆرێك لەوێنەکێشان بوەتە خەیاڵ، وەك لەوێنەکەی سەرەوەدا دەردەکەوێت**

لەم شوێنەوارو زانیارییە زەوی ناسانە تێکرا بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە دەریاچەی لوط توشهاتی کارەساتی جیۆلۆجی ترسناك بووەتەوە. ورنر کیلر نوسیویەتی : ژێر ئاو کەوتنی دۆڵی سەدیم کە پێکهاتەی (سەدوم غومورا) یە ئەوناوچەیە دەگرێتەوە کەبەم ناوچەیەدا دەڕوات وە لەکاتێکدا ڕێژێکدا چووەبە ناخی زەویدا. ئەم کاولکاریەش بەهۆی کاریگەری زەمین لەرزەیەکی سەختەوە بووە بەهاوڕای هەندێ تەقینەوە، وەچەند تیشکدانەوەیەك کەگازێکی سروشتی بەهۆیەوە پەیدا بوو لەگەڵ ئاگر کەوتنەوەیەك کە ئەو ناوچەی گرتەوە، وەئەو هێزە بورکانیانەی کەبە درێژایی ئەو چالانە لەقولاییە کاندا خەفە بۆو بوون هاتنە دەرەوە و تەقینەوە، وەبەردەوام دەمی بورکانەکپ بوەکان لەبەرچاودابوون کەدەکەونە دۆڵی سەرەوەی ئەردەن و نزیك (باشان)، بەڵام لەکاتێکدا ئەم بورکانە ئاگرینە سوتاوە دەنیشێت لەسەر ڕووبەرێکی فراوان چەند چینێکی قوڵ لەبەردی بازلتی ڕەش دادەنێت لەسەر ڕووی کلسەکەوە، وەئەم بەردە سوتاوانە لەگەڵ چینەکانی بەردی بازلت کە دا ئەوە پیشان دەدەن کەئەم ناوچەیە لەسەردەمێك لەسەردەمەکاندا توشهاتی زەمین لەرزەیەکی

توندو بەهێز بووەتەوە [1]



ئەم وێنەیە ژیانی بەرەو پێشچوون و خۆشگوزەرانی شاری بۆمبای پیشان ئەدات پێش وێران بوونی

[1] المرجع السابق الصفحات ٧٥ ـ ٧٦



یەكێك لەو لاشە بەبەردبوانەی
كەلەئەنجامی پشكنیندا
لەبۆمبایدا دەركەوتوون



**نمونەیەکی تر لەلاشەی بەبرەدبوەکان کەلەکاتی پشکنیندا لەبۆمبایدا دەرکەوتن**



**نمونەیەکی تری لاشەی مرۆڤە بەبەردبوەکان کە لەبۆمبایدا دەرکەوتن. وێنەی لای چەپ نمونەیەکی زیندوە باس لەو تیاچونە دەکات کە دووچاری دانیشتوانی ئەم شارە هاتوە**

بەڵام گۆڤاری (ناشیونال جوگرافی National Geographic)لەکانونی یەکەمی ساڵی (١٩٥٧) دا ئەم زانیاریانەی بڵاوکردەوە لوتکەی شاخێك بەئاراستەی دەریای مردوودا بەرز دەبێتەوە و تائێستاش هیچ کەسێك شارە وێران بووەکانی (سدوم و غومورا) ی نەدۆزیوەتەوە، ئەمەلەکاتێکدا کەلێکۆڵەران وادەبینن کەئەم دووشارە لەدۆڵی (سدیم) دایە و لەبەرامبەر ناوچەیەکی پەردینەوەیە، ڕەنگە دوابەدوای ئەو زەمین لەرزە وێرانکاریە ئاوی دەریای مردوو ئەم دووشارەی داپۆشیبێت[1].

## شاری بۆمبای توشهاتی هەمان چارەنوس هاتوون

خوای پەروەردگار لەم ئایەتانەی خوارەوەدا ئاگادارمان دەکاتەوە کەرێساو یاساکانی خوا ناگۆڕێت وەك دەفەرموێت : وَأَقْسَمُوا بِاللَّهِ جَهْدَ أَيْمَانِهِمْ لَئِن جَاءَهُمْ نَذِيرٌ لَّيَكُونُنَّ أَهْدَىٰ مِنْ إِحْدَى الْأُمَمِ ۖ فَلَمَّا جَاءَهُمْ نَذِيرٌ مَّا زَادَهُمْ إِلَّا نُفُورًا ﴿٤٢﴾ اسْتِكْبَارًا فِي الْأَرْضِ وَمَكْرَ السَّيِّئِ ۚ وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ ۚ فَهَلْ يَنظُرُونَ إِلَّا سُنَّتَ الْأَوَّلِينَ ۚ فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَبْدِيلًا ۖ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ اللَّهِ تَحْوِيلًا ﴿٤٣﴾ **(فاطر ٤٢-٤٣)** واتە :

ئەوکافرو هاوەڵگەرانەی قورەیش زۆر بەگەرمی بەخوا سوێندیان دەخوارد و دەیان وت : ئەگەر پێغەمبەرێکی بێدار کەرەوە بۆیان بێت، بێگومان لە هەموو گەلانی ترباوەڕدارتردەبن، کەچی کاتێ کەپێغەمبەرێکیان بۆهات لەسەرکەشی ودوورەپەرێزی زیاترهیچی تریان لێ نەوەشایەوە...چونکە خۆیان بەزل وگەورە

[1] ایرنست رایت، احیاء العهدالقدیم ، المجلة الجغرافیة الوطنیة مجلد١١٢كانون الاول١٩٥٧صفحة٨٣٣

دەزانی لەزەویدا و پیلانی شەڕو تاوانیان کێشا، بەمەرجێك پیلانی شەڕوو تاوان تەنها بەسەر ئەوانەدا دەشکێتەوە کەنەخشەی بۆ دەکێشن، مەگەر ئەمانە بە دژایەتی ئیسلام تەنها چاوەڕێی ئەو کارەساتانە بکەن کەبەسەر گەلانی پێش ئەماندا هاتووە، ئیتر تۆ نابینیت هەرگیز لەیاساو بەرنامەکانی خوادا گۆڕانکاری پێش بێت، هەرگیز نابینیت یاساو بەرنامەکانی خوا لەنەخشەی خۆیان لابدەن﴾. بەڵێ (فَلَن تَجِدَ لِسُنَّتِ ٱللَّهِ تَبۡدِيلاً فَمَن، جاهەرکەس نەیاری یاساکانی پەروەردگار بێت و یاخی بوون و سەرپێچی خۆی لەبەرامبەر خوای گەورەدا ئاشکرا بکات هەمان یاسای ئاسمانی بەسەردا جێ بەجێ دەبێت. بۆمبای (PomPei) ئەوشارەی کە نیشانەوهێمای هەڵوەشاندنەوەی ئیمپرا تۆریەتی ڕۆمانی بوو، هەمان پیشە و کرداری گەلەکەی لوط یان ئەنجام دەدا... لەبەر ئەوە کۆتایەکەشی هاوشێوەی کۆتایی گەلەکەی لوط بوو (سەلامی خوای لێ بێت). بورکانی فیزوف کەبەناوی ئیتالیاوەیە وبەتایبەتی نابولی ئەم بورکانە بۆماوەی دووهەزار ساڵ هێوربوبوەوە، وە بەناوی(جبل النذير) دەناونراوە واتە: شاخی هەڕەشە یان ووریاکەرەوە وەئەم ناوەش هەرواناونەبراوە لەڕاستیدا ئەوکارەساتەی کەبەسەر (سدوم وغومورا) دا هات و وێرانی کرد زۆر هاو شێوەی ئەم کارەساتەیە کە بۆمبای وێران کرد.

شاری نابولی دەکەوێتەلای ڕاستی فیزوف، وەشاری بۆمبایش دەکەوێتە لای ڕۆژهەڵاتیەوە بەرلە دووهەزارساڵ بورکانێکی گەورەو بەهێز دانیشتوانی ئەم شارەی گرتەوە بەلێ و بەردەئاگرینەکانیەوە، وەئەم کارەساتەش زۆر کت و پڕبوو بەشێوازێك گرفتاری بوون کەخەڵکی لەناوەڕاستی ڕۆژدا خەریکی سەرقاڵی کاری ڕۆژانەیان بوون... وەئەم شارەش ماوەی دوو هەزار ساڵە بەوحاڵەتە ماوەتەوە هەتاوەکو ئەمڕۆش، وەك بڵێیت کات و ماوە لەوشارەدا وەستاوە. هەرواو بەبێ هۆ شاری بۆمبای لەسەر زەویدا نەسڕایەوە و وێران نەبوو، بێگومان دەبێت ئەم لەناوچوون و

سڕینەوەیەچەند پەندو ئامۆژگاریەکی تێدا بێت، تۆمارە مێژوو ییەکان ئاماژە بەوە دەکەن کەئەم شارە مەڵبەندی جۆرەها ئارەزوو بازی ناوازە بوون، وەئەم شارەش بە یاخی بوون بەناوبانگ بوو بەشێوازێك کەنەدەتوانرا ئەو ماڵانە بژمێررێت کە داوێن پیسی و بەدڕەوشتیان تێدا ئەنجام دەدرا، تەنانەت پەنا بەخوا ئەندامەکانی نێرینە بەسەر دەرگاکاندا هەڵدەواسران، وەبەپێی ئەم نەریت و دەستورە ڕەگ و ڕیشەکەی بۆ ئاینی **میثریە** دەگەڕێتەوە (کەمەبەست پێی **میثرای** خوای فارسەکانە). وەئەندامەکانی سێکسی و تەنانەت کردارە سێکسیە کانیش پێویست بوو لەسەر گەورەکانیان بەئەنجامیان بگەیەنێت..وەلەڕاستیشدا ئەو بورکانە ئاگرینە فیزوفانەی کەدووچاریان هات شارەکەی بەتەواوەتی لەسەرزەویدا سڕیەوە و لەناوی برد، لەوەش سەیرتر لەم بابەتەدا ئەوەیە کەهیچ کەس دەربازی نەبوولەوکارەساتە لەپاڵ ئەوەدا تەقینەوەیەکی گەورە بەرپابوو کە بورکانی فیزوف هێنایەکایەوە، واش دەردەکەوێت کەئەوان چاوەڕێی کارەساتی بەو شێوەیە نەبوون،بەڵکو کارەساتە کتوپڕەکە وڕی کردن، وەلەوساتەدا خێزانێك کەلەکاتی نان خواردندا بوون هەرهەموویان بوون بەبەرد، وەهەروەها ژمارەیەکی گەورەی هاوسەرانیش لەکاتی هاوسەریاندا بوون بەبەرد... هەروەك بوونی چەند هاوسەرێکی لاوی کوڕ و کچی تازە پێگەیشتوش دەبینی !! هەندێ لەوڕواڵەتانەی کەلەژێر زەویدا دەرهێنراون هیچیان لێ نەهاتووە و بەتەواوەتی ماونەتەوە، بەڵام ئەو دەربڕینانەی کەلەسەر ڕواڵەتەکاندا دەردەکەوت و بەرچاو دەکەوتن، لەڕاستیداتەنها سەرسامکردنی ڕووت بوو. ئەمەئەو لایەنە سەرنج ڕاکێشەیە لە کارەساتەکەدا ! چۆن من چاوەڕێی ئەوەدەکەم کە بەهەزاران خەڵك توشهاتی مەرگی کتوپڕبن بێ ئەوەی شتێك ببیستن یاخود ببینن ؟ لەڕاستیدا ڕاڤەی ئەمە نەمان وسڕینەوەی شاری بۆمبای بوو کە هاوشێوەی ئەو کاولکاریانەیە کەلە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە، چونکە قورئانی پیرۆز باسی ((لەناوچوونی یاخی بووەکان)) ی لەڕیوایەتی شێوازی ئەم ڕووداوانەدا کردووە، ئەوەتا لە سورەتی

(یس) دا ئایەتەکان دەربارەی خەڵکی ئەوشارە واباس دەکەن کە تێکڕاهەموویان لەیەك چرکەدا مردوون : ﴿ إِن كَانَتْ إِلَّا صَيْحَةً وَاحِدَةً فَإِذَا هُمْ خَامِدُونَ ﴿٢٩﴾ ﴾ یس (۲۹) واتە ﴿بەڵکوتەنهایەك دەنگی گەورەوشریخەیەکی بەهێزنەبێت هیچی ترنەبوو،جائەوان دەسبەجێ مردن وخامۆش بوون﴾ وەلەئایەتی (۳۱) سورەتی (القمر) یشدا جارێکی تر ئەوە دەبینین کەباس لەتیاچوونی (قەومی هود) دەکات کەلە(چاوتروکانێکدا تیاچوون) وەك دەفەرموێت : ﴿ إِنَّا أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ صَيْحَةً وَاحِدَةً فَكَانُوا كَهَشِيمِ الْمُحْتَظِرِ ﴿٣١﴾ ﴾ القمر (۳۱) واتە : ﴿ئەوسائێمەش بەیەك دەنگی بەهێزی سامناك(دڵی هەموویانمان پچڕاند) و وەك گژوگیای وشك (کەکۆدەکرێتەوەو ژێرپێ دەکەوێت) لەناومان برد﴾. وەبەتەواوەتی مردن باڵی کێشا بەسەردانیشتوانی بۆمبایدا وەك لەئایەتەکانی پێشوودا هاتووە.

سەرەڕای ئەم هەمووشتەش کەلەشاری بۆمبایدا ڕوویدا هیچ گۆڕانێك بەسەرناوچەی بۆمبای ئەمڕۆدا ڕووی نەداوە، وەناوچە خراپ و تاوانکاریەکانی نابولیش هیچی کەمتر نیە لەخراپە کاریەکانی بۆمبای، وەدووڕگەی کابریش ئەو بنکەیەیە کەبەدڕەوشتە ناوازەکان تیایدا نیشتەجێ دەبن لەگەڵ ڕووت و بێ ئابڕووەکاندا،لەڕاگەیاندنە بازرگانیەکاندا کابری وەك (بەهەشتی ناوازەکان) پیشان دەدرێت، وەکابری ئیتالیاش تەنها شوێنێك نیە لەجیهاندا، چونکە هەڵوەشاندنەوەی ڕەوشتی زۆر بەپەلە تەشەنە دەکات، وەخەڵکانیش بەردەوامن لەسەر گوێ نەدان بەئەزمونی ترسناکی پێشینانیان. وەکۆتایی هاتنیان بەبەڵاوکارەساتی ئەستەم ونابەجێ وجەرگ بڕووسوتێنەرەوە.

## بەشی چوارەم گەلی عاد و ئوبار ((دوورگەی لماوی))

﴿ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى الْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ فَهَلْ تَرَىٰ لَهُم مِّنۢ بَاقِيَةٍ ﴿٨﴾ ﴾ **الحاقة** (٦-٨) واتە : **﴿گەلی عادیش بەڕەشەبایەکی ساردی بەهێزی وێرانکەرلەناوبران. حەوت شەوو هەشت ڕۆژهەڵی کردە سەریان، بەردەوام وبەهێزدەتبینی (ئەگەر لەوێ بویتایە) ئەوخەڵکە هەموو لاڵ وپاڵ لێی دەکەوتن هەروەك قەدی دارخورمای لەریشە هەڵکەنراو، چۆن بەئاسانی دەکەوێت وشەق دەبات. جائایا دەبینیت کسیان مابێت وکسیان ڕزگاری بووبێت؟!﴾**. گەلی عادیش گەلێکن لەوگەل و نەتەوانەی تر کە خوای گەورە لەناوی بردن وەلەزۆرێك لەئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا باس کراون، لەدوای هۆزو نەتەوەکەی حەزرەتی نوح (سەلامی خوای لێ بێت) باسیان هاتووە، خوای پەروەردگار (هود) پێغەمبەری نارد بۆ سەر هۆزو نەتەوەکەی تاوەکو بانگ هێشتیان بکات بۆ بەندایەتی کردنی خوای تاقانەو گوێڕایەڵی کردنی، وەلەگەڵ خوای تاکو تەنهاشدا هاوەڵ و هاوبەشی بۆ بڕیارنەدەن، هۆزو نەتەوەکەشی نەیاریان کرد بەوپەڕی توانایانەوە دژایەتیان دەکرد و تۆمەتی ئەوەشیان دەخستەپاڵ کە درۆزنەو بێ ئەقڵە، دەیەوێت دینی باوپیانتان بگۆڕێت. قورئانی پیرۆز لەسورەتی (هود) بەدرێژی باسی ئەوەمان بۆ دەکات کەلەنێوان (هود) و گەلەکەیدا چی ڕوویداوە :.وَإِلَىٰ عَادٍ أَخَاهُمْ هُودًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥٓ ۖ إِنْ أَنتُمْ إِلَّا مُفْتَرُونَ ﴿٥٠﴾ يَٰقَوْمِ لَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ أَجْرًا ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَى الَّذِى فَطَرَنِىٓ ۚ

أَفَلَا تَعْقِلُونَ ﴿٥١﴾ وَيَٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ وَلَا تَتَوَلَّوْا۟ مُجْرِمِينَ ﴿٥٢﴾ قَالُوا۟ يَٰهُودُ مَا جِئْتَنَا بِبَيِّنَةٍ وَمَا نَحْنُ بِتَارِكِىٓ ءَالِهَتِنَا عَن قَوْلِكَ وَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿٥٣﴾ إِن نَّقُولُ إِلَّا ٱعْتَرَىٰكَ بَعْضُ ءَالِهَتِنَا بِسُوٓءٍ ۗ قَالَ إِنِّىٓ أُشْهِدُ ٱللَّهَ وَٱشْهَدُوٓا۟ أَنِّى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿٥٤﴾ مِن دُونِهِۦ ۖ فَكِيدُونِى جَمِيعًا ثُمَّ لَا تُنظِرُونِ ﴿٥٥﴾ إِنِّى تَوَكَّلْتُ عَلَى ٱللَّهِ رَبِّى وَرَبِّكُم ۚ مَّا مِن دَآبَّةٍ إِلَّا هُوَ ءَاخِذٌۢ بِنَاصِيَتِهَآ ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٦﴾ فَإِن تَوَلَّوْا۟ فَقَدْ أَبْلَغْتُكُم مَّآ أُرْسِلْتُ بِهِۦٓ إِلَيْكُمْ ۚ وَيَسْتَخْلِفُ رَبِّى قَوْمًا غَيْرَكُمْ وَلَا تَضُرُّونَهُۥ شَيْـًٔا ۚ إِنَّ رَبِّى عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ حَفِيظٌ ﴿٥٧﴾ وَلَمَّا جَآءَ أَمْرُنَا نَجَّيْنَا هُودًا وَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ مَعَهُۥ بِرَحْمَةٍ مِّنَّا وَنَجَّيْنَٰهُم مِّنْ عَذَابٍ غَلِيظٍ ﴿٥٨﴾ وَتِلْكَ عَادٌ ۖ جَحَدُوا۟ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ وَعَصَوْا۟ رُسُلَهُۥ وَٱتَّبَعُوٓا۟ أَمْرَ كُلِّ جَبَّارٍ عَنِيدٍ ﴿٥٩﴾ وَأُتْبِعُوا۟ فِى هَٰذِهِ ٱلدُّنْيَا لَعْنَةً وَيَوْمَ ٱلْقِيَٰمَةِ ۗ أَلَآ إِنَّ عَادًا كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّعَادٍ قَوْمِ هُودٍ ﴿٦٠﴾ **هود (٥٠-٦٠) واته : ﴿بۆلای هۆزی عادیش،**

**هودی برایانمان نارد وتی : ئەی خزمەکانم خوا بپەرستن و فەرمانبەرداری ئەو بن، هیچ خوایەکی ترتان نیە جگە لەو، ئێوە هیچ ڕاستیەکتان نیە جگە لە درۆ هەڵبەستن. هود وتی : ئەی خزمەکانم من لەسەر ئەم کارو بانگەوازە خواییەی کەبە ئێوەی ڕادەگەیێنم هیچ کرێ و پاداشتێکتان لێ داواناکەم، کرێ و پاداشتم تەنها**

لەسەر ئەو زاتەیە کەبەدی هێناوم، باشە ئەوە بیهناکەنەوە و ژیرنابن ؟! ئەی
هۆزمەکانم داوای لێ خۆش بوون لەپەروەدگارتان بکەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆلای
ئەو، ئەوەلە ئاسمانەوە بارانی زۆری پڕ بەرەکەتتان بۆ دەبارێنێت، هێزو دەسەڵاتتان
بۆ زیاد دەکات زیاد لەهێزو دەسەڵاتی ئاسایی خۆتان، ڕوو وەرمەگێڕن لەم باس و
ئامۆژگاریانە لەکاتێکدا کە هەمیشە تاوانبارن. وتیان ئەی هود: بەڵگەیەکی زۆر
ڕۆشنت بۆنەهێناوین تابەتەواوی ئێمە قەناعەت بکەین (کەتۆپێغەمبەری خوایت)
و ئێمەیش وازلەخواکانی خۆمان ناهێنین بەقسەی تۆ، ئێمە ئیمان وبڕوامان نیە
بەڕاستێتی تۆ. ئێمە هیچ نالێین ئەوە نەبێت: وادیارە هەندێ لەخواکانمان بەخراپ
دەستیان لێ وەشاندوویت !! هود وتی : دەی من بەڕاستی خوادەکەم بەشایەت
وئێوەش بەشایەت بن کەبێگومان من بەریم لەوەی ئێوە دەیکەنە شەریك و هاوەڵ
بۆخوا... جگە لەخوا خۆتان بە پە ڕستراوەکانتانەوە فێڵ وپیلانم لێ بکەن
هەرهەموتان، کەوابوو وەرن هەمووتان کۆببنەوەونەخشە بکێشن بۆلەناوبردنم،
پاشان مۆڵە تیشم مەدەن !...چونکە بەڕاستی من پشتم بەخوابەستووە،
کەپەروەردگاری من و پەروەردگاری ئێوەیشە، هیچ گیانلەبەرێك نیە جڵەوی بەدەست
خوای گەورەوە نەبێت، بێگومان پەروەردگارم لەسەربەرنامەو ڕێبازێکی ڕاست
ودروستە. جائەگەرئێوە گوێم بۆنەگرن ڕیشت بکەنە ئەم بەرنامەیە، ئەوەبێگومان
من پێم ڕاگەیاندن ئەوبەرنامەوپەیامە خواییەی بەمندانێردراوە بۆتان و
پەروەردگارم (ئەگەرملکەچ نەبن) ئێوەلەناودەبات وهۆزێکی تر دەخاتە شوێنی
ئێوە، ئێوەناتوانن هیچ زیانێك بەوبگەیەنن بەڕاستی پەروەردگاری من بەسەر
هەمووشتێکدا چاودێرو بەتوانایە. کاتێکیش فەرمانی ئێمە هات (کەبڕیاری
تیاچوونی هۆزی عاد بوو) و ئەوە هودو ئەوانەی بڕوایان هێنابوولەگەڵ ئەودابوون
ڕزگاریشمان کردن بەهۆی بە زەیی ولێبوردەیی خۆمانەوە لەسزایەکی زۆرتورس
وگران. بەڵێ! ئەوە هۆزی عادبوو، بێ باوەڕ بوون و ئیمانیان نە هێنا

بەفەرمانەکانی پەروەردگاریان، لاشیاندا لەبەرنامەی پێغەمبەرانی خوا و شوێن فەرمانی هەموو زۆر دارو سەرسەخت و خوانەناسێك کەوتن. جاهەرلەم جیهانەدا نەفرین لێ کراو بوون و دوور بوون لە بەزەیی خوا، لە ڕۆژی قیامەتیشدا (هەرنەفرین لێ کراو دەبن) و ئاگادارین کە بێگومان هۆزی عاد بێ باوەڕ بوون و بێوەفاییان دەربڕی بەرامبەر پەروەردگار یان، ئاگادارین کە دوری و بێ نرخی بۆ هۆزی عادی قەومی هود﴾.

وەلەسورەتی (الشعراء) یشدا هەندێ لەوتایبەتمەندیانە هەن کە لەسەر هەندێ لەو تایبەتمەندیانە کەئەو نەتەوەیە ئالودەیان بوو بوون، لەڕێی وتوێژی پێغەمبەرە کەیان دەخەینە ڕوو وەك دەفەرموێت :﴿أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾. واتە ﴿ئایائێوە لەهەموو شوێنێکی بڵندوسازگارداکۆشك وتەلاردروست دەکەن وخۆتان سەرگەرمی کەیف وشادی دەکەن ؟! (ئایابۆ ئەوە دروست کراون ؟)... هەرخەریکی دروست کردنی کارگەو کارخانەن وبەئومێدی ئەوەن هەمیشە بژین ونەمرن...﴾. وەهەڵس و کەوتی ئەو گەل و نەتەوەیە زۆر توند بوو وەئازاری خەڵکیشیان دەدا، بەڵام کاتێك پێغەمبەرەکەیان ئاگاداری کردنەوە کەبەم کارانەیان ئایندەیان باش نابێت وتیان : ﴿إِنْ هَٰذَآ إِلَّا خُلُقُ ٱلْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾واتە: ﴿ئەم بیروباوەڕەی ئێمە هەمانە ڕەوشتی پێشینانمانەوهیچی تر﴾. زۆر لەوە دڵنیا بوون کە تووشی هیچ نارەحەتیەك نابن : ئەوەتا قورئانی پیرۆز بەدرێژی لەم ئایەتانەدا باسی ئەو ڕووداوە دەکات :. ﴿كَذَّبَتْ عَادٌ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٢٣﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ هُودٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٢٤﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٢٥﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٢٦﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٢٧﴾ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً

تَمْشُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ وَإِذَا بَطَشْتُم بَطَشْتُمْ جَبَّارِينَ ﴿١٣٠﴾ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٣١﴾ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُم بِمَا تَعْلَمُونَ ﴿١٣٢﴾ أَمَدَّكُم بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ﴿١٣٣﴾ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٣٤﴾ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٣٥﴾ قَالُوا سَوَاءٌ عَلَيْنَا أَوَعَظْتَ أَمْ لَمْ تَكُن مِّنَ الْوَاعِظِينَ ﴿١٣٦﴾ إِنْ هَٰذَا إِلَّا خُلُقُ الْأَوَّلِينَ ﴿١٣٧﴾ وَمَا نَحْنُ بِمُعَذَّبِينَ ﴿١٣٨﴾ فَكَذَّبُوهُ فَأَهْلَكْنَاهُمْ ۗ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿١٣٩﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ الْعَزِيزُ الرَّحِيمُ ﴿١٤٠﴾ ﴾ **الشعراء (١٢٣-١٤٠)**. واته : ﴿قەومی عادیش بەرنامەی هەرهەمو پێغەمبەرانیان بەدرۆ زانی. کاتێك هودی پێغەمبەری برایان پێی وتن : باشە ئەوە ئێوە لەخوا ناترسن، پارێزکار نابن. بەڕاستی دڵنیابن کەمن فرستادەیەکی ئەمین و دڵسۆزم بۆتان. لەخوا بترسن و فەرمانبەردارم بن... من داوای هیچ جۆرە پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەری، من تەنها پاداشتی خۆم لە پەروەردگاری جیهانەکان دەخوازم. ئایا ئێوە لەهەمو شوێنێکی بڵندو سازگاردا کۆشك و تەلار درووست دەکەن و خۆتان سەرگەرمی کەیف و شادی دەکەن ؟! (ئایا بۆ ئەوە دروست کراون ؟)... هەرخەریکی دروست کردنی کارگەو کارخانەن و بە لومێدی ئەوەن هەمیشە بژین و نەمرن... کاتێك پەلامار دەدەن بە شێوەیەکی زۆر دڵڕەق و دڕندانە پەلامار دەدەن و دەست دەوەشێنن !... کەواتە لەخوا بترسن و فەرمانبەردارم بن... لەوزاتە بترسن کەخۆتان دەزانن چی پێ بەخشیون... ماڵاتی زۆرو نەوەی زۆری پێ بەخشیون... هەروەها باخچە و باخات و کانی و سەرچاوەی زۆر... بەڕاستی من دەترسم لەڕۆژێکی زۆر سەختدا بەڵایەکی گەورە یەخەتان پێ بگرێت... (ستەمکاران) وتیان : چون یەکە بەلای ئێمەوە ئامۆژگاریت کردبێت یان نەت کردبێت ؟! ئەم بیرو باوەڕەی ئێمە هەمانە ڕەوشتی پێشینان مانە و هیچی تر. (ئێمە بڕواناکەی کەوك تۆ دەڵێیت) لەسزادراوان و ئازاردراوان بین. ئەوان بڕ

وایان پێ نەکرد ئێمەش لەناومان بردن، بەڕاستی لەبەسەرهاتیاندا بەڵگەو نیشانەو عیبرەت هەیە، هەرچەندە زۆربەشیان باوەڕدار نەبوون. بەڕاستی پەروەردگاری تۆ (ئەی محمد، ئەی ئیماندار) بالا دەستە (بەسەر بێ باوەڕاندا) و بەسۆزو میهرەبانە (بە ئیمانداران).﴾. لەڕاستیدا هۆزو گەلەکەی عاد تیاچوون... ئەوهۆزو گەلەی کە پێغەمبەرە کەیان بەدرۆ خستەوە و وەڕاشیان گەیاند کە گوێڕایەڵی بەدی هێنەرەکەیان ناکەن و سەرپێچی لێ دەکەن، ئەوسا خوای گەورەش لەبەر ئەو سەر پێچی کردنەیان گەردەلولێکی لماوی بەهێزی بۆ ناردن و لەسەر زەویدا بەیەکجاری لەناوی بردن ﴿كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا فِيهَآ ۗ﴾ (٦٨) هود (٦٨). واتە : ﴿وەك ئەوەی کەهەر لەوشوێنەدانەبووبن وتیایدانەژیابن﴾

## شوێنەوارە دۆزراوەکانی شاری ئیرەم

لەسەرەتاکانی ساڵی (١٩٩٠) دا چەند ناونیشانێك لەڕۆژنامە بەناوبانگە جیهانیەکاندا دەرکەوتن و ئەوەیان ئاشکرا کرد کە (شارێکی داستانی عەرەبی دۆزراوەتەوە)، وەدۆزینەوەی شارێکی عەرەبی کە داستانەکانی (ئوبار، دوورگەی لماوی) باسیان لێوە کردووە، ئەوەی جێگەی گرنگی پێدانە ئەوەیە کە ئەو شوێنەوار ناسانە پەییان پێ بردوون، بەرلە (١٤) دە سەدە زیاترە قورئانی پیرۆز باسی لێوە کردوون، ئەوکەسانە هیچیان پێ نەدەکرا کەوا گومانیان دەبرد چیرۆکی عاد کەلە قورئانی پیرۆزدا باسی کراوە جگە لەداستانێك کەلەناو خەڵکیدا دەگێڕێتەوە و شوێنەواری لەسەر زەوی هەرگیز دەرناکەوێ،لەشاردنەوەی سەرسام بوون و واق وڕمانیان بۆ ئەم دۆزینەوانە پەیدا بوو، ئەم چیرۆکە کە دەکرا بزانرایە لە ڕێگەی گێڕانەوەی خەڵکیەوە نەبێ زۆرێك گرنگی پێدان و بایەخداری بۆ داندەنرا، ئێستە دۆزراوەتەوە و پەی پێ براوە وەزۆرێك بەرەوی بەدەست هێناوە. نیکۆلاس

کلاب Nicholas Clapp ئەو گەنجە شوێنەوار ناسە بوو کەشاری داستانەکەی دۆزیەوە کە قورئانی پیرۆز گێڕاویەتیەوە[1]. بەو سیفەتەی کە حەز بەمێژوو عەرەب دەکات و بەرهەم هێنەری فیلمە بەڵگە نامەییەکانیشە، کلاب لەکاتی گەڕان و پشکنیندا لەو ناوچەیدا کتێبێکی نایابی دەربارەی مێژووی عەرەب دۆزیەوە، وەئەم کتێبەش Arabia Felix لەنوسینی لێکۆڵەرو توێژەری ئینگلیزی (بیرتام تۆماس Bertran Thomas، کەلەساڵی (١٩٣٢) ی زاینی دا دایناوە، (Arabia Felix) ئەو نازناوەیە کەبۆ بەشی باشووری دوورگەی عەرەبی دەگەڕێتەوە کەئەمڕۆ یەمەن و عەمان لەخۆ دەگرێت، یۆنانیەکان بەم ناوچەیە دەڵێن (Arabia Eudaimon) بەڵام توێژەرە عەرەبەکان لەسەدەی ناوەڕاستدا، بەم ناوچەیەیان دەووت (اليمن السعيد) [2] واتە : یەمەنی بەختەوەر. تێکڕای ئەم ناوانە بەمانای (ناوچەی عەرەبی بەختەوەر) دێت، چونکە خەڵکی ئەو ناوچەیە لەسەردەمێك لەسەردەمەکانی ڕابردوودا خەریکی پەموو کردن بوون، بەختەوەر ترینی خەڵکی ئەو سەردەمەی خۆیان بوون، ئەمەباشە، بەڵام بۆ چی ؟ لەڕاستیدا بەشێك لەو بەختەوەرو شادوومانەیان لەو پێگە ستراتیژیە یە کەلەسەر هێڵی بازرگانی (بەهاراتە) کەدەکەوێتە ناوەڕاستی هیندو ناوچەکانی باکوری دوورگەی عەرەبیەوە، جگە لەمەش دانیشتوانی ئەم ناوچەیە بازرگانیان بەبوخوردەوە دەکرد کەلە داری بوخوردی ناوازە بەرهەمیان دەهێنا، وەئەم ڕووەکەش لەو سەردەمەدا پلەو پایەیەکی گەورەی هەبوو لەلای نەتەوەکانی عەرەب، کەلە کەش و بۆنە ئاینیەکاندا بەکار دەهێنران، کەلەڕاستیدا هاوشانی نرخ و بەهای زێڕی هەڵگرتبوو،

---

[1] توماس ماوف ، أوبار ، المدينة الأسطورية المفقودة ، مجلة لوس أنجلس تايم ، ٥ شباط ١٩٩٢
[2] كمال صليبي تأريخ الجزيرة العربية ، كتب كارافان ١٩٨٠

**گەلی عاد - ناونیشانی لەسەر نەخشە**




**پاشماوەی شاری ئۆبار دۆزرایەوە، کە گەلی عاد لەیەکێک لەناوچەکانی کەنارەکانی عوماندا ژیاون**

توێژەرو لێکۆڵەری ئینگلیزی (تۆماس) لەوەسفێکی دوورو درێژدا وەسفی ئەم هۆزانە بە (بەختەوەر) دەکات وەبانگەشەی ئەوەدەکات کەشوێنەواری شارێکی کۆنی یەکێك لەم هۆزانەی دۆزیوەتەوە کەئەوان دروستیان کردووە [1]، وەئەم شارەش لە زمانی دەشتەکیەکاندا بەناوی (ئوبار) ناودەبرا وەلەیەکێك لەگەشتەکانیدا هەندێ لەدەشتەکیەکان کە لەوناوچەیەدا دەژیان هەستان بە پیشاندانی ئەو شوێنەوارە دیارانە وەپێیان وت : ئەم شوێنەوارانە بەرەو شاری ئوبارت دەبەن، بەلاّم تۆماس کە هەموو هەوڵێکی خستبوویە گەڕ بۆ ئەم بابەتە کۆچی دوایی کرد بەرلەوەی توێژینەوەکانی تەواو بکات [2]، کلاب هیچ کاتێکی بە فیڕۆ نەدا پاش ئەوەی کە کتێبەکەی تۆماسی خوێندەوە، دڵنیابوو لەوەی کە شارێکی وون بوو

---

[1] بيرترام توماس Arabia Felix : عبر (الربع الخالي) في الجزيرة العربية ، نيويورك : أبناء شريبر ١٩٣٢ ، صفحة ١٦١

[2] تشارلين كراب (البخور) ، إكتشاف ، كانون الثاني ١٩٩٣.

کەلەو کتێبەدا وەسفی کراوە هەیە، وەسەرلەنوێ دەستی کردەوە بە بەدوادا چوونی لەسەر توێژینەوەکەی.

کلاب بەدوو ڕێگادا ڕۆیشت تاوەکو شاری ئوباری بۆ بسەلمێت، سەرەتاش شوێنەواری ئەو شارەی تاوتوێکرد کە هۆزە دەشتەکیەکان هەواڵیان لەبارەی داوە، پاشان داوای پێشکەش بە بریکاری ناسا کرد لەپێناو گەیشتن بەوێنەی ئەو ناوچەیە لەویش لەڕێگەی ئاسمانیەوە، وەدوای جەنگێکی دوورو درێژ سەرکەوت لەدەست خستنی ئەوەدا کە بواری بۆ بڕەخسێت چەند وێنەیەکی ئەم ناوچەیە بەدەست بخات[1]، کلاب هەموو هەوڵەکانی خستەگەڕ وەهەموو ئەو نەخشەو هێڵە کۆنانەشی تاوتوێ کرد کەلەزانکۆی هانتینغتونی کالیفۆرنیا هێنا بوونی. مەبەستی کلاب لێرەدا لەوە بوو بکات بەنەخشە کۆنەکانی ئەم ناوچەیە، وەدوای لێکۆڵینەوە و توێژینەوەیەکی کورت توانی نەخشەیەك پەیدا بکات ئەویش نەخشەیەك بوو کە (بتلیموس) جوگرافیاناسی میسری ئیغریقی کێشابووی لەساڵی (٢٠٠) زاینیدا، کەلەسەر نەخشەکەدا جێگە و شوێنی شارێك دەردەکەوت لەوناوچەیەدا وە هەروەها ئەو ڕێگایانەشی کەدەچنەوە سەر ئەم شارە، لەم کاتەشدا هەواڵێکی پێگەیشت کە لەو ێنانەی کە کلاب لەناسای داوا کردبوو وێنەکانیان گەیاون، وەلە وێنەکەشدا چەند ڕێڕەوێکی داخراو دەردەکەوتن کە ئەستەم بوو بەچاوو لەسەر زەویدا دیاری بکرێن، وەنەدەتوانرا بەشێوەیەکی تەواو ببینرێت مەگەر لە ئاسمانەوە.

[1] لیغل غروم ، (البخور والمر) لونغمان ، ١٩٨١ صفحة ٨١



زۆرێك لەكارە هونەریەكان و شارستانیە باڵاكان لەئۆباردا بەپێی ریوایەتەكانی قورئانی پیرۆز لەسەر زەویدا سڕاونەتەوە، جگە لەشوێنەوارەكانیان هیچی تر نەماوە



هەڵکەندنەکان لەناوچەی ئۆباردا

وە ئەم وێنانە بە بەراورد لەگەڵ نەخشە کۆنەکە کە کلاب پەیدای کردبوو، دەگەیشت بەو ئەنجامەی کە بەدوایدا دەگەڕاو لێکۆ لێنەوەی لەسەر دەکرد:. لەڕاستیدا ئەو ڕێڕەوە پیادانەی کەلەسەر وێنە ئاسمانیەکاندا دەردەکەوتن هاوڕابوون لەگەڵ وێنەی سەر نەخشە کۆنەکە وەکۆتا وێستگەی ئەم ڕێڕەوانەش ناوچەیەکی فراوان بوو، وەدەبێت ئەوەمان لەلا ڕۆشن بێت کە ڕۆژێك لە ڕۆژان ئەوە شارێکی کۆن بووە. لەکۆتایشدا ناوچەکە بەتەواوەتی دۆزرایەوە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان شانۆی ئەو چیرۆکانە بووە کە دەشتەکیەکان دەیان گێڕایەوە. دوای ئەوەش بەماوەیەکی کەم هەڵکۆڵەرە شوێنەواریەکان دەستیان کرد بەکارەکانیان لەسەرخۆو کەم کەم شوێنەواری شارێکی کۆنیان لەژێر زەویدا بۆ دەرکەوت، بەم شێوەیەش ئەم شارەکۆنەیان ناونا ((ئوبار، دوورگەی لماوی)). بەڵام کێ ئەوە دەسەلێنێت کەئەم شارە هەمان شاری (عاد) ە کە قورئانی پیرۆز باسی کردووە ؟.



جێگەو شوێنی گەلی عاد وەك ئەو وێنەی كە لەرێگەی مانگی دەستكردەوە ئاشكرا كراون، رەنگە وێنەكە شوێنی دوو ریانی قافلەكان بێ كە ئاماژە بەئوبار دەكات.





١-ئۆبار، پێش پشكنین و هەڵكەندیان نەدەتوانرا بەبێ مانگی دەستكرد ببینرێت.

٢- دەركەوتنی شارێك لەقوڵایی ١٢ مەتر دوای جێ بەجێ كردنی هەڵكەندن و پشكنینەكان.

لەو کاتەوەی کەشوێنەواری شارەکە دەرکەوتووە ئەوە ڕۆشن بووەتەوە کەئەم شارە شاری (عاد و ئیرەمی خاوەن پایەیە) کەلە قورئانی پیرۆزدا باسی لێوە کراوە، چونکە لەنێو ئەوشوێنەوارانەی کەلەژێر زەویدا دەکەوتوون هەمان (پایەوکۆڵەکە) کەلە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە لەم جێگایەشدا هەیە، وەیەکێك لەنوێنەری شوێنەوارناسەکان بەناوی (دکتۆر زاینز، Dr, Zarins) دەڵێت :. لەڕاستیدا گەورە ترین بەڵگەلەسەر ئەم ناوچەیە کە هەڵیانکەندوە ناوچەی (ئیرەم) ،، واتە شاری عاد کەلە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە، کەئەو کۆڵەکەو پایانەیە ناوچەی لوباری پێ جیادەبێتەوە وەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێت : ﴿ أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِعَادٍ ﴿٦﴾ إِرَمَ ذَاتِ الْعِمَادِ ﴿٧﴾ الَّتِي لَمْ يُخْلَقْ مِثْلُهَا فِي الْبِلَادِ ﴿٨﴾ ﴾ الفجر (٦-٨) واتە :. ﴿ئایانەتزانیوە پەروەردگاری تۆچی کردبەهۆزی عاد. کەئەویش هۆزی (ئیرەم) وخاوەنی پایەی بەرزو کۆڵەکەونێرگەی درێژبوون (گەلی عاد لەشاری ئیرەم کەباڵابەرزبوون، خانوبەرەوکۆشك وتەلاری گەورەوبەرزیان دروست دەکرد).لەسەردەمی ئەواندالەهیچ شاروشوێنێکدا، کۆشك وتەلاری وەك ئەوەی لەوان دروست نەکراوە.﴾

## گەلی عاد

تاکوئێستا ئەوە سەلمێنراوە کەشاری ئوبار شاری ئیرەمە کەلەقورئانی پیرۆزدا باس کراوە، وەبەپێی چیرۆکە قورئانیەکە :. دانیشتوانی ئەم شارە هود پێغەمبەریان (سەلامی خوای لێ بێت) بەدرۆخستوەتەوە کەئەم پێغەمبەرە بەپەیامی خواییەوە ڕەوانە کرابوو بۆیان، وەهەروەها لە خەشم و قینی خوای گەورەش بەئاگای دەهێنانەوە، جالەبەر ئەو هەموو سەرپێچی کردنەیان کە ئەنجامیان دەدا خوای گەورە لەناوی بردن. لەڕاستیدا ئەوەی کە جێگەی سەر سوڕمانە تاکو ئێستا

ناسنامەی ئەم شارە جێگەی مشت و مڕ کردنە، تۆمارە مێژووییەکان هیچ باس و خواسێتکی ئەم هۆزو نەتەوەی تێدا نیە، کە خاوەنی شارستانیەتێکی هێجگار گەورە بوون، ئەوەی کە جێگەی تێڕامانە تەنانەت ناویشیان لەتۆمارە مێژوو ییەکاندا نەهاتووە ، لەلایەکی دیکەشەوە ڕەنگە شتێکی سروشتی بوو بێت کەناوی ئەم گەل و نەتەوەیە لەتۆمارە مێژووییەکۆنەکاندا نەهاتبێت، هۆکەشی ئەوە بووە :. ئەم گەل و نەتەوەیە لەخوارووی دوورگەی عەرەبییەوە ژیاون کەناوچەیەکی دووریشە لەناوچەی دۆڵی دوو ڕووبار و ڕۆژ هەلاتی ناوەڕاستەوە، تەنها چەند پەیوەندیەکی دیاری کراو نەبێت پەیوەندیان پێوە نەکراوە، کەواتە ئاساییە ناوی ناوچەیەك لەبیربکرێت لەکاتێکدا لەتۆمارە مێژووییەکاندا خەریکە نەناسرێتەوە، وەلەگەڵ ئەوەشدا گەل و نەتەوەکانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست یەك لەدوای یەك هەواڵەکانی (عاد) یان گێڕاوەتەوە. لەگرنگترین هۆکارەکانی نەبوونی ناوی ئەم شارە لەتۆمارە مێژوو ییەنوسراوەکاندا ئەوەیە :. کەئەو سەردەمە لەم ناوچەیەدا نوسین زۆر بلاو نەبووە، لەڕاستیدا ئەتوانین ئەوە بلێین کە هۆزو نەتەوەی عاد دەوڵەتیان پێکەوەنا بەلام ئەم دەوڵەتەیان لەتۆمارە مێژوو ییەکاندا تۆمار نەکرا لەگەڵ ئەوەی کە ئەم دەوڵەتە بۆماوەیەکی درێژ بەردەوام بووە، لەبەر ئەوە دەکرێ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زیاتر لەبارەی ئەم نەتەوەوە بزانین. کەواتە :. هیچ تۆمارێکی نوسرا و لەبارەی گەلی عادە وە نیە، بەلام دەتوانین زانیاری گرنگ لەنەوەکانی نەتەوە لەناوچووەکانەوە پەیدا بکەین، کەوا بوو دەتوانین هەرلەنەوەکانی عاد بیەو ڕایەکمان دەست بکەوێت.

# حەضرەمەوت، نەوەکانی عاد

یەکەمین ناوچە کە پێویستە لەسەری بوەستین لەکاتی لێکۆڵینەوە لەبارەی شارستانیەتی عاد و ئەو شارستانیانەی کەلەناوچوون، ئەویش بریتیە لە ناوچەی باشوری یەمەن، کە (ئوبارو دوورگەی لماوی) لەوێ دۆزرایەوە کەپێی دەوترا (یەمەنی بەختەوەر) لەباشووری یەمەندا چوار نەتەوە و هۆزیان دۆزیەوە پێش ئەم سەردەمەی ئێمە پێیان دەووترا (عەرەبە بەختەوەرەکان یاخود عەرەبە شادومانەکان)، ئەم نەتەوانەش بریتی بوون لەدانیشتوانی حەضرەمەوت، دانیشتوانی سبأ، دانیشتوانی میناع، دانیشتوانی قتباء. ئەم گەل و نەتەوانە لەیەك کاتدا فەرمان ڕەواییان کردووە لەناوچە نزیکەکانی دەورو بەری خۆیاندا. ژمارەیەك لەزانایانی هاوچەرخ دەڵێن :. لەڕاستیدا عاد بۆ قۆناغێکی گۆڕان هات پاشان سەرلەنوێ لەسەر شانۆی مێژوو دا دەرکەوتەوە، دکتۆر میخائیل ڕەحمان توێژەر لەزانکۆی (ئوهایو) بڕوای وایە کە گەلی عاد لەباپیرانی حەضرە مە وتە کانن کەیەکێکن لەو گەل و نەتەوانەی کەلەباشووری یەمەندا ژیاون، وەحەضرەمەوتەکان لەساڵی (٥٠٠) پێش زاینەدا دەرکەوتن، کەمترینی ئەو هۆزانە بوون کە بە (عەرەبە بەختەوەرەکان) ناسرا بوون، ئەم هۆزو نەتەوەیە بۆ ماوەیەکی کورت لەیەکێك لەسەردەمەکاندا فەرمانڕەوایی باشووری یەمەنیان کردووە تادواجار لەساڵی (٢٤٠) زاینیدا دوای ماوەیەکی کورت هەڵوەشانەوە و کۆتاییان پێ هات.

وشەی حەضرەمەوتی ئەوە پیشان دەدات ڕەنگە ئەم گەل و نەتەوانە لەنەوە و ڕۆڵەکانی (عاد) بن، نوسەری ئیغریقی کەناوی (بلینی) یەو لەسەدەی سێیەمی پێش زاینەدا ژیاوە ئاماژە بەوە دەکات کە ووشەی (ئەدرامیتای) بەواتای

حەضرەمەدیت [1]. کۆتایی ناوە ئیغریقیەکەش کە زیادەی ناوەکەیە، وە بنچینەی ناوەکە (ئەدرامە) کەلەئێستادا بەهۆش و بیەماندا دێتەوە کە ڕەنگە ناوی (عاد، ئیەم) کەلە قورئانی پیرۆزدا هاتووە هەمان ناو بێت و ئەوان دەستکاریان کردبێت. بتلیموس جوگرافی ناسی ئیغریقی لەسالآنی (١٠٠- ١٥٠) زایندا ئاشکرای دەکات ئەو شوێنەی کە حەضرەمیەکانی تێدا ژیاوە بەشی باشووری دوورگەی عەرەبیە، وەئەم ناوچەیەش ئەمرۆ بە حەضرەمەوت ناسراوە، وەدەکەوێتە پایتەختی (شەبوە) وە، کەلە ڕۆژئاوای دۆلّی حەضرەمەوتەوەیە، وەبە پێی ئەو چیرۆك و داستانانەی کە دەگێڕێنەوە گۆڕی حەزرەتی هود (سەلامی خوای لیّ بێت) کەپەروەردگار ناردی بۆ سەر گەلەکەی عاد لەحەضرەمەوتدایە. وەبەلّگەکانی تریش کەئاماژە بەوەدەکەن کە حەضرەمەوت درێژکراوەی گەلەکەی (عاد) ە، ئەوسامانەی کەلەدامێنی ئەو گەلەدا بوو، وە ئیغریقیەکان دەیان زانی کە (حەضرەمەوتیەکان) دەولّەمەنترین و سەرمایەدارترین گەلانی جیهانن، تۆمارە مێژووییەکان دەلّێن :. حەضرەمیەکان لەکشتوکالّی بوخورد دا زۆر پێشکەوتووبوون، کەبە بەهاترین ڕووەکەکانی ئەو سەردەمە بوو، کەلە زۆر شتدا بەکاریان هێناوە، لەڕاستیشدا کشتوکالّی ئەم ڕووەکە کە لەوسەردەمەدا زیاتر بەرەو پێش چوون و گەشەسەندنی بەخۆیەوە بینیوە لەوەی لەئەمڕۆدا هەیە. جێی مەبەستە کەئەو چالّە شوێنەواریانەی کەلەشاری (شەبو) ە ی پایتەختی حەضرەمەوت دا دەرکەوتووە زۆر ئەستەم بوو کە ئەو زەوی ناسانە هەستن بەم هەلّکەندنانەیان بۆ ئەوەی بگەن بەشوێنەواری شارەکە، ئەویش لەبەر قولّی ئەو گردوو تەپۆلّکە لماویانەوە بوو، وەسەرەتا لەسالّی (١٩٧٥) دا دەستیان بەم کارە کرد،لەگەلّ ئەوەدا دواجار دۆزینەوەکان کە پەییان پیّ بران لەکۆتایی کاری هەلّکەندندا سەرنج ڕاکێش بوون، چونکە لەڕاستیدا دەرکەوتنی

[1] المرجع السابق ، صفحة ٧٢

شارێکی کۆن کەلەژێر زەویدا داپۆشرابوو لەگەورەترین ئەو شوێنەوارە سەرنج ڕاکێشانە بوو کە تاکو ئێستا دۆزرابوویێتەوە، وەئەو شارە پەرژین کراوەی کەلێکۆلەران و شوێنەوار ناسان ئاشکرایان کرد یەکێکە لەگەورەترین و فراوانترین شارەکانی یەمەن کەئەو ناوچەیە بەخۆیەوە بینیبێتی. لەڕاستیدا کۆشکەکانیشی بەلگەن لەسەرئەوەی کە خانووی گەورەی تێدا بووە. گومانی تێدا نیە کە بیرکردنەوەی لۆژیکی ئەوە دەلێت :. کەخەلکی حەضرەمەوت هونەری بیناسازیان لە باوباپیرانیانەوە بۆ ماوەتەوە کەگەلی (عاد) بووە، حەزرەتی هود (سەلامی خوای لێ بێت) ئامۆژگاری گەلەکەی کردو پێی ووتن :. ﴿ أَتَبْنُونَ بِكُلِّ رِيعٍ ءَايَةً تَعْبَثُونَ ﴿١٢٨﴾ وَتَتَّخِذُونَ مَصَانِعَ لَعَلَّكُمْ تَخْلُدُونَ ﴿١٢٩﴾ ﴾ الشعراء (١٢٨-١٢٩) واتە : ﴿ئایاتێوە لەهەمووشوێنێکی بلندوسازگارداکۆشك وتەلار دروست دەکەن وخۆتان سەرگەرمی کەیف وشادی دەکەن ؟! (ئایابۆئەوە دروست کراون ؟)...هەرخەریکی دروست کردنی کارگەوکارخانەن وبەئومێدی ئەوەن هەمیشە بژین ونەمرن...﴾. سیفەتێکی سەرنج ڕاکێشی جیاکەرەوەی ترئەو کۆشك و بینایانەیە کەلە (شەبوە) دا دۆزرایەوە کە چەند کۆلەکەیەکی نەخشێنرا و بوون، کەڕەنگە ئەو کۆلەکانەی کەلە (شەبوە) دا دۆزرانەوە بەتەواوەتی جیابن لەشوێنەکانی تر ئەویش بەو پێیەی کە شێوازێکی بازنەیی و ڕێك و پێکی هەیە لەچوار چێوەی هەیوانێکی کۆلەکەیی بازنەییدا، وە ڕەنگە کۆلەکەی ناوچەکانی تری یەمەن چوار گۆشەیی گەورە بووبن و لەسەر شێوازی کەلووی قووچ دا، وە بێگومان دانیشتوانی (شەبوە) ئەم میراتەیان لەباوو باپیرانیانەوە بۆ ماوەتەوە کەگەلی (عاد) بوون، فۆتیوس (Photius) لەشەرگەورەپیاوی ئیغریقی بیزەنتی و قەشەو گەورەپیاوی ئەستەنبول لەسەدەی نۆیەمی زاینیدا هەستا بەتوێژینەوەیەکی بەرفراوان سەبارەت بە عەرەبەکانی باشوور و چالاکیە بازرگانیەکانیان، چونکە توانای گەیشتنی ئەوەی هەبوو بگات

به هێڵە کۆنەکانی ئیغریقی کەلە ئێستادا نەماون، بەتایبەت کتێبی (Agatharacides) کەلەساڵی (١٣٢) پێش زایندا بووە، کەپەیوستە بەدەریای سورەوە. فۆتیوس لەیەکێك لەبابەتەکانیدا دەڵێت (دەڵێن : ئەوان لەعەرەبەکانی باشوورن) کە کۆڵەکە و ستوونی زۆریان دروست دەکرد کەداپۆشرابوون بەئاڵتون یاخود لەزیو دروست کرابوون. لەڕاستیدا سەلماندنی ئەم کۆڵەکەو ستوونانە شایستەی تێڕامانن[1]. سەرەڕای ئەوەی وتەکەی فۆتیوس Photius ڕاستەوخۆ ئاماژە ناکات بە حەضرەمەوت، بەلاّم لەهەمان کاتدا بیروڕایەکت پێ دەدات کەئەم گەلە خاوەنی سەرمایەو دەوڵەمەندی و لێهاتوویی بێ وێنە بووە کە ئەو نەتەوەیە پێیان ناسرابوون و لەو ناوچەیەشدا ژیانیان دەگوزەراند، وەهەروەها هەردوو نوسەری کلاسیکی ئیغریقی بلینی Pliny وە سترابور Strebo بەم شێوەیە وەسفی ئەم شارە دەکەن کە (ئەم شارە بەپەرستگای گەورە و کۆشکی جوان و قەشەنگ ڕازینرابوویەوە). کاتێك بیر لەوە دەکەینەوە کەدانیشتوانی ئەم شارە لەوەچەو نەژادی (عاد) ن بەتەواوەتی هەست بەوە دەکەین کە : بۆچی قورئانی پیرۆز نیشتیمان و نشینگەی (عاد) ی بەوەناساندووە کە ﴿ إِرَمَ ذَاتِ ٱلۡعِمَادِ ﴿٧﴾ ﴾ الفجر(٧) واتە : ﴿خاوەنی پایەی بەرزوکۆڵەکەونێرگەی درێژبوون.(گەلی عاد لەشاری ئیرەم کەباڵابەرزبوون،خانووبەرەوکۆشك وتەلاری گەورەو بەرزیان دروست دەکرد)﴾.

[1] جوشیم شفازا ، الیمن ، مطابع A٤ ، ١٩٩٢

## کانیاوو باخچەکانی عاد

کاتێك گەشتیارێك بەباشووری دوورگەی عەرەبیدا تێ پەڕدەبێت هەرچوارلای ئەم دوورگەیە بیابانی وشکە، وەزۆربەی ئەم ناوچەش بەلم داپۆشراوە، جگە لەوشارو ناوچانەی کەباسمان لێوە کردن، وەئەم بیابانانەش لەم ناوچەیەدا سەدان ساڵ بگرە هەزاران ساڵە بوونیان هەیە. لەڕاستیدا قورئانی پیرۆز لەو ئایەتانەیدا کەباسی عاد دەکات زانیاری بەسوودمان شەبارەت بەم ناوچەیە پێشکەش دەکات وەك دەفەرموێت :. ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ وَأَطِيعُونِ ۝١٣١ وَاتَّقُوا الَّذِي أَمَدَّكُمْ بِمَا تَعْلَمُونَ ۝١٣٢ أَمَدَّكُمْ بِأَنْعَامٍ وَبَنِينَ ۝١٣٣ وَجَنَّاتٍ وَعُيُونٍ ۝١٣٤ إِنِّي أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ۝١٣٥ ﴾ الشعراء (١٣١-١٣٥) واتە :. ﴿کەواتە لەخوا بترسن و فەرمانبەردارم بن... لەوزاتە بترسن کەخۆتان دەزانن چی پێ بەخشیون... ماڵاتی زۆرو نەوەی زۆری پێ بەخشیون... هەروەها باخچە و باخات و کانی و سەرچاوەی زۆر... بەڕاستی من دەترسم لەڕۆژێکی زۆر سەختدا بەڵایەکی گەورە یەخەتان پێ بگرێت...﴾. بەڵام لەمڕۆ ئەگەر سەرنجی ئەوەبدەین (ئوبار) کەوەك نیشتیمانی عاد پشتی پێ دەبەسترێت بریتیە لە شاری (ئیرەم) وە هەروەها ناوچەکانی تریش کەڕەنگە بەهەمان شێوە نیشتیمانی (عاد) بن، بەتەواوەتی بەلم داپۆشراون، کەواتەبۆچی هود لەکاتی ئامۆژگاری گەلەکەیدا ئەم دەستەواژانەی بەکار هێناوە ؟ وەڵامێك لەناو تۆماری گۆڕانکاریەکانی ژینگەدا خۆی حەشارداوە،کە تۆمارە مێژوو ییەکان حەقیقەت و ڕاستێتی ئەم ناوچەیە ئاشکرا دەکات : ئەویش ئەوەیە کەڕۆژێك لەڕۆژان ئەم بیابانە فراوانە باخچەیەکی بەپیت وبەرەکەت بووە، وەزەویەکەشی زۆر بەپیت و بەرەکەت بووە، وەباخ و بێستانە سەوزەکان و کانیاوە شیرینەکانیشی ڕووبەرێکی بەرفراوانی ئەم ناوچەیان داگیرکردبوو، هەروەك چۆن قورئانی

پیەزژنەمەمان بۆدەگێڕێتەوە کەپێش کەمترلەچەندهەزار ساڵێك بووە، وەدانیشتوانی ئەم ناوچەیەش لەناو نازو نیعمەتی خوایـیدا دەژیان، وەدارستانەکانیش دڵڕەقی و بێ بەزەیی کەش وهەوایان کەم کردبوویەوە، لەڕاستیدا لەو ناوچەیەشدا بیابان هەبووە بەڵام بەم شێوەبەرفراوانە نەبووە، باشووری دوورگەکەش بەڵگەی گرنگمان سەبارەت بەگەلەکەی (عاد) لەوناوچەیەدا پێش کەش دەکات وەئەوەی کە دەتوانێت هەندێ تیشك بخاتەسەر ئەم بابەتە ئەوەیە کە ئەم بەڵگانە ئەوەمان پێ دەڵێن :دانیشتوانی ئەم ناوچەیە هەندێ ئامێری ئاودێریان بەکارهێناوە کە زۆر پێش کەوتوو بوون، وەئەم ئامێرانەش تەنها بۆ مەبەستێك بەکاریان هێناوە ئەویش کشتوکاڵ کردن بووە، وەدانیشتوانی ئەم ناوچەیە لەکاتێکدا بەکاریان هێناوە کە لەژیانی ئەمڕۆماندابۆبەکارهێنان ناشێن. هەروەها مانگە دەست کردەکان یاسایەکی ئاودێریان لەشارە کۆنەکەدادۆزیەوەکەپێك هاتبوو لەبۆری و بەنداوی کۆن کەبۆمەبەستی ئاودێری کردن بەکارهێنراوە کەلەتوانایدا هەبووە زیاترلە (٢٠٠٠٠٠) هەزار مرۆڤی ئەم ناوچەیە بگرێتە خۆ [1]، یەکێك لەتوێژەرەکانی ئەم ناوچەیە کەناوی (دۆ) Doe وە دەڵێت:ئەم ناوچەیە شوێنێکی زۆر بەپیت بووبەچواردەوری (مأرب)دا، بەئەندازەیەك کەدەتوانی بڕوابەوە بکەیت کەتێکڕای ئەم ناوچە کەدرێژدەبێتەوە لەنێوانی (مأرب) وحەضرەمەوتدا کەلەڕابردوودا نشینگەی شارستانیەتێکی گەشاوە بووە [2]، نوسەری ئیغریقی وەسفی ئەم ناوچە دەکات کە بەپیت و بەرەکەتە زۆرەی و ئەوشاخ و کێوە پڕ لەدارو درەخت و تەم و مژانەی، وەبەو ڕووبارو دارستانانەی کەپەیوەستن بەیەکەوە، هەندێ هێڵ کەلە هەندێ پەرستگا کۆنەکاندا دۆزراونەتەوە لەنزیك (شەبوە) ی پایتەختی حەضرەمەوتەوە زامنی ئەوە دەکەن کە چەند کتێبێك ئاماژە بەڕاوی ئاژەڵان دەکات

---

[1] المرجع السابق

[2] بريان دو، جنوب الجزيرة العربية ، تيمس وهدسون ١٩٧١، صفحة ٢١

لەم ناوچەیەدا وەهەندێکیشیان وەك قوربانی پێشکەش دەکران، لەکۆی باسەکەشدا ئاماژە بەوە دەکات کەئەم ناوچەیە بریتی بووەلە زەوی بەپیت و بەرەکەت لەپاڵ ئەوەداکەبەلی بیابانیش داپۆشراوە. دەتوانین شارەزابین لەو خێراییەی کەکشانی بیابانەکان بەخۆیانەوە دەبینن بەهۆی هەندێ توێژینەوەوە کەپەیمانگای سمیثسونیان (Smithosonian) لەپاکستاندا پێی هەستاوە بە شێوازێك کەناوچەیەکی بەپیت وبەرەکەتی بەناوبانگ بووە لە سەدەکانی ناوەڕاستدا گۆڕا بۆ بیابانێکی لماوی ئەویش بەهۆی گردە لماویەکانەوە بوو کە بەرزاییەکەی دەگەیشتە نزیکەی (٦) مەتر، وەلەڕاستیدا ئەوە دۆزراوەتەوە کە بیابانەکان ڕۆژانە (١٥) سم درێژدەبنەوە، بەتێکڕای ئەم خێراییەش لم خانووە بڵندو بەرزەکانی هەڵوشیوەبەشێوازێك هەروەك چۆن لەبنەڕەتدانەبووبن، نمونەی ئەو هەڵکۆڵینانەی کەلە (تیمنە) ی ولاتی یەمەندا لەساڵی (١٩٥٠) دا ئەنجام درا ئەوماڵ و خانوانە دەرکەوتن کە بەتەواوەتی بووبوون بەژێرخاکەوە، هەروەها ئەهرامەکانی میسریش ڕۆژێك لە ڕۆژان بەتەواوەتی لەژێر لمدا داپۆشرا بوون، وەنەکەوتبوونە بەر ڕووناکی تا دوای ئەوەی کەهەڵکەندران و پشکنینیان بۆ کرا، کەئەمەش کاتێکی زۆری خایاند. بەکورتی : ئەوەی دیاروئاشکرایە زەویەکانی ئەم بیابانە سەردەمێك بەر لەئێستا دیمەنێکی جیاوازیان هەبووە وەك لەوەی ئێستا هەیە.

# چۆن گەلەکەی عاد تیاچوو

قورئانی پیرۆز بۆمان باس دەکات کەچۆن نەتەوەکەی عاد بەبایەکی توندو سەخت و سارد لەناوچوون کەحەوت شەوو هەشت ڕۆژ بەردەوام بوو. خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت :﴿ كَذَّبَتْ عَادٌ فَكَيْفَ كَانَ عَذَابِي وَنُذُرِ ﴿١٨﴾ إِنَّآ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا صَرْصَرًا فِي يَوْمِ نَحْسٍ مُّسْتَمِرٍّ ﴿١٩﴾ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ ﴾ القمر (١٨-٢٠) واتە : ﴿قەومی عادیش بڕوایان بەپێغەمبەرەکەیان نەکرد، جاسەرنج بدەوبزانە سزاوتۆڵەی ئێمە لەویاخیبووانە چۆن بوو؟ بێگومان ئێمە بایەکی بەردەوامی توندو سەخت وساردمان هەڵکردە سەریان لەڕۆژگارێکی شومدا (یەك هەفتەی خایاند). خەڵکی هەمووی لەبێخ دەرهێناولەپێی خستن ودانی بەزەویدا، هەروەکوو قەدی دارخورمای کلۆر وهەڵکەنراو.﴾. لەئایەتێکی تریشدا دەفەرموێت ﴿ وَأَمَّا عَادٌ فَأُهْلِكُوا۟ بِرِيحٍ صَرْصَرٍ عَاتِيَةٍ ﴿٦﴾ سَخَّرَهَا عَلَيْهِمْ سَبْعَ لَيَالٍ وَثَمَٰنِيَةَ أَيَّامٍ حُسُومًا فَتَرَى ٱلْقَوْمَ فِيهَا صَرْعَىٰ كَأَنَّهُمْ أَعْجَازُ نَخْلٍ خَاوِيَةٍ ﴿٧﴾ ﴾ الحاقە (٦-٧) واتە ﴿گەلی عادیش بەڕەشەبایەکی ساردی بەهێزی وێرانکەرلەناوبران.حەوت شەووهەشت ڕۆژهەڵی کردە سەریان، بەردەوام وبەهێزدەتبینی (ئەگەر لەوێ بویتایە) ئەوخەڵکە هەموو لاڵ وپاڵ لێی دەکەوتن هەروەك قەدی دارخورمای لەڕیشە هەڵکەنراو، چۆن بەئاسانی دەکەوێت وشەق دەبات.﴾ سەرەڕای ئەو هەموو ئاگادار کردنەوە و ترساندنانە،ئەم گەلە گوێیان نەگرت و بەردەوام نکولیان لە پێغەمبەرایەتی پێغەمبەرەکەیان دەکردوبەدڕۆیان دەخستەوە، وەلەناو گومڕایدا تەواو ڕۆچووبوون، تەنانەت هەستیان بەوە نەدەکرد چی ڕوو دەدات لەکاتێکدا سزاکەیان دەبینی کە لێیانەوە نزیك دەبێتەوە و

بەردەوامیش بوون لەبەدرۆخستنەوەی پێغەمبەرەکەیاندا  ئەوەتا خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ فَلَمَّا رَأَوْهُ عَارِضًا مُّسْتَقْبِلَ أَوْدِيَتِهِمْ قَالُوا هَٰذَا عَارِضٌ مُّمْطِرُنَا ۚ بَلْ هُوَ مَا اسْتَعْجَلْتُم بِهِ ۖ رِيحٌ فِيهَا عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٢٤﴾ ﴾ الأحقاف (٢٤) واتە : ﴿جاکاتێك پەڵە هەورێکیان بینی ڕووی کردووەتە دۆڵ و ناوچەکەیان دڵیان خۆش بوو وتیان : ئەمە بارانی پێیە بۆمان، نەخێر وانیە بەڵکو ئەوە ئەو کارەساتەیە پەلەتانە پێش بێت، ڕەشەبایەکی توندە، کە سزایەکی بەئازارو بەئێشی پێ یە﴾.



ئەو ناوچەی کە گەلی عادی تێدا ژیاوە ئەمڕۆ پڕبووە لەگردی لماوی

کاتێك ئەم گەلە پەڵە هەوری سزایان بینی کە لێیانەوە نزیك دەبێتەوە ، ئەوان تێ نەدەگەیشتن کە ئەمە چی پێیە بەڵکو گومانیان وابوو کەبارانی پێیە بۆیان، ئەمەش بەڵگەیەکی تەواوە کە چۆن ئەم کارەساتە نزیك بووەتەوە لەم قەومە، چونکە ڕەشەباو گێژەڵوکە لماریەکە لوول و پێچی دەخوارد بەشێوەیەك هەرچی لمی بیابانەکە هەبوو

لەگەڵ خۆیدا لوولی دەدا و لە دوورەوە وادەزانرا کەمەرێکی باراناویە، کەواتە ڕەنگە گەلەکەی عاد بەدیمەنی ئەم پەڵە هەورانە خەڵە تابن و لە حەقیقەت و ڕاستی ئەم کارەساتە سەرنجیان نەدا بێت و بێ ئاگا بوون. یەکێك لەتوێژەرەکان بەناوی (دوو، Doe) بەم شێوەیە وەسفی ئەم ڕەشەبا لماویەمان بۆ دەکات (کەرەنگە وەك ئەزموونی کەسێتی خۆی وەسفی کردبێت) : دەڵێت : (یەکەم نیشانەی ئەم گێژە لووکە لماویە ئەوەیە نزیك بوویەوە لە دیواری هەوایی کەلی لەگەڵ هەڵگرتبوو، کەبەرزایەکەی دەگەیشتە هەزار پێ، بەرز دەبوویەوە و دەجولا بەهێزی تەوژمی زۆر بەهێزەوە [1]. لە (ئوبار) دا کەوا گومان دەبرێت پاشماوەی (دوورگەی لماوی) بێت چەند مەترێك لم لە دوای قوڵ بوونەوەی دۆزرایەوە، ڕەنگە ئەو ڕەشەباو گێژە لوو کە سەختەی کە حەوت شەوو هەشت ڕۆژی خایاند چەندین تەن لمی بەسەر ئەو شارەدا هەڵدابێتەوە و خەڵکیشی بە زیندوویی لەژێر لمدا شاردبێتەوە، وەئەو هەڵکۆڵینانەش کەلەشاری ئوباردا ئەنجام درا ئاماژە بەهەمان ئەگەر دەکەن، هەروەها لە گۆڤاری فەرەنسی (CamInteresse) دا هاتووە شاری ئوبار بەهۆی ڕەشەبا لماویەکەوە بوو بەژێر (١٢) مەتر لمەوە [2]. زۆربەی بەڵگە گرنگەکانیش پێیان وایە کەگەلی عاد بووە بەژێر لمەوە، ووشەی (الأحقاف) یش کەلە قورئانی پیرۆزدا باسکراوە سەبارەت بە دیاری کردنی شوێن و جێگای گەلی (عاد) ە وەیە وەك دەفەرموێت : ﴿ ۞ وَٱذْكُرْ أَخَا عَادٍ إِذْ أَنذَرَ قَوْمَهُۥ بِٱلْأَحْقَافِ وَقَدْ خَلَتِ ٱلنُّذُرُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَمِنْ خَلْفِهِۦٓ أَلَّا تَعْبُدُوٓا۟ إِلَّا ٱللَّهَ إِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿٢١﴾ ﴾ **الأحقاف** (٢١) واتە : ﴿ئەی پێغەمبەر (درودی خوای لێ بێت) یادی براکەی قەومی عاد – هود پێغەمبەر – بکە، کاتێك قەومەکەی بێدار کردەوە لە دۆڵ و

---

[1] Ca M,Interesse ، كانون الثاني ١٩٩٣

[2] هيكر ، الموسوعة الأسلامية : العالم الأسلامي ، تأريخ ، جغرافية ، إنثوغرافيا ، وقاموس بيبلوغرافيا ، المجلد ٥/١ ، صفحة ٤٧٥

بیابانەکاندا (مەبەست ناوچەی حەضرەمەوتە) بێگومان بێدارخەرەوەی زۆر لەپێش ئەوو دوای ئەویش تێ پەڕیان کرد، هەرهەموویان ئەوەیان بەخەڵکی ڕاگەیاندووە کە جگە لەخوا کەسی تر نەپەرستن. بەڕاستی من دەترسم سزایەکی زۆر گەورەو بێسنورتان لە ڕۆژێکی سامناکدا بۆ پێش بێت﴾. ووشەی (الأحقاف) لەعەرەبیدا بەمانای (الكثبان الرملية) دێت واتە : گردی لماوی، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت کە گەل و نەتەوەکەی عاد لەناوچەیەکدا نیشتە جێ بوون کە پڕبووە لەگردی لماوی، ئەمەش ئەو بەڵگە ژێرییەمان پێشکەش دەکات کە بە پێی هەندێ تەفسیر گەلەکەی عاد بوون بە ژێر لمەوە بەهۆی ئەو گێژە لۆوکە لماویەوە لەڕاستیدا ووشەی (الأحقاف) ئەومانای کەدەوترا بە (گردی لماوی) لەدەست دا، ئێستا بەناوچەیەك دەوترێت کەلەباشوری یەمەندایە و گەلەکەی (عاد) ی تێدا ژیاوە، وەئەمەش ڕاستی ئەو مانایە ناگۆڕێت کە ئەو وشەیە هەڵیگرتووە، بەڵام پێدەچێت ئەم مانایە (الكثبان الرملية) گردی لماوی تایبەت بێت بەو گەلەی کە ئەم ناوچەیە لەوکاتەدا پڕبوو بێت لە خەڵك. ڕەنگە ئەم ڕەشەباو گەردە لوولە کە ﴿ تَنزِعُ ٱلنَّاسَ كَأَنَّهُمۡ أَعۡجَازُ نَخۡلٍ مُّنقَعِرٍ ﴿٢٠﴾ ﴾ القمر (٢٠) واتە : ﴿خەڵکی هەمووی لەبێخ دەرهێناولەپێی خستن ودانی بەزەویدا، هەروەکووقەدی دارخورمای کلۆر وهەڵکەنراو﴾. ئەم نەتەوەی (عاد) ە ی لەماوەیەکی زۆر کورتدا لەناو بردبێت، ئەو گەلەی کەتاکوو ئەوساتەش لەناو نازو نیعمەتدا دەژیان بەژیانێکی خۆش گوزەرانانەی چێژدار، کۆشك و خانوو وەهەروەها بەنداوو بۆرییان پێکەوە دەناو وەزەویشیان دەکێڵا بۆ کشتو کاڵ، سەرجەم ئەمانە هەمووی بوون بەژێر لمەوە وەك چۆن شارەکە و دانیشتوانەکەی بەزیندوویەتی کران بەژێر لمەوە، دوابەدوای تیاچوونی گەلەکەی عاد تەواوی شوێنەوارەکانیان داپۆشران و بیابانیش درێژ بوویەوە وەهەموو شوێنێك لە شوێنەوارەکانیان داپۆشرا، لەئەنجامدا زەوی ناس و مێژوو نوسەکان ئاماژە بەوە

دەکەن کە گەلی عاد و ئیرەم بوونیان هەیەو خوای گەورە لەناوی بردوون وەك چۆن قورئانی پیرۆز باسی لێوە کردووە، وەدوای گەڕان و بەدواداچوونێکی زۆر توانرا شوێنەواری ئەم شارە لەژێرلە کاندا بگێڕێتەوە. پێویستە لەسەر ئادەمیزاد کاتێك ئەم شوێنەوارانە دەبینێت پەندو ئامۆژگارییان لێ وەر بگرێت کە قورئانی پیرۆزیش جەخت لەسەر ئەمە دەکاتەوە، جاقەومەکەی عاد ئەوەندە گومڕا بوون دەیان ووت: ﴿مَنْ أَشَدُّ مِنَّا قُوَّةً عَادٌ﴾ واتە : (کێ هەیە بەئەندازەی ئێمە هێز و دەسەلاتی هەبێت ؟) . بەلام ﴿أَوَلَمْ يَرَوْا أَنَّ اللَّهَ الَّذِي خَلَقَهُمْ هُوَ أَشَدُّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ ﴿١٥﴾﴾ فصلت (١٥) واتە : ﴿بەلام ئایائەوە نەیانزانی بە ڕاستی ئەو خوایەی کە دروستی کردوون، ئەولەوان هێزی زۆر زیاترە و ئەوانە هەر ئینکاری ئایەت و موعجیزەکانی ئێمەیان دەکرد﴾. پێویستە لەسەر ئادەمیزاد ئەم ڕاستیە نەگۆڕانە لەهۆش و بیریدا هەمیشە پارێزراو بێت، وەهەمیشە هەست بەوە بکات کە خوای گەورە بەهێزترین و بەتواناترینە، وەهەرگیز ئادەمیزاد ناتوانێ بکات بەهیچ مەرام و سەرکەوتنێك ئەگەر بەندایەتی و خواپەرستی لەگەڵدا نەبێت.

## بەشی پێنجەم ثەموود

﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِالنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوا أَبَشَرًا مِّنَّا وَاحِدًا نَّتَّبِعُهُ إِنَّا إِذًا لَّفِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَؤُلْقِيَ الذِّكْرُ عَلَيْهِ مِن بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ الْكَذَّابُ الْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ ﴾القمر (٢٣-٢٦) واتە : ﴿ثەموودیش هەموو بێدارکردنەوەوداچڵەکاندنێکیان بەدرۆزانی و بڕوایان پێی نەبوو. جاوتیان: باشە ڕەوایە، ئێمە شوێنی تاکە کەسێك بکەوین لەخۆمان ؟!، ئێمە ئەگەر بڕوابەکەسێکی وابکەین،ئەوکاتەئێمە بەڕاستی لەگومڕایی وشێتیدایـن ؟!ئایا ڕاستە لەنێوان ئێمەدا وەحی ونیگابۆئەوڕەوانەکرابێت، نەخێرشتی وانابێت، بەڵکوئەوهەرکابرایەکی زۆردرۆزن وخۆپەرستە وحەزبەگەورەیی دەکات!!سبەی دەزانن وبۆیان دەردەکەوێت کەکێ درۆزن وخۆپەرست وخۆبەگەورەزانە﴾. قورئانی پیرۆز باسی گەلی ثەموودمان بۆ دەگێڕێتەوە کەهۆزەکەی چۆن بەدرۆیان خستوەتەوە و گاڵتەیان بە بانگەوازەکەی کردووە، کەخوای گەورە وەك عاد ڕەوانەی کردبۆیان. کەچی ئەوانیش هاوشێوەی عاد دووچاری هەمان چارە نووس بوونەوە، وەئەمڕۆش لەسایەی ئەوتوێژینەوە و بەدوادا چوونە مێژووییی و زەوی ناسانەوە شتانێك بەرچاو کەوتوون کە پێشتر نەزانرا بوون، وەك ئەو ناوچەیەی کەگەلەکەی ثەمودی تێدا نیشتەجێن، وەئەو ماڵ و خانوانەی کە دروستیان کردبوو. وەهەروەها شێوازی ئەو ژیانەی کە تیایدا ژیاون، لەڕاستیدا گەلەکەی ثەموود کەلە قورئانی پیرۆزدا باس کراوە حەقیقەتێکی مێژووییە کەزۆرێك لە شوێنەوار ناسەکان ئەوەیان سەلماندووە. پێش ئەوەی سەرنج لەشوێنەوارەکانی ناوچەی ثەموود بدەین کەئاشکرابوون، پێویستە بگەڕێینەوە بۆ چیرۆکی هەمان ئەو گەلانەی کەلەقورئانی پیرۆزدا هاتوون و ئەو ڕووبەڕووبوونەوانەش بخوێنینەوە کەلەگەڵ پێغەمبەرەکەیاندا ئەنجامیان داوە، چونکە

قورئانی پیرۆز کتێبێکە باسی هەموو سەردەمەکان دەکات، لەبەرئەوە بەدرۆخستنەوەی ثەموود لەلایەن گەلەکەیەوە یەکێکە لەو ڕووداوانەی کەقورئانی پیرۆز باسی کردووە تاوەکوو ببێتە پەندو ئامۆژگاری بۆ تێکڕای خەڵکی بەدرێژایی سەدەکان.

## حەزرەتی سالّح (سەلامی خوای لیّ بیّت) و گەیاندنی پەیامەکەی

خوای پەروەردگارحەزرەتی سالّح (سەلامی خوای لیّ بیّت) ی نارد بۆ سەرهۆزو نەتەوەی ثەموود، کەلە هەمان کاتدا سالّح یەکیّك بوو لەو گەلە، وەلەڕاستیدا گەلەکەی چاوەڕێی ئەوەیان نەدەکرد کەبە ئاینیّکی ڕاستەوە بۆیان بیّت لەبەرئەوە کە گوێیان لەبانگەوازەکەی بوۆ سەرسام بوون کاتیّك ئەو وازی لەولادان وگومڕاییەی ئەوان هیّناوەپشتی لیّیان کردووە، یەکەمین کردارێك کەلەبەرامبەریدا وەستانەوە قسە پیێ ووتن بوو، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا ئەم ڕووداوەمان بۆ دەگیّڕێتەوە و دەفەرمویّت : ﴿ وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا ۚ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ هُوَ أَنشَأَكُم مِّنَ الْأَرْضِ وَاسْتَعْمَرَكُمْ فِيهَا فَاسْتَغْفِرُوهُ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّي قَرِيبٌ مُّجِيبٌ ﴿٦١﴾ قَالُوا يَا صَالِحُ قَدْ كُنتَ فِينَا مَرْجُوًّا قَبْلَ هَٰذَا ۖ أَتَنْهَانَا أَن نَّعْبُدَ مَا يَعْبُدُ آبَاؤُنَا وَإِنَّنَا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٦٢﴾ ﴾ هود (٦١-٦٢) واتە : ﴿بۆ هۆزی ثە موودیش سالّحی برایانمان ڕەوانەکرد وتی : ئەی خزمەکانم گوێڕایەڵی خوای گەورە بکەن جگە لەوزاتە هیچ خوایەکی ترتان نیە، ئەو بەرپای کردوون لەزەویدا و داوای لیّ کردوون کەئاوەدانی بکەنەوە، جاکەوابوو داوای لیّ خۆش بوونی لیّ بکەن پاشان بگەڕێنەوە بۆلای و فەرمانەکانی بەجیّ بهیّنن، چونکە بەڕاستی پەروەردگاری من زۆر نزیکەو نزا وەرگرە (لەو کەسانەی لیّ ی دەپاڕێنەوە و داوای لیّ خۆش بوونی لیّ دەکەن) خەڵکەکە وتیان : ئەی سالّح بەڕاستی پیّش ئەم باسانەت تۆ لەناو ئیّمەدا شوێنی هیوامان بوویت، ئایا بەرگری

ئەوەمان لێ دەکەیت کە شوێن شتێك بکەوین کەبا وو باپیرانمان شوێنی کەوتوون و پەرستوویانە ؟! ئێمە بەڕاستی لە گوماندایین لەوەی کەتۆ بانگی ئێمە دەکەی بۆلای و بەد بینین لێی !!﴾. کەمینەیەك لەگەلەکەی وەلامی بانگەوازەکەی سالح یان دایەوە و زۆرینەشیان ئەم بانگەوازەیان وەرنەگرت، وەهەروەها گەورە سەردارانی گەلەکەی و خزمانیشی دژایەتیان دەکردو توڕە بوون لەسالح پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) لەبەرئەوەی بانگی دەکردن بۆ بەندایەتی کردنی خوای تاك و تەنهاوپەرستنی، ئەوسا دەستیان کرد بەبە درۆخستنەوەی و هەولی ئەوەشیان دا کە ئازاری ئەو بڕوادارانەبدەن و بیان چەوسێنەوە کەشوێنی کەوتبوون، وەئەم جۆرە ڕەفتارانەی هۆزو نەتەوەکەی ثە موود یەکەم ڕەفتار نەبووە کرا بێت، بەلکو هەمان هەلەیان دووبارە دەکردەوە کە هەریەك لەگەل و نەتەوەکانی نوح و عاد کەلەپێشیاندا ژیاون کەوتوونەتە ئەم هەلانەوە، لەبەرئەمە دەبینین کە قورئانی پیرۆز هەلویستی ئەم سێ گەلە بەیەکەوە دەبەستێتەوە : ﴿ أَلَمْ يَأْتِكُمْ نَبَؤُا الَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَالَّذِينَ مِنْ بَعْدِهِمْ لَا يَعْلَمُهُمْ إِلَّا اللَّهُ جَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ فَرَدُّوا أَيْدِيَهُمْ فِي أَفْوَاهِهِمْ وَقَالُوا إِنَّا كَفَرْنَا بِمَا أُرْسِلْتُم بِهِ وَإِنَّا لَفِي شَكٍّ مِّمَّا تَدْعُونَنَا إِلَيْهِ مُرِيبٍ ﴿٩﴾ ﴾ ابراهیم (٩) واتە : ﴿باشە ئایا هەوالی قەومەپێشوەکانتان پێ نەگەیشتووە، قەومی (نوح و عاد و ثە موود)، ئەوانەش کەلە دوای ئەوانەوە هاتوون، تەنها خوا نەبێت کەس نازانێت چەندە بوون و چییان بەسەرهاتووە، ئەوانە فرستادەکانیان بەبەلگەی زۆرەوە هاتن دووپاتیان دەکردەوە کە پێغەمبەری پەروەردگارن، کەچی خوانەناسان یان بەدەستیان ئاماژەیان دەکرد بۆ پێغەمبەران کە بێ دەنگ بن، یاخود دەستیان دەبرد بۆ دەمی خۆیان و (دەیان کردە فیکە و هۆسە و گالتەجاڕی) و دەیان وت :

بێگومان ئێمە باوەڕمان بەم پەیام و بەرنامەیە نیە کەبەئێوەدا ڕەوانە کراوە، بەڕاستی ئێمەش لەدوو دڵنیەکداین کەخەڵکیش دەخاتە گومانەوە لەوەی کەئێوە بانگەوازی ئێمەی بۆ دەکەن﴾. سەرەڕای ئاگادار کردنەوەی حەزرەتی ساڵح (سەلامی خوای لێ بێت) بۆگەلەکەی بەردەوام ئەوگەلە گومانیان دەبرد بەو پەیامەی کەبۆی هێنا بوون، وەباوەڕیشیان پێ نەهێنا جگە لەکەسانێکی کەمیان نەبێت، ئەوکەسانەش ئەوبڕوادارانە بوون کە خوای گەورە لەگەڵ حەزرەتی ساڵح دا (سەلامی خوای لێ بێت) ڕزگاری کردن لەو تیاچوونەی کەگەل و نەتەوە بەدڕەفتارەکەی گرتەوە.وە گەورە پیاوانی گەلەکەی بەردەوام بوون لەچەوساندنەوەی ئەم کۆمەڵە بڕوادارە وەك خوای گەورە لەبارەیانەوە دەفەرموێت : ﴿ قَالَ ٱلْمَلَأُ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوا۟ مِن قَوْمِهِۦ لِلَّذِينَ ٱسْتُضْعِفُوا۟ لِمَنْ ءَامَنَ مِنْهُمْ أَتَعْلَمُونَ أَنَّ صَٰلِحًا مُّرْسَلٌ مِّن رَّبِّهِۦ ۚ قَالُوٓا۟ إِنَّا بِمَآ أُرْسِلَ بِهِۦ مُؤْمِنُونَ ﴿٧٥﴾ قَالَ ٱلَّذِينَ ٱسْتَكْبَرُوٓا۟ إِنَّا بِٱلَّذِىٓ ءَامَنتُم بِهِۦ كَٰفِرُونَ ﴿٧٦﴾ ﴾ الأعراف (٧٥-٧٦) واتە : ﴿(دوای ئەو یاد خستنەوانەی ساڵح پێغەمبەر) دەستەی دەسەڵات داران، ئەوانەی لوت بەرزیان کرد لەقەومەکەی وتیان بەوانەی کە چەوسێنراونەتەوە، لەوانەیان کەباوەڕیان هێناوە : باشە ئێوە دەزانن کە ساڵح لەلایەن پەروەردگاریەوە ڕەوانەکراوە ؟! ئیمانداران وتیان : بە دڵنیاییەوە ئێمە باوەڕدارین بەو پەیامەی کە بەودا ڕەوانە کراوە. (بەڵام) ئەوانەی کە خۆیان بەزل و گەورە دەزانی وتیان : بەڕاستی ئێمە بێ بڕواین بەوەی ئێوە بڕواتان پێ هێناوە !﴾. وەگەلەکەی حەزرەتی ساڵح سوور بوون لەسەر مل نەدان و بەرهەڵستکاری و گومان بەرامبەر بە پێغەمبەرایەتی حەزرەتی ساڵح (سەلامی خوای لێ بێت)، لەسەرو ئەمانەشەوە کۆمەڵێکیان هەبوو کەنکوڵی حەزرەتی ساڵح یان دەکرد (سەلامی خوای لێ بێت)

وەزۆر بێ شەرمانە ڕاستیەکانیان دادەپۆشی، کەبۆ سالّح پێغەمبەر هاتبوو، ئەوکۆمەڵەش ئەوانە بوون کە پیلانی کوشتنی حەزرەتی سالّح یان دەر کردبوو.

خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت : ﴿ قَالُوا اطَّيَّرْنَا بِكَ وَبِمَن مَّعَكَ قَالَ طَائِرُكُمْ عِندَ اللَّهِ بَلْ أَنتُمْ قَوْمٌ تُفْتَنُونَ (٤٧) وَكَانَ فِي الْمَدِينَةِ تِسْعَةُ رَهْطٍ يُفْسِدُونَ فِي الْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ (٤٨) قَالُوا تَقَاسَمُوا بِاللَّهِ لَنُبَيِّتَنَّهُ وَأَهْلَهُ ثُمَّ لَنَقُولَنَّ لِوَلِيِّهِ مَا شَهِدْنَا مَهْلِكَ أَهْلِهِ وَإِنَّا لَصَادِقُونَ (٤٩) وَمَكَرُوا مَكْرًا وَمَكَرْنَا مَكْرًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ (٥٠) ﴾ النمل (٤٧-٥٠) واتە : ﴿خەڵکەکە وتیان : ئێمە توشی شوم و نەگبەتی بووین بەهۆی تۆو ئەوانەی لەگەڵ تۆدان، سالّح وتی : نەخێروانیە نەگبەتی و شوومتان لەلایەن خواوە بۆ دێت (ئەگەر بەردەوام بن لەسەر یاخی بوونتان)، بەڵکو ئێوە قەومێکن کەتاقی دەکرێنەوە. لەوشارەدا نۆ دەستە هەبوو کەگوناهو تاوانیان ئەنجام دەداو تۆوی خراپەیان لەوڵاتدا دەچاندو بەلای چاکە و چاکەکاریدا نەدەچوون. هەموویان سوێندیان بەخوا بۆیەکتر خوارد کەلە شەودا بدەن بەسەر سالّح و ماڵ و منالّیدا و لەناویان بەرن، پاشان (ئەگەرگومانیان لێکردین) سوێند دەخۆین و بەکەسوکاری دەڵێین : ئێمە ئاگامان لەتیاچوونی ئەوان نیەو دڵنیابن ئێمە ڕاست گۆشین. (ئەو تاوانبارانە) پیلان و تەڵەکەیان گێڕا (بۆلەناوبردنی سالّح و شوێن کەوتوانی) ئێمەش نەخشەیەکی ترمان کێشا (بۆ ڕزگارکردنی ئیمانداران و لەناوبردنی خوانەناسان) ئەوان ئاگایان لێ نەبوو، هەستیان پێ نەدەکرد﴾. حەزرەتی سالّح (سەلامی خوای لێ بێت) نیشانەو موعجیزەیەکی پیشاندان کە وشترێك بوو بۆ ئەوەی بزانێ ئایا بۆچونیان بەرامبەری دەگۆڕێ و شوێنی دەکەون یان نا ؟ حەزرەتی سالّح (سەلامی خوای لێ بێت) بەگەلەکەی ووت ئەم ووشترە دەبێت بەشداربێت لەخواردنەوەی ئاوەکەیاندا،

وەبەهیچ شێوەیەکیش ئازاری نەدرێت، بەڵام گەلەکەی گوێیان نەدایە ئامۆژگاریەکانی ساڵح وحوشترەکەیان کوشت... سورەتی (الشعراء) ڕ ئەم چیرۆکەمان بەم شێوەیە بۆ دەگێڕێتەوە : ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿١٤١﴾ إِذْ قَالَ لَهُمْ أَخُوهُمْ صَٰلِحٌ أَلَا تَتَّقُونَ ﴿١٤٢﴾ إِنِّى لَكُمْ رَسُولٌ أَمِينٌ ﴿١٤٣﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٤٤﴾ وَمَآ أَسْـَٔلُكُمْ عَلَيْهِ مِنْ أَجْرٍ ۖ إِنْ أَجْرِىَ إِلَّا عَلَىٰ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٤٥﴾ أَتُتْرَكُونَ فِى مَا هَٰهُنَآ ءَامِنِينَ ﴿١٤٦﴾ فِى جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿١٤٧﴾ وَزُرُوعٍ وَنَخْلٍ طَلْعُهَا هَضِيمٌ ﴿١٤٨﴾ وَتَنْحِتُونَ مِنَ ٱلْجِبَالِ بُيُوتًا فَٰرِهِينَ ﴿١٤٩﴾ فَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُونِ ﴿١٥٠﴾ وَلَا تُطِيعُوٓا۟ أَمْرَ ٱلْمُسْرِفِينَ ﴿١٥١﴾ ٱلَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى ٱلْأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ ﴿١٥٢﴾ قَالُوٓا۟ إِنَّمَآ أَنتَ مِنَ ٱلْمُسَحَّرِينَ ﴿١٥٣﴾ مَآ أَنتَ إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُنَا فَأْتِ بِـَٔايَةٍ إِن كُنتَ مِنَ ٱلصَّٰدِقِينَ ﴿١٥٤﴾ قَالَ هَٰذِهِۦ نَاقَةٌ لَّهَا شِرْبٌ وَلَكُمْ شِرْبُ يَوْمٍ مَّعْلُومٍ ﴿١٥٥﴾ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابُ يَوْمٍ عَظِيمٍ ﴿١٥٦﴾ فَعَقَرُوهَا فَأَصْبَحُوا۟ نَٰدِمِينَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ **سورەتی الشعراء** (١٤١-١٥٧) واتە : ﴿قەومی ثەمودیش بڕوایان بە پێغەمبەرانیان نەکرد. کاتێك ساڵحی برایان پێی وتن : باشەئەوەئێوە لەخوا ناترسن، پارێزکارنابن ؟ بەڕاستی دڵنیابن کەمن فرستادەیەکی ئەمین و دڵسۆزم بۆتان... کەوابوو لە خوا بترسن و فەرمانبەرداری من بکەن... من داوای هیچ جۆرە پاداشتێکتان لێ ناکەم لەسەری، من تەنها پاداشتی خۆم لە پەروەردگاری جیهانەکان دەخوازم. ئایاوادەزانن هەروا ئالێرەدا بەخۆشی و ئاسودەیی دەهێڵرێنەوە (ژیانتان کۆتایی نایەت) ؟ لەناو باخ و باخات و کانیاوی سازگاردا ؟!! لەناو بێستان و دارخورمادا کەخورمای نەرم و ناسك و بەتام دەگرێت ؟!! (هەروەها بۆتان دەلوێت) ماڵ و شوێنی خۆش لە چیاکان دابتاشن و بەجوانی دروستی بکەن و بەخۆشی تیایدا کەشخەبکەن ؟! لە خوا بترسن و فەرمانبەرداری

من بکەن بەفەرمانی موسیرف و لەسنوور دەرچووەکان هەڵسوکەوت مەکەن... ئەوانەی کەتۆوی فەساد و تاوان لەزەویدا دەچێنن و هەرگیز چاکسازی ناکەن. خوانەناسان وتیان : وادیارە تۆ بەڕاستی لەوانەی کە فێڵ و جادووت لێ کراوە !! تۆ جگەلەوەی کەهەربەشەرێکی وەك و ئێمە، هیچی تر نیت، بەڵگەیەکمان نیشان بدە ئەگەر لەڕاست گۆیانیت ؟! (جاخوای بەتوانا وشترێکی بۆ بەدی هێنان، تادەم کوتیان بکات و بیانویان ببڕێت)، ئینجا سالح پێغەمبەر پێی وتن ئەمەوشترێکەو موعجیزەیەکە دەبێت ئاو تەنها بۆ ئەم بێت، ڕۆژێکیش بۆ ئێوە دیاری کراو بێت. نەکەن دەست درێژی بکەنە سەرو ئازاری بدەن، بەهۆی ئەوەوە سزایەکی سەخت لەڕۆژێکی سامناکدا یەختان نەگرێت. (بەڵام گوێیان نەدا بە ئامۆژگاریەکانی سالح)، جاسەریان بڕی و دەست بەجێ لەبەیانیدا پەشیمان بوونەوە...﴾. بەڵام ململانێی حەزرەتی سالح لەگەڵ گەلەکەیدا خوای گەورە لەسورەتی (القمر) دا پیشانمان دەدا وەك دەفەرموێت : ﴿ كَذَّبَتْ ثَمُودُ بِالنُّذُرِ ﴿٢٣﴾ فَقَالُوا أَبَشَرًا مِّنَّا وَاحِدًا نَّتَّبِعُهُ إِنَّا إِذًا لَّفِي ضَلَالٍ وَسُعُرٍ ﴿٢٤﴾ أَأُلْقِيَ الذِّكْرُ عَلَيْهِ مِن بَيْنِنَا بَلْ هُوَ كَذَّابٌ أَشِرٌ ﴿٢٥﴾ سَيَعْلَمُونَ غَدًا مَّنِ الْكَذَّابُ الْأَشِرُ ﴿٢٦﴾ إِنَّا مُرْسِلُو النَّاقَةِ فِتْنَةً لَّهُمْ فَارْتَقِبْهُمْ وَاصْطَبِرْ ﴿٢٧﴾ وَنَبِّئْهُمْ أَنَّ الْمَاءَ قِسْمَةٌ بَيْنَهُمْ كُلُّ شِرْبٍ مُّحْتَضَرٌ ﴿٢٨﴾ فَنَادَوْا صَاحِبَهُمْ فَتَعَاطَىٰ فَعَقَرَ ﴿٢٩﴾ ﴾ القمر (٢٣-٢٩) واتە ﴿ثەمودیش هەموو بێدارکردنەوەوداچڵەکاندنێکیان بەدرۆزانی و بڕوایان پێی نەبوو. جاوتیان: باشە ڕەوایە، ئێمە شوێنی تاکە کەسێك بکەوین لەخۆمان ؟!، ئێمە ئەگەر بڕوابەکەسێکی وابکەین ئەوکاتەئێمە بەڕاستی لەگومڕایی وشێتیدایین ؟!ئایا ڕاستە لەنێوان ئێمەدا وەحی ونیگابۆئەوڕەوانەکرابێت، نەخێرشتی وانابێت، بەڵکوئەوهەرکابرایەکی زۆردرۆزن وخۆپەرستە وحەزبەگەورەیی دەکات،اسبەی

دەزانن و بڕیان دەردەکەوێت کەکێ درۆزن وخۆپەرست وخۆبەگەورەزانە بێگومان ئێمە ئەو وشترەی کەبیانوویان گرت، لەبەردپەیدامان کرد، بەوەش تاقیمان کردنەوە، جا ئەی سالح چاودێریان بکە، بزانە چی دەکەن، خۆگروئارامگریش بە (لەبەرامبەرکاروکردەوەی ناشرینیانەوە). هەواڵیشیان بدەرێ : کەئاوەکە بەشکراوە (ڕۆژێك بۆ ئەوان و مالاتەکەیان، ڕۆژێکیش بۆ وشترەکە) ئیتر لەرۆژی نۆبەی وشترەکەدا هەموو بەکارهێنانێکی ئاوەکە قەدەغەیە لەوان. (قەومی نالەبار لەتاقی کردنەوەکەدا سەرنەکەوتن و خۆیان بۆ نەگیرا لەبەر ئەوە) بانگی زەلامێکی دڕیان کردوو هانیاندا بۆ سەر بڕینی، ئەویش بێ باکانە پەلاماری شمشێری داو سەری بڕی﴾. ئەم گەلە ڕاستەوخۆ ڕووبەڕووی تەوەستانەوە بەسزادانی لەدوای ئەوەی نەنجامیان دا، کاتێك سەرکەشیان کردو خۆیان بە گەورە دانا هەستان بە هێرش کردنە سەر حەزرەتی سالح (سەلامی خوای لێ بێت) ئەویش بە بەر پەرچ دانەوەی بانگەوازەکەی و تۆمەتبار کردنی بەوەی کە درۆزنەو درۆ دەکات ﴿ فَعَقَرُوا النَّاقَةَ وَعَتَوْا عَنْ أَمْرِ رَبِّهِمْ وَقَالُوا يَا صَالِحُ ائْتِنَا بِمَا تَعِدُنَا إِن كُنتَ مِنَ الْمُرْسَلِينَ ﴿٧٧﴾ ﴾ الأعراف (٧٧) واتە ﴿یەکسەر (چوون) وشترەکەیان سەر بڕی و لەفەرمانی پەروەردگاریان یاخی بوون و وتیان ئەی سالح ئەگەر تۆ لە پێغەمبەرانیت ئادەی ئەو هەڕەشانەی کە لێمان دەکەیت بۆمان پێش بهێنە﴾. خوای گەورەش هەموو نەخشەو پیلانەکانی بێباوەڕانی پوچەڵ کردەوە، حەزرەتی سالح یشی ڕزگار کرد کەبەنیاز بوون خراپەی بەرامبەر بکەن...

دوای ئەوەی حەزرەتی سالح (سەلامی خوای لێ بێت) هەموو هۆکارو ڕێ و شوێنەکانی گەیاندنی پەیامەکەی جێ بەجێ کرد، وەگەلەکەشی لەبەرامبەریدا وەلامیان نەدایەوەو ڕووبەڕووی دە بونەوەو ملەجەڕەیان دەکرد، حەزرەتی سالح (سەلامی خوای لێ بێت) هەواڵی ئەوەی پێدان کەدوای سێ ڕۆژی تر تووشی سزای

خوایی دەبن و تیادەچن، ﴿ فَعَقَرُوهَا فَقَالَ تَمَتَّعُوا۟ فِى دَارِكُمْ ثَلَٰثَةَ أَيَّامٍ ذَٰلِكَ وَعْدٌ غَيْرُ مَكْذُوبٍ ﴿٦٥﴾ ﴾ هود (٦٥) واتە : ﴿یەکسەرچوون سەریان بڕی، جا (سالح) یش پێی وتن: ڕابوێرن لەماڵ ومەنزڵی خۆتاندابۆماوەی سێ ڕۆژ، (دوای ئەو ماوە دیاری کراوە تیادەچن) و ئەوەش پەیمانێکە هەرگیز بەدرۆناخرێتەوە.﴾. وەهەرواش بوو دوای سێ ڕۆژ خوای گەورە سزاکەی نارد بۆ سەرئەم هۆزو نەتەوەیەولەناوی بردن وەك خوای گەورەش لەقورئاندا بۆمان باس دەکات و دەفەرموێت : ﴿ وَأَخَذَ ٱلَّذِينَ ظَلَمُوا۟ ٱلصَّيْحَةُ فَأَصْبَحُوا۟ فِى دِيَٰرِهِمْ جَٰثِمِينَ ﴿٦٧﴾ كَأَن لَّمْ يَغْنَوْا۟ فِيهَآ ۗ أَلَآ إِنَّ ثَمُودَا۟ كَفَرُوا۟ رَبَّهُمْ ۗ أَلَا بُعْدًا لِّثَمُودَ ﴿٦٨﴾ ﴾ هود (٦٧-٦٨) واتە : ﴿جائەو دەنگەسامناکەی بووە هۆی تیا چوونیان هەموو ئەوانەی گرت کە تاوان و ستەمیان کردوو فەرمان بەرداری پەروەردگاریان نەبوون، سەرەنجام هەموویان لە شوێنەکانی خۆیاندا کەوتن بەڕووی زەویدا و تیاچوون لەبەرە بەیاندا... وەك ئەوەی کەهەر لەو شوێنەدا نەبووبن و تیایدا نەژیابن، ئاگاداربن بەڕاستی هۆزی ثەمود بێ بڕوا بوون بە پەروەدگاریان و بێ وەفا بوون بەرامبەری، ئاگاداربن بڕیاری دووری لەبەزەیی خوا، درا بەهۆزی ثەمودیش﴾.

## پاشماوە دۆزراوەکانی گەلی ثەموود

لەنێو ئەوگەلانەی کە قورئانی پیرۆز باسی لێوە کردوون ئەوگەل و نەتەوانەن کە ئەمڕۆ زانیاری زۆریان لەبارەوە دەزانین، تۆمارە مێژوویەکان ئەوەیان سەلماندووە کەگەلی ثەموود لەیەکێك لەسەردەمەکاندا بوونیان هەبووە. پێیان وایە کە (أصحاب الحجر) کەلە قورئاندا باس کراوە گەلی ثەموود بێت، وەلەڕاستیدا قورئانی پیرۆز بەو ناوەی تریەوە ناوی هێناون کە (أصحاب الحجر) ە. چونکە ئەم

شاره یەکێکە لەو شارانەی کە ئەو گەلە دژزیویەتیەوە، وەهەروەها ئەو وەسفە جوغرافیە ئیغریقیەی کە بلینی بۆ ئەم شوێنەی کردووە هاوڕایە لەگەڵیدا، بلینی نوسیویەتی کە (دوماثا) وە (هجرا) ئەو دوو ناوچەیەن کەگەلی ثەموودی تێدا نیشتە جێ بوون، وەئەم دواینەش ئەوەیانە کەشاری (حجر)ی دروست کردووە کە ئەمڕۆدەناسرێت [1]. وەکۆنترینی سەرچاوەکۆنەکان کە ئاماژە بە ثەموود دەکەن تۆمارە مێژووییەکانی (نەسر) ە لەسەردەمی سیرجیونی دووەمی پاشای بابلی لە (سەدەی هەشتەمی پێش زایندا) کە ئەوگەلە لە یەکێك لەشالاوەکانیدا بۆسەر باکووری دوورگەی عەرەبی ڕووخا، هەروەك ئیغریقیەکانیش ئاماژەی پێ دەکەن کە ئەوانە ((تامودی)) ین واتە : ثەموودن کەلە کتێبەکانی ئەرستۆ و بتولمی و بلینی دا هاتوون [2]. ئەوەی ڕاستی بێت ئەم گەلە بەرلەهاتنی پێغەمبەری ئیسلام موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) بەتەواوەتی نەمان ئەویش لەسالانی (٤٠٠ – ٦٠٠) زاینیدا. خوای گەورە لەقورئاندا باسی عاد وثەموود بەیەکەوە دەبەستێتەوە، بەڵکو تەنانەت عاد بەبیری ثە موودا دەهێنێتەوە و فەرمانیشیان پێ دەکات کە پەندوئامۆژگاریان لێ وەربگرن، ئەمە ئەوە دەگەیێنێت کە گەلی ثە موود زانیاری تەواوی هەبووە دەربارەی گەلی عاد. خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿

وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَالِحًا ۗ قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُ ۖ قَدْ جَاءَتْكُم بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ هَٰذِهِ نَاقَةُ اللَّهِ لَكُمْ آيَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِي أَرْضِ اللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ وَاذْكُرُوا إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَاءَ مِن بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِي الْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا

---

[1] فيليب هيتى ، تاريخ العرب ، لندن : ماكميلان ، ١٩٧٩صفحة ٣٧

[2] (ثمود) دائرة المعارف البريطانية الصغيرة

وَتَنۡحِتُونَ ٱلۡجِبَالَ بُيُوتٗاۖ فَٱذۡكُرُوٓاْ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾ الأعراف (٧٣-٧٤) واته : ﴿بۆسەرقەومی ثەمودیش سالحی برایمان نارد (ئەویش پێی وتن : ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن چونکە جگەلە و خوایەکی ترتان نیە، ئەوەتا بەڕاستی موعجیزەی ئاشکراتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، ئەمە وشترێکە لەلایەن خواوە بەتایبەت بۆ ئێوەی بەدی هێناوە (لەسەر داخوازی خۆتان) کە موعجیزەیەکی ئاشکرایە، وازی لێ بهێنن بابلەوەڕێت لەزەوی خوادا و دەست درێژی مەکەنە سەری ئازاری مەدەن (چونکە هەرئازارتاندا) سزاو بەلایەکی بە ئێش و ئازار داوێن گیرتان دەبێت. یادی ئەوکاتەش بکەنەوە کە خوا ئێوەی کردە جێ نشین لەدوای قەومی عاد، ژیانی لەسەرزەویدا بۆ ئاسان کردن، لەدەشتەکاندا کۆشك و تەلار دروست دەکەن، لەشاخ و کێوەکانیشدا ژوور دادەتاشن، کەواتە یادی ناز و نیعمەتەکانی خوا بکەن و تۆوی خراپە و فەسادو گوناه لەسەر زەویدا مەچێنن﴾. لەم ئایەتەدا ئەوە فێردەبین کە گەلی (ثەمود) پەیوەندی هەبووە بەگەلی (عاد) ، وەپێدەچێت گەلی عاد بەشێك بوو بێت لەمێژووی شارستانیەتی گەلی ثەمود، وەحەزرەتی سالح (سەلامی خوای لێ بێت) هەمیشە ئامۆژگاری گەلەکەی بەوە دەکرد کەپەندو ئامۆژگاری لەگەلی عاد وەر بگرن.




ئـــــەو هەلكۆڵـــــەرو لێكۆڵینەوانەی کە لـەئۆبـاردا ئەنجامــدراون، پاشمــاوەی شــارەکەی پێــشاندا کــە لـەقولایی چـەند مـەترێك لــەوە دەرکــەوتوە، ئــەوەی ڕاستی بێـت لـەم کارەسـاتە لماوییــە دەتوانێــت ببێتــە هۆکاری کەلەکەبووی برێکی گــەورەی لم لەماوەیــەکی زۆر کورتــدا، وەئەمــەش دەکرێت بەشێوازێکی چاوەڕوان نەکراو لە پرێکدا ڕویدابێ

عاد هەواڵی گەلەکەی (نوح) ی دا بەقەومەکەی کەلەپێش خۆیاندا ژیاون، هەروەك چۆن پەیوەندیەکی مێژووی گرنگ لەنێوان (عاد) و(**ثە موود**) دا هەبووە، بەوشێوەیەش پەیوەندی مێژووی لەنێوان گەلی نوح وگەلی عاد یشدا هەبوە، ئەم گەل و نەتەوانە ئاشنا بوون بەیەکتری وەڕەنگەزنجیرەیان لە یەك وەچەو و نەژادیش بوبێت. لەگەڵ ئەوەی لەڕووی جوگرافیەوە عاد و **ثە**موود لەیەکەوە دوورن، لەبەر ئەوە ڕەنگە لەیەکەمین بینینیاندا پەیوەندی ڕاستەوخۆ لەنێوانیاندا نەبووبێت، کەواتە ئەی بۆچی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز باسی **ثە**موود و عاد بەیەکەوە گرێ دەدات ؟. بەکەمێك بیر کردنەوە وەلامێکی ئاشکراو ڕوونمان بۆ دەرەکەوێت ماوەی دووری نێوان ئەم دوو گەلە لەڕووی جوگرافیەوە خەیاڵیە، لەڕووی مێژووییەوە سەرچاوە مێژووییەکان ئەوەیان دەرخستووە کە پەیوەندیەکی زۆر بەهێز لەنێوان (**ثە**موود ) و (عاد ) دا هەبووە،گەلی **ثە**موود گەلی عادی ناسیوە چونکە ئەم دووگەلە زۆرترین گومان وایە کە لەیەك سەرچاوە و بنەڕەتەوە هاتبن لەژێر ناونیشانی (**ثە**موود )دا ئینسکلۆپیدیای بەریتانی نوسیویەتی : هۆزە کۆنەکانی

دوورگەی عەرەبی کە ڕەنگە لە هۆزە بەناوبانگەکان بن، لەگەڵ ئەوەی بنەڕەتی ثەموودلەباشوری دوورگەی عەرەبیدایە، لەڕاستیدا کۆمەڵێك لەو هۆزانە لە مێژوویەکی نزیکدا بەرەو باکوور گواستیانەوە و لەلێژیەکانی کێوی (ئەثلەب) دا نۆقرەیان گرت، وەگەلی ثەموود یش کەلەنێوانی شام و حیجاز دا ژیاون لەژێر ناوی (أصحاب الحجر) دا دەناسران، وەهەڵکۆڵەرە شوێنەوارناسەکانی نوسینە بەردینەکان و وێنە گەورەکانی ثەموود یان دۆزیوەتەوە نەك تەنها لەکێوی (ئەثلەب) دا، بەڵکو تەنانەت لەناوەڕاستی دوورگەی عەرەبیشدابەهەمان شێوە دۆزیویانەتەوە [1]. وەئەو دەسنوسانەی کە هاوشێوەی پیتەکانی ئەبجەدی ثەموودن لەباشووری دوورگەی عەرەبی دۆزرانەوە هەروەها لەباکوریشەوە زۆرە و حیجاز بەهەمان شێوە دۆزرانەوە [2].لە سەرەتاوە لەباکوری ناوەڕاستی یەمەندا چەند دەسنوسێکی دیکە دۆزرانەوە کەبە ثەموود ناسراو بوون وەپەیوەست بوون بەبەشی لای باکوورییەوە، وەلەلای باشوریشەوەپەیوەست بوون بەحەضرەمەوتەوە، وەلای ڕۆژئاواشیەوە پەیوەست بوون بە (شەبوە) وە. پێش ئەوەی سەیری شوێنەواری گەلی عاد بکەین لەباکووری دوورگەکەوە، ئەوە زۆر ڕوون بوو کەگەلی ثەموود لەناوچەی عاد دا نیشتەجێ بووبن، وەبەتایبەتیش لەناوچەی حەضرەمەوت داکەپایتەختی نەوەکانی عادە، ئەم پەیوەندیەش کەلە نێوان عاد و ثەموود هەبوو قورئانی پیرۆز زۆربەجوانی بۆمان ڕۆشن دەکاتەوە کەلەو ماوەدا سالح (سەلامی خوای لێ بێت) لەگەڵ گەلەکەیدا دەدواکەئەمان جێگەی ئەوانیان گرتوەتەوە : وَإِلَىٰ ثَمُودَ أَخَاهُمْ صَٰلِحًا ۚ قَالَ يَٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ قَدْ جَآءَتْكُم

[1] بريان دو، جنوب الجزيرة العربية ، تيمس و هدسون ١٩٧١، الصفحات ٢١، ٢٢
[2] إيرنست غومبريتش ، عن الاصل ألالماني (أساطير الشعوب لليافعين) ١٩٩٧ ، صفحة ٢٥

بَيِّنَةٌ مِّن رَّبِّكُمْ ۖ هَٰذِهِۦ نَاقَةُ ٱللَّهِ لَكُمْ ءَايَةً ۖ فَذَرُوهَا تَأْكُلْ فِىٓ أَرْضِ ٱللَّهِ ۖ وَلَا تَمَسُّوهَا بِسُوٓءٍ فَيَأْخُذَكُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ ﴿٧٣﴾ وَٱذْكُرُوٓا۟ إِذْ جَعَلَكُمْ خُلَفَآءَ مِنۢ بَعْدِ عَادٍ وَبَوَّأَكُمْ فِى ٱلْأَرْضِ تَتَّخِذُونَ مِن سُهُولِهَا قُصُورًا وَتَنْحِتُونَ ٱلْجِبَالَ بُيُوتًا ۖ فَٱذْكُرُوٓا۟ ءَالَآءَ ٱللَّهِ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٧٤﴾ **الأعراف (٧٣-٧٤)** واتە:﴿بۆسەرقەومی

**ثەمودیش سالحی برایمان نارد (ئەویش پێی وتن : ئەی گەلەکەم خوا بپەرستن چونکە جگەلە و خوایەکی ترتان نیە، ئەوەتا بەڕاستی موعجیزەی ئاشکراتان لەلایەن پەروەردگارتانەوە بۆ هاتووە، ئەمە وشترێکە لەلایەن خواوە بەتایبەت بۆ ئێوەی بەدی هێناوە (لەسەر داخوازی خۆتان) کە موعجیزەیەکی ئاشکرایە، وازی لێ بهێنن بابلەوەڕێت لەزەوی خوادا و دەست درێژی مەکەنە سەرو ئازاری مەدەن (چونکە هەرئازارتاندا) سزاو بەڵایەکی بە ئێش و ئازار داوێن گیرتان دەبێت. یادی ئەوکاتەش بکەنەوە کە خوا ئێوەی کردە جێ نشین لەدوای قەومی عاد، ژیانی لەسەرزەویدا بۆ ئاسان کردن، لەدەشتەکاندا کۆشك و تەلار دروست دەکەن، لەشاخ و کێوەکانیشدا ژوور دادەتاشن، کەواتە یادی نازو نیعمەتەکانی خوا بکەن و تۆوی خراپە و فەسادو گوناه لەسەر زەویدا مەچێنن﴾. لەڕاستیدا گەلی ثەموود باجی ئەوسەرکەشیەیان دا کە دواجار چارەنووسیان تیاچوون ولەناوچوون بوو، وەتەواوی کارگەو باڵەخانەکانیان وێران بوون و هیچ لەو شارستانیەتانەیان نەیان توانی ڕێگە لەسزای خوایی بگرن کەلە ئەنجامی ئەوڕێگەیەدا بوو کە گرتبوویانە بەرو دووچاری ئەو چارەنووسە ڕەشە هاتن کە خوای گەورە بۆی ناردن، بەم شێوەیەش گەل و نەتەوەکەی ثە موود بەسزای خوایی تیاچوون وە دووچاری تۆڵەی خوایی هاتن وەك**

چۆن دووچاری نەتەوە یاخی بووە کانی پێش خۆی و دوای خۆی هاتبوو کەلە
بەرنامەی پەروەردگار لایان دابووسەرکەش وگومڕاویاخی بوون لە خواوپەیامەکەی









ئەنبات کە هۆزێکی عەرەبی کۆن بوو، میرنشینێکیان لەدۆڵی ( رم )دا لەئوردن دروستکرد، لەم شوێنەدا کە لەهەمان کاتدا پێی دەوترا دۆڵی ( بترا ) ئەتوانی باشترین نمونەی هەڵکۆڵینی پەیکەری بەردین بدۆزیتەوە کە ئەوگەلە پێی هەستاوە، بەو شێوەیە هۆزی ثمود لەهونەری بیناسازیدا باسکراون، لەگەڵ ئەوەشدا ئەمڕۆ لەگەڵ ئەو هەموو هونەرانەدا کە هەیانبوو جگە لەو پاشماوانە هیچی تریان لێ نەماوەتەوە. وێنەکە ژمارەیەك پەیکەری بەردینی لەدۆڵی ( بەترا )دا پیشان دەدات

## بەشی شەشەم فیرعەونی نوقم بوو

خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿ كَدَأْبِ ءَالِ فِرْعَوْنَ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ كَذَّبُوا بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ فَأَهْلَكْنَٰهُم بِذُنُوبِهِمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَكُلٌّ كَانُوا ظَٰلِمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ **الأنفال** (٥٤) واتە : ﴿(ڕەوشتی ئەمانە) هەروەك و داب و نەریتی دارو دەستەی فیرعەون و ئەوانەی پێشیان وایە، كەبەڵگەو فەرمانەكانی پەروەردگاریان بەدرۆ دەزانی و باوەڕیان پێی نەبوو، لەئەنجامدا ئێمەش بەهۆی گوناھ و تاوانیانەوە لەناومان بردن و دارو دەستەی فیرعەونیشمان نوقمی دەریا كرد، هەموشیان ستەمكار بوون﴾. شارستانیەتی میسری كۆنیش وەك شارستانیەتی دۆڵی دوو ڕووبار بەناوبانگ بووە، بەوەی بەكۆنترین شارستانیەتێك دادەنرێت كەمێژووبەخۆیەوە بینیبێتی، وەلەڕاستیدارژێمێكی كۆمەلایەتی پێشكەوتوویان هەبووە كەوای كردوە پێشكەوتووترین ولات بێت لەو سەردەمەدا، وەچەند هۆكارو پاڵنەرێك هەبوون بۆ بەرەو پێش بردنی ئەم شارستانیەتە، وەك دۆزینەوەی نوسین و بەكار هێنانی لەهەزارەی سێهەمی پێش زایندا و لەگەڵ وەبەرهێنانی ئاوی نیل دا، وەهەروەها ڕووە جوگرافیەكەشی زامنی سنوورە سروشتیەكەی كردبوو لە مەترسی شالاوە دەرەكیەكان. ئەم كۆمەڵگا پێشكەوتووە وەچەو نەژادی فیرعەونیەكان بەڕێوەیان دەبرد، وەلەو دەمەدارژێمێكی بێ باوەڕیان پیادە دەكرد كە بەفەرمانبەرداری فیرعەونیەكان ناسرابوو، وەك چۆن قورئانی پیرۆز بۆمان دەگێڕێتەوە، وەفیرعەونیەكان لەخۆیان بایی بوو بوون، نكوڵی خوای گەورەیان دەكرد و پشتیان كردبووە خوای گەورە، بەلام دواجار هیچ لەو هێزو شارستانیەتە گەورەیان و هاوكات لەگەڵ هێزی سەربازیشیاندا سودی نەبوو لەبەرامبەر ئەو تیاچوونەیاندا.

# دەسەڵاتی فیرعەونیەکان

شارستانیەتی فیرعەونیەکان لەسەر پیت و بەرەکەتی ڕووباری نیل نیشتەجێ بوون، وەلەڕاستیدا هۆکاری ئەوەی کە میسریەکان لەسەر دۆڵی نیل دا دامەزرا بوون زۆری ئاوی ئەم ڕووبارە بووە کە دەیانتوانی کشتوکاڵ فەراهەم بهێنن ئەویش بەهۆی ئەو ئاوەی نیلەوە بوو کە فەراهەم هاتبوو بژیان بەبێ ئەوەی پشت بە وەرزی بارانی ساڵانە ببەستن. مێژوو نوس (ئێر نست کومبرج، Ernest Gombrich) سەبارەت بەم بابەتە دەڵێ : کەش و هەوای ئەفریقا ووشك و گەرمەو، تەنانەت چەند مانگ بەدوای یەکدا لەم ناوچەیەدا باران نابارێت، لەبەر ئەمەشە کەچەند ناوچەیەك لەم کیشوەرە گەورەیەدا ووشك دەبێتەوە، وەئەم ناوچانەش کەبە بیابانی فراوان داپۆشراون، هەروەها دووتەپۆلکەکەی نیل زیاترکەشی بیابانی بەسەرەوەیەو باران بارانیش لەوناوچەیەداکەمە، لەگەڵ ئەوەی کەلەم ناوچەیەدا باران گرنگیەکی ئەو تۆی نیە، چونکە ڕووباری نیل بە ناوەڕاستیدا تێپەڕ دەبێت هەرلەسەرەتاوە تاکۆتاییەکەی [1]. وەبەم شێوازە هەرکەس بتوانێ دەسەڵات لەنیل دا بگرێتە دەست دەتوانێ دەست بەسەر سەرچاوە سەرەکیەکاندا بگرێت کەمیسر دەبات بەڕێوە، وەگرنگترینیان بازرگانی و کشتوکاڵیە، وەبەم ڕێگەیەش فیرعەونیەکان دەسەڵاتیان بەسەر میسردا فراوان کرد.

پێکهاتەی تەنك و تاسۆیی دۆڵی نیل ڕێی نەدەدا بە نیشتەجێ بوونی کۆمەڵگای گەورە، لەبەر ئەوە کۆمەڵگای میسری لەبری ئەوەی لەشارە گەورەکاندا نیشتەجێ بن لەناو گوندوو شارە بچووکەکاندا دەژیان، وەئەمەش لەڕاستیدا تواناو دەسەڵاتی فیرعەونیەکانی زیاتر کرد بەسەر میسروخەڵکەکەیدا. (منسا) ی پاشا کەیەکەمین

---

[1] ایرنست غومبريتش ، قصة الأدب ، لندن ، MCML ، مطابع فايدون ، صفحة ٤٢

فیرعەونی میسری بوو بۆ یەکەمین جار لەمێژوودا توانی میسری کۆن یەکبخات، وەبیکاتە یەك دەوڵەت ئەویش لەهەزارەی سێهەمی پێش زایندا بوو، وەلەڕاستیدا ووشەی (فیرعەون) بەڵگەیە لەسەر ئەو شوێنەی کەپاشای میسری تێدا دەژیا، وەبە تێپەڕبوونی کات ئەم ووشەیە بوویە نازناوی پاشای میسر، وەنەوەی پاشاکانیش یەك لە دوای یەك ئەم ووشەیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە و بەو شێوەیە بە فیرعەونیەکان ناسران. وەهەر بەو پێیەی کە خاوەنی ولات و دەسەلاتداربوون بەسەرهاولاتیانیدا، قایل بوون بەوەی کە ڕەنگدانەوەی خوایەکی گەورەیە لەناریاندا کەئەو بیروباوەڕەش میسریە موشریك و لادەرەکان نوێنەرایەتی دەکرد، وەهەروەها تەواوی ولاتیش هەرلە زەویە کشتوکاڵیەکان و داهات و دەستکەوتە بازرگانیەکان و بەرهەمە ناوخۆییەکانیش لە چوار چێوەی بەرژەوەندیەکانی فیرعەون دا دەسوڕایەوە، دەتوانین بەکورتی ئەوە بلێین کە تێکڕای ولات لەژێر چنگی فیرعەونەکاندا بوو، لەڕاستیدا ڕژێمی زۆرداری ڕێگەی بۆ فیرعەون خۆش کردبوو تاوەکوو دەسەلات لەولات دا بەهێز بەرقەرار بکات، بەشێوەیەك هەرچیەکی بویستایە جێ بە جێی دەکرد. لەسەرەتای دامەزراندنی یەکەمین وەچەو نەژادی فیرعەونیەکاندا هەستان بەدابەشکردنی ئاوی ڕووباری نیل بەسەر تەواوی ئەو خەلکەدا، وە کاتێك (منسا) ی پاشا هەستا بەیەکخستنی هەردوو میسری باشوور و باکوور، لەبەرامبەر ئەوەدا هەرچی بەرهەمیان هەبوو بۆ بەرژەوەندیەکانی فیرعەون کۆدەکرانەوە، وەتێکڕای بەرهەمەکان کە هەیان بوو دەدرایە دەستی فیرعەون، ئەوسا فیرعەونیش هەڵدەستا بەدابەش کردنی ئەم بەروبوومە بەسەر گەلەکەیدا بەپێی پێویستیەکانیان، ئەوەی ڕاستی بێت ئەم پاشایانە کەئەم هەموو هێزەیان لەولاتدا دروست کردوە هەرگیز ئەوەیان لەلاناڕەحەت نەبوو کە خەڵکی بکەنە بەندە، ئەگەر سەیرێکی پاشای میسر بکەین یاخود فیرعەونەکان کەلەم دواییانەدائەوناوەیان لێنرا، ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کەخۆیان بەپیرۆز داناوە و

گوایا توانای تەواویان هەیەو پێویستیەکانی خەڵکیش ئامادە دەکەن، وەلەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا ناوی فیرعەونەکان... لەبیرو بۆچوونی خەڵکەکەدا گۆڕا بۆ خوای ڕاستەقینەیان، وەهەندێ وشەش کەفیرعەون بەکاری دەهێنا کاتێك وتووێژی لەگەڵ حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەرکرد، ئەوەی سەلماند کەئەم بیروباوەڕەی هەبووە، ئەوەتا خوای گەورە لەقورئانی پیرۆزدا بۆمانی دەگێڕێتەوە : ﴿ قَالَ لَئِنِ ٱتَّخَذۡتَ إِلَٰهًا غَيۡرِي لَأَجۡعَلَنَّكَ مِنَ ٱلۡمَسۡجُونِينَ ﴿٢٩﴾ ﴾ **الشعراء** (٢٩) واتە :﴿فیرعەون سوێندی خواردوو وتی:ئەگەر جگەلەمن کەسێکی ترکەیتە خوای خۆت و فەرمانبەرداری بیت،ئەوەت خەمە ڕیزی بەندکراوەکانەوە و زیندانیت دەکەم﴾.

وەفیرعەون کاتێك لەگەڵ گەلەکەیدا دەدواپێی دەوتن :﴿ وَقَالَ فِرۡعَوۡنُ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡمَلَأُ مَا عَلِمۡتُ لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرِي فَأَوۡقِدۡ لِي يَٰهَٰمَٰنُ عَلَى ٱلطِّينِ فَٱجۡعَل لِّي صَرۡحًا لَّعَلِّيٓ أَطَّلِعُ إِلَىٰٓ إِلَٰهِ مُوسَىٰ وَإِنِّي لَأَظُنُّهُۥ مِنَ ٱلۡكَٰذِبِينَ ﴿٣٨﴾ ﴾ **القصص** (٣٨) واتە:﴿فیرعەون سەرکەشانە وتی : ئەی خەڵکینە من کەسی تر شك نابەم کەشایستە بێت بەوەی کە خواتان بێت جگە لەخۆم، ئەی هامان تۆ لەگەڵ خشتی سورەوەکراوم بۆ دروست بکەو قەڵایەکی بەرزو پتەوم بۆبیینابکە بەڵکو پیایدا سەربکەوم، تاخوای موسا ببینم، هەرچەندە من بەڕاستی بڕوام وایە لەڕیزی درۆزنەکاندایە... !!﴾.

## بیرو باوەڕە ئاینیەکان

مێژوونوسی ئیغریقی هیرودوتس دەڵێ میسریە کۆنەکان لەوسەردەمەدا پارێزگارترین خەڵکانێك بوون لە جیهانی ئەوکاتەدا، لەگەڵ ئەوەی کە ئاینەکەیان ئاینێکی ڕاست و دروست نەبوو، بەڵکو هاوبەشیان بۆ خوای تاقانە بڕیار دابوو، وەبەهۆی دەمارگیری خۆشیانەوە پابەند بوون بەئاینەلادەرەکەیانەوەو وابستەی

بووبوون پێیەوە. وەمیسریە کۆنەکان زۆر کاریگەر بوون بەو ژینگە سروشتیەوە کەتیایدادەژیان، وەلەهەمان کاتیشدا سروشتی جوگرافی ولاتەکەشیان بەری لەهەموو هێرشێکی دەرەکی گرتبووبۆسەریان، وەلەهەموو لایەکیشەوە میسریە بیابان و شاخ و دەریا دەورە درابوو، هیچ هێرشێکی نەیار نەیدەتوانی هێرشیان بکاتە سەر جگە لەدوو ڕێگاوە نەبێت کە خۆیان دەیانتوانی بەئاسانی دەستیان بەسەردا بگرن، وەلەبەرئەم سروشتە جوگرافیەی کە هەیبوو میسر بە ڕووی جیهانی دەرەوەدا دابڕاوبوو، وە ئەم دابڕانەش بەتێپەڕ بوونی کات گۆڕا بۆ دەمار گیریەکی کوێرانە.

وەبەم شێوەیەش ڕێنمایەکی تایبەتی پارێزەر بەسەرهەرگۆڕانکاریەکدا دروست بوو بوو داخراوە هەر ڕوناککردنەوەیەك، چونکە ئەوان گەلێك بوون بۆپاسای ژیانیان تەنها ئاینەکەیان بەڕێوەبەربوو، وەبەو شێوەی کە قورئانی پیرۆز باسمان بۆ دەکات ئاینی باوو باپیرانیان بەنرخترین شت بوو لەلایان. لەبەرئەمە فیرعەون و شوێنکەوتوانی بەم شێوەیە پشتیان کردە موساو هارون وبانگەوازەکەیان (سەلامی خوایان لێ بێت) کاتێك بانگهێشتیان کردن بۆسەر ئاینی ڕاست و دروست :

﴿ قَالُوٓاْ أَجِئْتَنَا لِتَلْفِتَنَا عَمَّا وَجَدْنَا عَلَيْهِ ءَابَآءَنَا وَتَكُونَ لَكُمَا ٱلْكِبْرِيَآءُ فِى ٱلْأَرْضِ وَمَا نَحْنُ لَكُمَا بِمُؤْمِنِينَ ﴿٧٨﴾ ﴾ یونس (٧٨) واتە : ﴿(فیرعەون و دارو دەستەی) وتیان : باشە تۆ بۆ ئەوە هاتویت کەوێڵمان بکەیت لەو بیرو باوەڕ و بەرنامەیەی کەباووباپیرانمان لەسەری بوون و لەوانەوە بۆ ئێمە ماوەتەوە ؟ (ئایا بەم ڕێبازە) دەتانەوێت دەسەلات داری و گەورەیی بۆ خۆتان لەسەر زەویدا بەدەست بهێنن ؟! ئێمە بڕواتان پێناکەین !!﴾



شوێنکەوتە ئاینیەکان لەمیسردا بەشێوەیەکی سەرەکی خۆیان بۆ خزمەتی خواکانیان تەرخان کردبوو، لەنێوان شوێنکەوتوان خواکاندا جادووگەران و کاهینەکان هەبوون، کە ڕێبەری کۆمەڵگا بوون، ئەم جادووگەرو کاهینانە چینێکی کۆمەڵایەتی گرنگیان دروست دەکرد بەو پێیەی کە جادوو دەکەن، وە فیرعەونەکانیش بەکاریان دەهێنان بۆ ئەوەی خەڵکی لەژێر سایەیاندا بمێننەوە.

ئاینی میسریە کۆنەکان دابەش دەکرا بە دوو بەشەوە : بەشێکی سەرەکی تایبەت بوو بەدەوڵەتەوە، بەشەکەی تریشیان بەدوای بیروباوەڕی خەڵکیدا دەگەڕا سەبارەت بەژیان لەدوای مردنەوە، ئەو بیروباوەڕە ئاینیەی کەتایبەتە بەدەوڵەتەوە پێیان وایە کە فیرعەون بە توانایەو پیرۆزە، وەهەروەها ڕەنگدانەوەی خواکانە لەسەر زەویدا بۆ ئەوەی دادپەروەری و پارێزگاری بۆخەڵکی بەرپا بکات تیایدا. لەڕاستیدا ئەو بیرو باوەڕانەی کەلەناو خەڵکیدا بلاوەیان کرد بوو لەوپەڕی ئاڵۆزیدا بوون، وەئەو بڕگە ئاینیانەی کەنەیاربوون لەگەڵ ئاینی سەرەکی دەوڵەتدا بەچەند دادێکی فیرعەونی ڕەت دەکرانەوە، بە شێوەیەکی سەرەکی ئاینەکەیان لەسەرپڕوابوون بەفرە خوایی دامەزرابوو، وە زۆرجار وادەبێت ئەم فرە خواییە لەسەر شێوازی پەیکەری لاشەیەکی مرۆڤ بێت و سەری ئاژەڵی پێوەبێت. بەڵام بەهەمان شێوە دەتوانرێت بەو داب و نەریتە ناوخۆییانەی کەلە ناوچەیەکەوە بۆ ناوچەیەکی تر جیاوازن ئاشنابین.

بەشێکی گەورە لە بیروباوەڕی میسریەکان لەسەرئەوەیە کە زیندوبوونەوەو ژیان لەدوای مردنەوە هەیە، ئەوانە بڕوایان وایە کەلە دوای ئەوەی لاشەدەمرێت ڕۆح سەرلەنوێ بەژیاندا دەچێتەوە، وەبەپێی ئەم بیروباوەڕەش فریشتەکان ڕۆحی مردووەکان هەڵدەگرن بەرەو لای خوای دادگەر، وەلەلای تەنیشتی ئەو خوایەشەوە چل و دوو دادوەر هەن،وە ترازوییەك لەناوەڕاست دا دادەنرێت و دڵی ڕۆحەکەش لەم ترازووەدا دەکێشرێت، جائەو کاتە ئەو ڕۆحانەی کە چاکەکاری زۆریان هەڵگرتووە دەبرێنەشوێنێکی جوان،و قەشەنگ و لەژیانێکی بەختەوەریدا بەئاسودەیی ژیان دەگوزەرێنن، وەئەوانەی کەخراپەو ناپەسەندیان لەچاکەزیاترە دەبرێن بەرەو جێگایەك کە سزای جۆراو جۆری تێدا دەچێژن،وە لەو جێگایەشدا لەلایەن دڕندەیەکەوە بەناوی (خۆرەی مردووەکان) بۆ هەمیشەیی لەژێر ئەوسزایەدا دەمێننەوە. بیروباوەڕە کۆنەکانی میسر دەربارەی ڕۆژی دوایی لەگەڵ ئاینی یەکتاپەرستیدا یەکدەگرنەوە، وەلەڕاستیدا ئەم بیروباوەڕەش بەسە بۆ ئەوەی ببێتە بەڵگە کەئاینی یەکتاپەرستی گەیشتووە بە شارستانیەتی میسریە کۆنەکان، بەڵام دواجار ئەم ئاینە خراپ کراو یەکتا پەرستی گۆڕا بۆ فرە خوایی، وەبەم تازەییە ئەوە ئاشکرا بووە کە چەند پێغەمبەرێك بەدوای یەکدا بۆ میسر لەلایەن خوای گەورەوە ڕەوانەکراوە کەبانگی دانیشتوانی میسریان کردووە بۆ سەر یەکتاپەرستی خوای گەورە و بەندایەتی بۆ کردنی. هەروەك چۆن بۆ تێکڕای خەڵکی سەرزەویش پێغەمبەر ڕەوانە کراوە لەکاتێکەوە بۆ کاتێکی تر. نمونەی ئەو پێغەمبەرانەش حەزرەتی (یوسف) ە (سەلامی خوای لێ بێت) کە قورئانی پیرۆز بەدرێژی ئەو چیرۆکەمان بۆ دەگێڕێتەوە، وەچیرۆکی یوسف یش (سەلامی خوای لێ بێت) خۆی بۆ خۆی گرنگە، لەوەدا کەگەیشتنی نەوەی ئیسرائیل بۆ میسر و جێگیربوونیان لەو ناوچەیەدا لەخۆ دەگرێت. لەلایەکی تریشەوە هەندێ لەسەرچاوە مێژووییەکان باس لەوە دەکەن کە هەندێ لەمیسریەکان هەستاون بەبانگەشەکردن بۆ سەرئایینی

یەکتاپەرستی تەنانەت بەرلە حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت)، یەکێك لەوانەش کەبانگەشەی بۆ یەکتاپەرستی کردووە... (ئەمین حەوتەبی چوارەم) ە کە بە یەکێك لەو فیرعەونانە دادەنرێت کەزۆرتر گرنگی هەبووە لە مێژووی میسردا.

## ئەمین حەوتەبی چوارەم فیرعەونی یەکتاپەرست

بەشێوەیەکی گشتی فیرعەونەکانی میسر زۆردارو ستەم کارو شەڕەنگێزو دڕندە بوون، وەتایبەتمەندیەکی هاوبەشی ئەم فیرعەونانەش ئەوە بوو کەلەسەر ئاینی میسریەکان بوون کە بەئاینی هاوبەش دانان بۆخواوخۆکردن بەخوا بەناو بانگ بوو وەدەروونیشیان پێی ئاسودە بوو. بەلاَم تاکە فیرعەونێك لەمێژووی میسردا هەبوو کەجیاوازبوو لەفیرعەونەکانی دیکە ئەویش ئەم فیرعەونە بوو کەبەرگری لەو بیرو باوەڕە دەکرد کە دەبووت تەنها یەك بەدیهێنەر بپەرستن، وەبەم شێوەیەش بووە مایەی ئەوەی کەلەلایەن ئامۆنی خوایانەوە ڕووبەڕووی هێرشێکی توند ببێتەوە کەسوودیان لە بیروباوەڕی هاوبەش بۆخوادانان دەبینی، لەگەلَ هەندێ لەوسەربازانەش کەیارمەتیان دەدان، تادواجار ئەم فیرعەونەکوشرا... وەئەم فیرعەونەش (ئەمین حەوتەبی چوارەم بوو) کەلەسەدەی چواردەیەمی پێش زایندا دەسەلاَتی گرتە دەست، وەلەسالَی ١٣٧٥ پێش زاینیشدا ئەمین حەوتەبی پاشا تاجی پاشایەتی خرایە سەر، وەڕووبەڕووی ئەوداب و نەریتانە بوویەوە کەپارێزراو بۆماوەبوون بەر لەسەدەها سالَ، هەتا ئەو کاتەش پێکهاتەی کۆمەلَگاو پەیوەندیە گشتیەکانی لەگەلَ کۆشکدا بەبێ هیچ گۆڕانکاریەك دەڕۆشت، بەم شێوەیە کۆمەلَگا دەرگای بەڕووی هەموو ڕووداوە دەرەکی و تازە گەریە ئاینیەکاندا بەداخراوی مایەوە،گەشتیارە ئیغریقیەکان سەرنجی ئەم ڕۆچوونانەیان دا کەپێشتر باسمان لێوە کرد سەبارەت بەپاراستنی داب و نەریتە ئاینیەکان، فیرعەون پشت ئەستوور بەئاینی سەرەکی ئەوەی بەسەر خەلَکیدا سەپاندبوو کە دەبێت هەرچی

شتی کۆنەو باوە بەبێ هیچ کۆسپ و تەگەرەیەك وەربگیرێت، ئەمەوڕای ئەوەی کە ئەمین حەوتەب ئەم ئاینە سەرەکیەی پەسەند نەکردبوو ErnustH Gombrich ئێرنست غومبریتشی مێژوونوس نوسیویەتی : لەڕاستیدا (ئەمین حەوتەب) زۆرێك لەوداب و نەریتانەی شکاند کەلەلایەن داب و نەریتە کۆنەکانەوە پیرۆزکرابوو، وەهەروەها هیچ جۆرە پاڵپشتیەك یاخود سۆزێکی لەبەرامبەرملکەچ کردن بۆ زۆرێك لەو خوا نامۆیانەپێشکەش نەکرد کەگەلەکەی دەیانپەرست، وەتەنها خوایەکی تەنیای گەورە سەبارەت بەوبریتی بوولە (ئاتوون) کەلەسەر شێوازی خۆر وێناکرابوو وەناویشی لەخۆی نابوو (ئاخناتون)، وەکۆشکەکەشی لەقەشەو خواکانی تر دوور دەخستەوە و بردیە ناوچەیەکەوە کە ئێستا پێی دەڵێن (عەمارنە) [1] ئەمین حەوتەبی چوارەم لەدوای مردنی باوکی خرایە ژێر فشارێکی گەورەوە، وەهۆکاری ئەم فشارەش کە خرابوویە سەری ئەوەبوو کەبەردەوئاینی تازە ملی نا کەپشت بەیەکتاپەرستی دەبەستێت

وەلەهەوڵیشدایە بۆ گۆڕینی ئاینی میسری کەئاینی باو بوو لەوسەردەمەدا و وەهاوبەشیان دادەنا بۆ خوای تاك و تەنها، وە ئەمین حەوتەب هەوڵی زۆریدا گۆڕانی ڕیشەیی لە هەموو بوارەکاندا جێ بەجێ بکات، بەڵام دەسەڵاتدارانی تەیبە ڕێیان نەدا کە ئەو پەیامەی کە هەڵیگرتبوو بگوێزێتەوە بۆخەڵکی تر، لەبەرئەوە ئەمین حەوتەب و شوێنکەوتوانی شاری تەیبەیان جێ هێشت و بەرەو تەپۆلکەی (عەمارنە)

[1] إيلي برنافي،الأطلس التأريخ لليهود،لندن:هوتشينسون١٩٩٢،صفحة ٤(مصر) ، موسوعةجودايكا،المجلد٦،صفحة ١٠٨١و(الخروج والتية في سيناء)، المجلد٨،صفحة٥٧٥،عالم الأنجيل رقم٨٣تموز،أب١٩٨٣صفحة ٥٠ ، المعهدالشرقي للأخباررقم١٤٤،شتاء١٩٩٥،جاك ليغراند،تأريخ العالم،باريس:تأريخ لونغمان: SA، المطابع الدولية ،١٩٨٩،الصفحة٦٨ دافيد بن غوريون ،الأطلس التأريخ لليهود،نيويورك١٩٧٤،صفحة٣٢.

بەرێکەوتن، وەلەتەپۆلکەی (عەمارنە) دا شارێکی نوێ و هاوچەرخیان بۆ خۆیان دروست کرد، ناویشیان لێنا (ئەخ – آن – آتون) جگەلەوەی کە ئەمین حەوتەبی چوارەم ناوی خۆی گۆڕی کەوای دەگەیاند (ئاموون دڵنیا بکات) بۆ ئەخناتوون کەبەواتای (ملکەچ بوون بۆ ئاتوون) دێت، چونکە ناوی ئاموون لەوکاتەدا بەکاردەهێنرا بۆ گەورەترین پت لەبیرو باوەڕی میسریدا کەهاوبەشیان بۆ خوا بڕیار دەدا، بەلاّم سەبارەت بە ئەمین حەوتەب ئاتوون (بەدی هێنەری ئاسمانەکان و زەویە) کەهاو شێوەی ناوی خوایە. ئەم بارو دۆخە قەشەکانی ئاموونی شڵەژان لەبەرئەوە هەوڵی ئەوەیان دا کەدەستەلاّت لە ئاخناتوون بسەننەوە ئەویش بەبەکارهێنانی قەیرانی ئابوری لەناوچەکەدا، ئەوەبوو لەکۆتایدا ئەخناتوون بەدەستی پلان گێڕەکان ژەهرخوارد کراو کوژرا، بەم شێوەش فیرعەونەکان یەك لەدوای یەك لە ژێر کاریگەری قەشەکاندا مانەوە. دوابەدوای ئەخناتوونیش فیرعەونەکان کورسی دەسەلاّتیان لەمیسردا بە پاشینەیەکی سەربازی گرتە دەست، وەجارێکی تر بیرو باوەڕی کۆنی فرە خوایی لەمیسردا دەستەڵاتی پەیدا کردەوە، بۆ ئەوەی دوای ماندو بوونێکی زۆر کەلە پێناوی گەڕانەوە بۆ ڕابردوودا درا دەسەلاّتداری بگرێتە دەست، دوای ئەوەش بەنزیکەی یەك سەدە ڕەمسیسی دووەم گەیشتە دەسەلاّت، وەکورسی دەسەلاّتی لەمیسر دا گرتەدەست وەئەو دەسەلاّتەش بەدرێژترین ماوەی دەسەلاّت دادەنرێت لەمێژووی خۆیدا، بەپێی ووتەی هەندێ لە مێژوونوسان : ڕەمسیس ئەو فیرعەونەیە کەئەوەی ئیسرائیلی کردە بەندەی خۆی و لەگەڵ موساشدا (سەلامی خوای لێ بێت) دەجەنگی [1].

---

[1] www. plaguescape. com / a / plaguescape / ٢

# هاتنی حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت)

بەهۆی ئەو دەمارگیریە کوێرانەیەی کەمیسریەکان هەیان بوو ئامادەییان تێدا نەبوو کە دەستبەرداری بیرو باوەڕی بت پەرستیان بین، وەچەندجارێك پەیامبەر ڕەوانە کراوە بۆ یان بۆ ئەوەی پەیامی یەکتاپەرستیان پێ ڕابگەیەنێت، بەلاَم ئەوان هەمیشە وابەستە بوون بەئاینە لادراوەکەیانەوە، دواجار ئەوە بوو خوای گەورە حەزرەتی موسای وەك پێغەمبەرێك و نێراوێك بۆی ڕەوانە کردن ئەویش لەبەر دوو هۆکاری سەرەکی :. یەکەمیان : ئەم گەلە لەئاینی ڕاست لایان دابوو لەگەلَ ئەمەشدا هاوبەشیان بۆ خوای گەورە بڕیار دەدا، دووەمیان :.لەبەر ئەوەی نەوەی ئیسرائیل یان کردبووە بەندەو کۆیلە، بەم شێوەیە خوای گەورە حەزرەتی موسای ڕەوانە کرد بۆ ئەم گەلە کەلەگەلَ خۆیدا دوو فەرمانی پەروەردگاری پێ بوو ئەویش بانگهێشت کردنی خەلکی میسر بوو بۆ سەر ئاینی یەکتا پەرستی و ڕزگار کردنی نەوەکانی ئیسرائیل وەك خوای گەورە لە قورئانی پیرۆز دا بۆمانی دەگێڕێتەوە : ﴿ نَتۡلُواْ عَلَيۡكَ مِن نَّبَإِ مُوسَىٰ وَفِرۡعَوۡنَ بِٱلۡحَقِّ لِقَوۡمٖ يُؤۡمِنُونَ ﴿٣﴾ إِنَّ فِرۡعَوۡنَ عَلَا فِي ٱلۡأَرۡضِ وَجَعَلَ أَهۡلَهَا شِيَعٗا يَسۡتَضۡعِفُ طَآئِفَةٗ مِّنۡهُمۡ يُذَبِّحُ أَبۡنَآءَهُمۡ وَيَسۡتَحۡيِۦ نِسَآءَهُمۡۚ إِنَّهُۥ كَانَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٤﴾ وَنُرِيدُ أَن نَّمُنَّ عَلَى ٱلَّذِينَ ٱسۡتُضۡعِفُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنَجۡعَلَهُمۡ أَئِمَّةٗ وَنَجۡعَلَهُمُ ٱلۡوَٰرِثِينَ ﴿٥﴾ وَنُمَكِّنَ لَهُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَنُرِيَ فِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَ وَجُنُودَهُمَا مِنۡهُم مَّا كَانُواْ يَحۡذَرُونَ ﴿٦﴾ ﴾ **القصص** (٣-٦) واتە : ﴿ئێمە هەندێك لەهەواڵ و بەسەرهاتی گرنگی ڕاست و نەگۆڕی موساو فیرعەون دەخوێنینەوە بەسەرتا، بۆئەوەی سود بگەیێنین بەگەلێك کە بڕوا دەهێنن (تایبێتە پەندو ئامۆژگاری). بێگومان فیرعەون زاڵ و دڕندە بوو

له ولاتەکەیدا، خەڵکەکەی پارچە پارچە کرد (جیاوازی خستە نێوانیانەوە) دەستەیەکیانی دەچەوساندەوە و لاوازی دەکردن، منداڵە نێرینەکانی سەر دەبڕین، کچان وئافرەتانی (بەزەلیلی دەهێشتەوە)، بەڕاستی ئەو ستەمکارە یەکێك بوو لەوانەی تۆوی خراپەی دەچاند. ئێمەش دەمانەوێت دەروو بکەینەوە لەچەوسارەکان و منەتی خێر بکەین بەسەر لاوازکراوەکاندا لە ولآت دا و دەمانەوێت بیانکەینە پێشەواو بیانکەینە میرات گری سامان و دەسەلآتی ستەم کاران. هەروەها دەمانەوێت پایەداریان بکەین و دەسەلآتیان بچەسپێنین لە ولآتدا و، ئەوە پێش بهێنین بۆ فیرعەون و هامان و سەربازانیان کە لێی دەترسان﴾. فیرعەون ویستی وابوو کەژمارەی کوڕەکانی نەوەی ئیسرائیل زیاد نەکات، ئەوسا بڕیاری دا بەکوشتنی ئەو کوڕنەی کەلەدایك دەبن، لەبەر ئەمە دایکی موسا بە نیگایەك لەلایەن پەروەردگاریەوە موسا پێغەمبەری لەسەبەتەیەکدا داناو خستیە ناو دەریای نیلەوە، وەئەم ڕێگایەش موسا پێغەمبەری گەیاندە کۆشکی فیرعەون : ﴿ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنْ أَرْضِعِيهِ ۖ فَإِذَا خِفْتِ عَلَيْهِ فَأَلْقِيهِ فِى ٱلْيَمِّ وَلَا تَخَافِى وَلَا تَحْزَنِىٓ ۖ إِنَّا رَآدُّوهُ إِلَيْكِ وَجَاعِلُوهُ مِنَ ٱلْمُرْسَلِينَ ﴿٧﴾ فَٱلْتَقَطَهُۥٓ ءَالُ فِرْعَوْنَ لِيَكُونَ لَهُمْ عَدُوًّا وَحَزَنًا ۗ إِنَّ فِرْعَوْنَ وَهَـٰمَـٰنَ وَجُنُودَهُمَا كَانُوا۟ خَـٰطِـِٔينَ ﴿٨﴾ وَقَالَتِ ٱمْرَأَتُ فِرْعَوْنَ قُرَّتُ عَيْنٍ لِّى وَلَكَ ۖ لَا تَقْتُلُوهُ عَسَىٰٓ أَن يَنفَعَنَآ أَوْ نَتَّخِذَهُۥ وَلَدًا وَهُمْ لَا يَشْعُرُونَ ﴿٩﴾ ﴾ القصص (٧-٩) واتە : ﴿ئێمە دایکی موسامان ئاگادار کرد، کەشیری بداتێ و (پێمان وت) جاکاتێك مەترسیت پەیدا کرد لەوەی کە پێی بزانرێت فڕەی بدەرە ڕووباری (نیلەوە)، نەبترسە (لەوەی توشی بەلآ ببێت) نەخەفەتیشی بۆ بخۆ، چونکە ئێمە بەڕاستی دەیگێڕینەوە بۆلات و لەئایندەشدا دەیکەین بەیەکێك لە پێغەمبەرە پەیام دارەکان. ئەوسا ئیتر دارو دەستەی فیرعەون

هەڵیان گرتەوە، تاسەرەنجام ببێتە دووژمن و خەفەت بۆیان، بەڕاستی فیرعەونْ و هامان و سەربازەکانیان گوناهکارو تاونبارو هەڵە بوون. (کاتێك فیرعەون موسای ساوای بینی فەرمانی کوشتنی دەرکرد) خێزانەکەی نەیهێشت و وتی : هیوادارم ببێتە مایەی خۆشحاڵی و چاوڕوونی بۆ منیش و بۆ تۆش، مەیکوژن، بەڵکو لەئایندەدا سودمان پێبگەیێنێت، یان دەیکەینە کوڕی خۆمان، لەکاتێکدا ئەوان هەر پێی نازانن و هەستی پێناکەن﴾. خێزانی فیرعەون موسا پێغەمبەری لەکوشتن ڕزگار کرد و کردیە کوڕی خۆی، بەم شێوەیە حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لیْ بێت) تەمەنی منداڵی لەکۆشکی فیرعەوندا بەسەر برد، وەبە پشتیوانی و کۆمەکی خوای گەورەش دایکی موسا (سەلامی خوای لیْ بێت) وەك دایەنی هاتە کۆشکی فیرعەونەوە. جاکاتێك حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لیْ بێت) وورده وورده پێگەیشت و بووە گەنجێك، جارێکیان موسا (سەلامی خوای لیْ بێت) یەکێك لە میسریەکانی بینی کە ئازاری یەکێکی دەدا لەلاوەکانی نەوەی ئیسرائیل ،حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لیْ بێت) توڕە بوو بۆکزێکی دا لە میسریەکە وەلەم کاتەدا میسریەکە دەست بەجیْ مرد، وەسەرەڕای ئەوەی کە موسا (سەلامی خوای لیْ بێت) لەکۆشکی فیرعەون دا پەروەردە دەکراو کردبوویانە کوڕی خۆیان، گەورە پیاوانی ئەم گەلە کۆبوونەوە و بڕیاری سزادانیان بۆ موسا (سەلامی خوای لیْ بێت) دەرکرد کە تاکە سزایەك بریتیە لە کوشتنی، جاکاتێك موسا (سەلامی خوای لیْ بێت) ئەو هەواڵەی بیست دەست بەجیْ میسری بەجیْ هێشت و بەرەو مەدیەن بەڕێکەوت، وەلە کۆتایی ئەو ماوەدا کە حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لیْ بێت) لەمەدیەن مایەوە لە گەڕانەوەیدا بۆ میسر خوای پەروەردگار قسەی لەگەڵدا کردو پەیامی خۆی پێدا، وەفەرمانیشی پیْ کرد کە بگەڕێتەوە بۆ لای فیرعەون و پەیامی خوای پیْ ڕابگەیەنێت.

# کۆشکی فیرعەون

حەزرەتی موساو هارون (سەلامی خوایان لێ بێت) وەك دوو پێغەمبەری خوا هەستان بە جێ بەجێ کردنی فەرمانەکانی خوای گەورە، وەپەیامی ڕاستی پەروەردگاریان گەیاندە لای فیرعەون، وەداوایان لە فیرعەون کرد کە دەست هەڵگرێت لە ئازارو ئەشکەنجەدانی نەوەکانی ئیسرائیل و لێشیان گەڕێت بالەگەڵ موسا و هارون دا بچنە دەرەوە، جائەم داوایەش لەلای فیرعەون پەسەند نەبوو کە موسا یەك لەکۆشکەکەیدا پەروەردە کراوە بەرامبەری بووەستێتەوە، کە موسا کەسێکە واباوە کەئەو ببێتە میراتگری کۆشك و جێگەی فیرعەون، لەبەر ئەوە فیرعەون دەستی دایە تۆمەت بار کردنی بەوەی کەچاکەی لەبەر چاو نیە و پێزان نیە : ﴿ قَالَ أَلَمْ نُرَبِّكَ فِينَا وَلِيدًا وَلَبِثْتَ فِينَا مِنْ عُمُرِكَ سِنِينَ ﴿١٨﴾ وَفَعَلْتَ فَعْلَتَكَ الَّتِي فَعَلْتَ وَأَنتَ مِنَ الْكَافِرِينَ ﴿١٩﴾ ﴾ **الشعراء** (١٨-١٩) واتە : ﴿کاتێك موسا و هارون پەیامی خوایان گەیاند، فیرعەون بەموسای وت : (ئەمە پاداشتی پیاوەتیە) ئایا ئێمە بەمنداڵی بەخێومان نەکردیت ؟ چەندەها ساڵی تەمەنت لەناوماندا نەبردەسەر ؟... ئەوەشت کرد کەکردت (مەبەستی کوشتنی قیبتیەکەیە) دیارە کەتۆ لەڕیزی ئەوکەسانەدایت کەناشوکرن و پاداشتی پیاوەتی نازانن﴾. لەڕاستیدا فیرعەون هەوڵی دەدا کە هەست و سۆزی موسا ڕابکێشێ و کاری تێ بکات، بەوەی کەلەباوەشیدا پەروەردەی کردووە و وەلەکۆشکەکەشیدا گەورە بووە و نەش و نمای کردووە. لەبەر ئەوە پێویستە لەسەر موسا کە گوێڕایەڵی بێت، بەم شێوە سۆزداریانە فیرعەون لەهەوڵی ئەوەدا بوو کەکاریگەری لەسەر موسا (سەلامی خوای لێ بێت) دروست بکات، بەهەمان شێوە ئەوەشی چەسپاند بەسەر دارو دەستەکەیدا کەهامڕاین لەبەرامبەر موسادا بوەستنەوە. لەلایەکی تریشەوە

فیرعەون لەو ئاینە ڕاستەی کە موسا و هارون (سەلامی خوایان لێ بێت) هێنا بوویان ئەوەی بۆ دەرکەوت کە پێکهاتەی دەستەلاتەکەی نامێنێ و پلە و پایەی لەدەست دەدا و دەبێتەوە کەسێکی سادە، چالەو کاتەداشدا خوایەتی خۆی لەدەست دەدات، تەنانەت دەبێت گوێڕایەڵی موساش بکات، لەمەلەلایەن ئەو زیانە گەورەی کەدەیکات ئەگەر هاتوو بەڕاستی ئەوەی ئیسرائیلی لەگەڵ موسادا بنێرێت، چونکە ئەوان بریتین لە هێزێکی گەورەی بەهێزی مرۆیی بۆ فیرعەون. وەفیرعەون لەبەر ئارەزووی دەسەلات و فەرمانڕەواییەکەی گوێی بۆ موسا (سەلامی خوای لێ بێت) نەگرت، بەڵکو هەوڵی ئەوەشی ئەدا کە گاڵتەی پێ بکات و بەڵگە بۆ هێزو دەسەلاتی بچەسپێنێ، لەبەرئەوە بڕوای بەموسا و پەیامەکەی نەهێنا، تەنانەت هەوڵیشی دا کە موسا و هارون تۆمەت بار بکات بەوەی کەداوای بەرزی و دەسەلات دەکەن و لە هەوڵدان بۆ ئەوەی پشێوی و خراپەکاری لەسەرزەویدا بەرپابکەن، دواجار نە فیرعەون و نە شوێنکەو توانی بڕوایان نەهێنا بەپەیامی موسا و هارون (سەلامی خوایان لێ بێت) جگە لە جادوو گەران نەبێت، شوێنی ئاینی ڕاست نەکەوتن و بەربەرچییشیان دایەوە، ئینجا خوای گەورەش چەندکارە ساتێکی یەك لەدوای یەکی بۆ ناردن.

# ئەوکارەسات و مەینەتیانەی دووچاری فیرعەون و دارو دەستەکەی بونەوە

فیرعەون و دارو دەستەکەی پابەند بوون بە بیرو باوەڕی فرە خوایی و بت پەرستیەوە، کە (ئاینی باووباپیرانیان) بووە وازیشیان لێ نەدەهێنا، تەنانەت ئەو دوومۆعجیزەیەش کە حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) پیشانی دان : وەك ئەوەی کەدەستی خستە بن باڵی و دەری هێنا خێرا بوو بەکافوری سپی و

وەهەروەها ئەو گۆچانەشی کە بووە ئەژدیهایەکی گەورە، ئەم دوانە بەس نەبوون بۆ ئەوەی وایان لێبکەن پشت لە ئاینەلادراوەکەیان هەڵکەن، وەبەئاشکرا ئەوەیان راگەیاند و وتیان : ﴿ وَقَالُوا مَهْمَا تَأْتِنَا بِهِۦ مِنْ ءَايَةٍ لِّتَسْحَرَنَا بِهَا فَمَا نَحْنُ لَكَ بِمُؤْمِنِينَ ﴿١٣٢﴾ ﴾ الأعراف (١٣٢) واتە : ﴿(فیرعەون و دارو دەستەی) وتیان : هەر چیمان بۆ بهێنی لەبەڵگەو موعجیزە تاچاوبەستمان لێبکەی پێی، ئەوە ئێمە هەر بڕوادارنین بەتۆ !!﴾. وەبەهۆی ئەم هەڵسوکەوتەیانەوە خوای پەروەردگارکۆمەڵە کارەساتێکی بۆ ناردن وەك (موعجیزەی پچڕپچڕ) تاوەکو لەم ژیانەیاندا سزا بچێژن بەرلە سزای هەمیشەیی لەدوا ڕۆژدا، یەکەم کارەساتیش بێ بارانی و نەهامەتی و کەم بوونەوەی ڕزق و ڕۆزی بوو، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت : ﴿ وَلَقَدْ أَخَذْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ بِٱلسِّنِينَ وَنَقْصٍ مِّنَ ٱلثَّمَرَٰتِ لَعَلَّهُمْ يَذَّكَّرُونَ ﴿١٣٠﴾ ﴾ الأ عراف (١٣٠) واتە : ﴿سوێند بێت بەخوا بەڕاستی ئێمە شوێن کەوتووەکان و گەلی فیرعەونمان گیرۆدەی چەند ساڵێکی گرانی و نەهامەتی و کەم بوونەوەی ڕزق و ڕۆزی و بەرو بوومەکان کرد، بۆ ئەوەی ئەوان دابچڵەکێن و پەند وەربگرن و بیر بکەنەوە﴾. بەرهەمە کشتوکاڵیەکانی میسر لەسەر ڕووباری نیل بوون، لەبەر ئەمە کاریگەری ئەوتۆیان نەبوو لەسەر کەش و هەوای سروشتی. بەڵام کارەساتێکی چاوەڕوان نەکراو دووچاریان هات بەهۆی ئەو لە خۆبایی بوونەی فیرعەون و دارو دەستەکەیەوە بوو کەخۆیان لەخوا و پێغەمبەرەکەی بەگەورەتر دادەنا، وەلەبەر چەند هۆکارێکی جیاوازیش ئاستی ڕووباری نیل دابەزی، وەئەوەندەی نەمایەوە کە زەویە کشتوکاڵیەکانی پێ ئاوبدرێت، وەبەهۆی پلەی گەرمی زۆرەوە بەروبوومەکانیش ووشك بوون، بەم شێوەیە کارەساتەکان بەرەو ڕوویان هاتن بە شێوازێك کەئەمان چاوەڕوانیان نەبوون، لەو نیلەی کە پشتیان پێ

ده بەست، ئەم كارەساتە فیرعەونی ترساند كەراهاتبوو لەگەڵ گەلەكەیدا بەم شێوازە بدوێ : ﴿وَنَادَىٰ فِرْعَوْنُ فِي قَوْمِهِۦ قَالَ يَٰقَوْمِ أَلَيْسَ لِي مُلْكُ مِصْرَ وَهَٰذِهِ ٱلْأَنْهَٰرُ تَجْرِي مِن تَحْتِيٓ أَفَلَا تُبْصِرُونَ ﴿٥١﴾﴾ **الزخرف** (٥١) واتە : ﴿فیرعەون جاڕیدا بەناو قەوم و گەلەكەیدا و ووتی : ئەی قەوم و گەلم، من پاشای میسرم و فەرمانڕەوای ئەم وڵاتەم، ئەم ڕووبارانەش بەبەر كۆشكەكانمدا دەڕوات، ئایا ئەم دەستەڵاتەی من نابینن ؟!﴾.





ئەو هۆزو نەتەوە كۆیلانەی كە فیرعەون لەسەردەمی میرنشینی نوێدا ستەمی لێدەكردن وە كەمینەیەك لەو وڵاتەدا كە هەڵدەستان بەكاری نارەحەت و بینای گەورەیان دروست دەكرد، نەوەی ئیسرائیل یەكێك بوو لەو كەمینانە، پێدەچێت ئەو كۆیلانەی كەلەوێنەكەی پیشاندراوە هەڵدەستن بەدروست كردنی یەكێك لەپەرستگاكانی نەوەی ئیسرائیل بێت كە زۆرینە پێیان وایە، لەو وێنەیەی كە لەلای چەپەوەیە كۆیلە كە ئەوانەش نەوەی ئیسرائیلن، كە پێش دەستكردن بەكارەكانیان هەندێ كاری هونەری جێ بەجێ دەكەن، كە كۆیلەكان هەڵدەست بەدروست كردنی خشت.



وایان داناوه کە ئەم وێنەیە ڕەمسیسی دووەمە کە قورئانی پیرۆز باسی لێوە کردوەو بەڕای زۆرێك لەمێژوو نووسانیش وەك لەوێنەکەدا دیارە ڕەنگە ڕەمسیسی دووەم هەندێ لەو کۆیلانەی کە دەستگیر کردوە بکوژێت ئەم وێنانە ئەوە دەردەخەن کە فیرعەونیەکان شەڕەنگێزو بکوژ بن، هەمیشە وەك نەبەرد خۆیان دەرخستوە کە بەشانی پان و لەش و لاری بەهێزەوە خۆیان دەرخستوە. کە توانیویانە لەیەك کاتدا ژمارەیەك کەس بڕوخێنن.



ڕەمسیسی دووەم لەسەر گالیسکەیەکی جەنگی دەردەکەوێت، کە کۆمەڵەیەکی گەورەی دوژمنانی دەڕوخێنێت وەک تێکڕای وێنەکانی تر ئەم وێنەیە خەیاڵییە کە وێنەکێشان دروستیان کردوە بەفەرمانی فیرعەون.



جەنگی قادیش، ئەم جەنگە لەنێوان ڕەمسیس و حیسیەکاندا ڕوویدا، مێژوونووسە میسریەکان بەشێوەیەکی ساختەکاریانە گواستویانەتەوە بەو مانایەی کە سەرکەوتنی گەورە بۆ میسریەکانە، لەڕاستیدا لەم جەنگەدا لەدواساتەکاندا فیرعەون لەمردن دەرباز بوو، ناچار بوو بەوەی پەیمانی ئاشتەوایی ببەستێ.

ئەم کارەساتە بەرەوانترین زمـان فیرعەون بەدرێژەخاتەوە، وەلەبری ئەوەی گەلەکەی پەندو ئامۆژگاری وەربگرن – هەروەك ئایەتەکانی قورئانی پیرۆز باسی لێوە دەکەن، ئەوان وتیان : بێگومـان ئەوە نەدەبوو، بەڵکو بەهۆی بەدبەختی وچارەڕەشی یەك بووە کە موساو ئەوەی ئیسرائیل پێی هاتبوون، لەڕاستیدا ئەم بیانوەیان دەهێنایەوە بەهۆی بیرو باوەڕی پوچەڵ و بەتاڵ و ئەویاخی بوونە سروشتی یەیانەوە بەئەنجامی کاروکردەوەی خۆیان گەیشتن و چەندە هاساڵ و بەژیانێکی کوێرەوەری تەنگەلان و ترش وتاڵ و بەهۆی پابەندبوونیان بەئاینی باووباپیریانەوە. وەکارتەنها لەوکارەساتەدا نەوەستا، بەڵکو تەنها ئەوە سەرەتایەك بوو پاشان کارەساتی تری یەك لەدوای یەك هات بەشوێنیدابۆ بێدارکردنەوەو ترساندنی گەلی میسروهۆشیارکردنەوەیان، وەقورئانی پیرۆز ئەم کارەساتانەی باس کردووە : ﴿ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمُ ٱلطُّوفَانَ وَٱلْجَرَادَ وَٱلْقُمَّلَ وَٱلضَّفَادِعَ وَٱلدَّمَ ءَايَٰتٍ مُّفَصَّلَٰتٍ فَٱسْتَكْبَرُوا۟ وَكَانُوا۟ قَوْمًا مُّجْرِمِينَ ﴿١٣٣﴾ ﴾ الأعراف (١٣٣) واتە : ﴿جائێمەش بەلای لافاوو کوللەو ئەسپێ و بۆقی جۆراو جۆرو خوێنمان نارده سەریان لەکاتێکدا ئەوانە چەندەها بەڵگەی ڕوون بوون (لەسەر تاوانباریان)، کەچی ئەوان هەرلوت بەرزیان کردو خۆیان بەزل و گەورە زانی، بەڕاستی قەومێکی تاوانبار و تاوانکار بوون﴾. وەئەم کارەساتانەی کەلەقورئانی پیرۆزدا وەسف کراون لەگەڵ عەهدی قەدیم دا هاوڕان : ﴿ومات السمك الذي في النهر، وأنتن النهر فلم يقدر المصريون أن يشربوا ماءً من النهر، وكان الدم في كل أرض مصر﴾(الخروج ٧ : ٢١) واتە : ﴿وە ئەو ماسیەی کەلەڕووبارەکەدا بوو مردوو ڕووبارەکەش بۆگەنی کردوو ئیتر میسرییەکان نەیانتوانی ئاوی لێ بخۆنەوە. بەم پێ یە خوێن لەهەموو خاکی میسردا پەیدابوو﴾. ﴿وان كنت أن تطلقهم فها أناأضرب جميع تخومك بالضفادع، فيفيض النهر ضفادع فتصعد وتدخل الى بيتك والى مخدع فراشك وعلى سريرك

**والى بيوت عبيدك وعلى شعبك والى تنانيرك والى معاجنك﴾** (الخروج ٨ : ٢-٣)
واته : ﴿وەئەگەر تۆ ناتەوێ ئازادیان بکەیت، ئەوا من بە بۆقەکان بەڵاو کارەساتێك دەدەم بەسەر کێڵگەو کشتوکاڵەکەتدا، ئەوکاتە ڕووبارەکە لافاوێکی بۆقاوی هەڵدەسێنێت و دەگاتە ماڵ وحاڵ وجێگای خەوتن و پێخەفەکانت و ماڵی بەندەو گوێ لەمستەکانت و بەسەر گەلەکەتداو وە بۆناو فڕنی نان کردن وتەشت و نانی هەویرت﴾.**﴿ثم قال الرب لموسى : قل لهارون : مد عصاك وأضرب تراب الارض ليصير بعوضا في جميع أرض مصر﴾** (الخروج ٨ : ١٦) واته : ﴿پاشان پەروەردگار بەموسای وت : بڵێ بەهارون : گۆچانەکەت هەڵبڕە و بیکێشە بە خۆڵی زەویدا تاهەموو خاك وخۆڵی میسر ببێتە مێشوولە﴾. **﴿فقال العرافون لفرعون : هذا أصبع الله، ولكن اشتد قلب فرعون فلم يسمع لهما كما تكلم الرب﴾** (الخروج ٨ : ١٩) واته :﴿پاشان فاڵگرو جادووگەرەکان وتیان بەفیرعەون : ئەمە پەنجەی خودایە، بەڵام فیرعەون دڵی گەرم بوو گوێی پێ نەدان هەروەك پەروەردگار وتی﴾.
کارەساتە ترسناکەکان درێژەیان کێشا لەسەر فیرعەون و دام ودەزگاو دەست و پێوەندەکانی، وەلەگرنگترین تایبەتمەندی ئەم کارەساتانە ئەوەبوو کە هەڵقولاوی ئەو شتانە بوو کە بت پەرستەکان دەیانپەرستن وەك خودا گەلێك، بۆ نموونە : ئەوان ڕووباری نیل و بۆقەکانیان بەرزو پیرۆز ڕادەگرت، بەڵام قەومەکە چاوەڕوانی کۆمەك ویارمەتیان لەم خودا-گەلە دەکرد، خوای پەروەردگاریش سزای دەدان لەنێوان ئەم خودا گەلانەدا، بەڵکو هەست بەهەڵەکانیان بکەن و باجی تاوانەکانیشیان بدەن و هۆش بکەنەوەو تێ بگەن کەئەم خودا گەلە هیچ هێزو توانایەکیان نیە وە تەنانەت ناشتوانن هیچ سوودێکیان پێ بگەیەنن. وە بەپێی ووتەی ڕوونکەرەوانی (عەهدی قەدیم) واتە: سەردەمی پێش هاتنی حەزرەتی مەسیح (سەلامی خوای لێ بێت) ڕوودانی کارەساتی خوێن، کە ڕووباری (نیل) ی گۆڕیوە بە خوێن مەبەست سووربوونی ڕەنگی ئاوی نیلە، وەبەپێی هەندێ لەتەفسیرەکانیش : ئەم ڕووداوە

بەهۆی جۆرە بەکتریایەکەوە ڕوویداوە، ڕووباری نیل سەرچاوەی سەرەکی ژیانی میسریەکان بووە، وەهەرجۆرە زەرەروو زیانێك توشی ئەم سەرچاوەیە ببێت واتای مردن ولەناوچوونی هەموو میسرە، وەلەکاتێکدا ئەم بەکتریایە ئاوی نیلی داگیرکردو بەم ڕێژەیە ڕەنگی سوور هەلگەڕاند، ئەمە واتای ئەوە دەگەیەنێ کە هەرزیندەوەرێك لێی بخواتەوە ئەوە تووشی ئەم بەکتریایە دەبێت. دۆزینەوەوداهێنانە نوێیەکان دەریان خستووەکەهۆی سووربوونی ڕەنگی ئاوەسوێروسازگارەکان دەگەڕێتەوە بۆهەڵتۆقینی جۆرە بەلَغ وملّتە یاقەوزەیەکی سەوز یان قارچك و دومەلاّنێك، کەئەم هەموو دومەلاّن وقارچکە هەلتۆقیوانە ئۆکسجین لە ئاوەکە دەردەهێنن و ژەهرێکی زیان بەخش دەرژێنن کە زیان دەگەیەنێ بەهەموو زیندەوەرێك[1]. خاتوو پاتریشا ئەتستەر - Patricia Atester - شارەزایەکە لە یەکەی ماسیە نیشتمانیەکانی ولاّتە یەککگرتوەکانی ئەمریکا لە سالّنامە ئەکادیمیە زانستیەکانی نیویورك دەنوسێت، سەرنجی ئەوەی داوە کەواهەرچەندەو ئەگەرچی کەمترلە (٥٠) پەنجا جۆرلە نەژادو ڕەگەزی (٥٠٠)پێنج سەد لەم جۆرە هەلّواسراوە دەریاییانە بەکوشندە دەژمێررێن، بەلاّم ئەو جۆزانەی کەهەلگری ژەهرە تایبەتەکەن کاریگەری سامناکترو مەترسیدارترن لە سەر ژیانی ئاوی، هەروەك (ئیوین تۆد، Ewen c. D.Todd کەیەکێکە لەوەزارەتی تەندروستی کەنەدی ئاماژەی پێ دەکات لە هەمان سالّنامەدا بڵاوبوونەوەو پەرسەندنی ژمارەیەك لەم جۆرە هەلّواسراوە ئاوییانە نزیکەی بیست وچوارجۆریان هەیە لەناوچە جۆراوجۆرەکانی جیهان، بەلاّم (کارمیشیل) و (فالکونر) لیستێکیان داناوە تایبەت بەو نەخۆشیانەی کە قەوزەی سەوز و شین هۆکاریەتی لەئاوسازگارەکاندا، هەروەك (جوان بور کهولدر - Joan M.

[1] البحرالأحمر، موسوعة جودايكا المجلد ١٤، الصفحات ١٤، ١٥

Burkholder) کەپسپۆرە لە زانستی ژینگە ئاوییەکاندا – لەزانکۆی کارولاینای باکوور چەند جۆرێکی دیاری و دەستنیشان کردووە کە کوشندەو لەناوبەری ماسین. وەلەسەردەمی فیرعەونیشدا دەگونجێ ولەوانەیە ئەم جۆرە کارەساتانەرِوویدا بێت و بە پێی بەشوێندا چوونی ڕووداوەکان ماسیەکان مردوون کاتێك ئاوی نیل پیس بوویێت. بەو پێیەش میسریەکان سەرچاوەیەکی خۆراکی گرنگیان لەدەست چووە، وەبەلەناوچوون و نەمانی ئەو ماسیانەی کەبەشێکی زۆر لەگەرای بۆقەکانیان دەخوارد، بۆقەکان پەرەیان سەندو ژمارەیان زۆر زیادی کرد، پاشان خۆیان دەرباز کرد لەئاوە پیس بووە کەو بەرەو وشکانی کۆچیان کرد بەلاّم ئەمانیش ژەهراوی بوون و مردن و بۆگەنیان کردو شی و شیتاڵ بوونەوە، هەروەك ماسیەکان، وەئیتر بەو پێیە نیل و دەورو بەری بۆگەن و پیس هەلگەڕاو بۆ خواردنەوە نەدەشیاو دەستی نەدەدا. بەهۆی مردن و لەناو چوونی بۆقەکانیشەوە ژمارەی مێرووەکان و کێچ و ئەسپێ بەشێوەیەکی بەر فراوان لەزیاد بووندا بوو. گومانی تێدا نیە ئەوەی کەلەسەرەوە ئاماژەمان پێدا تەنها بۆ لێکۆلێنەوە و ڕوونکردنەوە بوو، وەدوور لەو تێڕوانینەیە لەو شێوازانەی بەسەریانداهات لەکارەسات و شوێنەوار کە جێیان هێشتووە، فیرعەون و دارو دەستەکەشی پەندیان لێ وەرنەگرت و ڕووشیان نەکردە خوای گەورە، بەلکو زیاتر گومڕاو یاخی بوون وەلەڕاستیدا فیرعەون و داروەدستەکەی گومانیان وابوو کە توانایان هەیە کەفێلّ لە موساو خوای گەورە بکەن (حاشالله)، بەلاّم کاتێك سزاکەهات بەسەریاندا داوای ڕزگاربوونیان لەموسا دەکرد تاوەکو لەو سزایە ڕزگاریان بکات : ﴿ وَلَمَّا وَقَعَ عَلَيْهِمُ ٱلرِّجْزُ قَالُوا۟ يَٰمُوسَى ٱدْعُ لَنَا رَبَّكَ بِمَا عَهِدَ عِندَكَ ۖ لَئِن كَشَفْتَ عَنَّا ٱلرِّجْزَ لَنُؤْمِنَنَّ لَكَ وَلَنُرْسِلَنَّ مَعَكَ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿١٣٤﴾ فَلَمَّا كَشَفْنَا عَنْهُمُ ٱلرِّجْزَ

إِلَىٰٓ أَجَلٍ هُم بَٰلِغُوهُ إِذَا هُمْ يَنكُثُونَ ﴿١٣٥﴾ ﴾ الأعراف (١٣٤-١٣٥) واته : ﴿جاكاتێكیش هەربەڵایەك لەو بەڵایانە بەسەریاندا هات (پەنایان دەبرد بۆ موسا) و دەیان ووت : ئەی موسا (فریامان بکەوە) لەپەروەردگارت بپارێرەوە بۆمان، بەو پەیمانەی کەخوا لای داناویت، سوێند بەخوا ئەگەر ئەم بەڵایانەمان لەسەر هەڵگری ئەوسا بێ گومان باوەڕت پێ دەکەین و نەوەی ئیسرائیل یش ئازاد دەکەین و لەگەڵتا دەینێرین. جاکاتێکیش بەڵاکانمان لەسەر لادەبردن بۆ کاتێکی دیاری کراو کەئەوان پێی دەگەیشتن، ئەوە خێرا پەیمانەکانیان دەشکاندو لەسنوور دەترازان و (دەچوونەوە دۆخی جاران)﴾.

## چوونەدەرەوە لە میسر

خوای پەروەردگار لەرێگەی موساوە (سەلامی خوای لێ بێت) پەیامی خۆی بۆ فیرعەون و دارو دەستەکەی ڕۆشن کردەوە وەهەروەها لە سزاکەشی ئاگاداری کردنەوە، هیچ وەڵامێکیان نەبوو جگەلە یاخی بوون و تۆمەتبار کردنی موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) بە درۆزنی و شێتی، خوای گەورەش لەکۆتاییەکی داڕزێنەر و ڕسواکەر بەرەو ڕوویان چوو وەهەواڵیشیدایە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) کەچی بەسەر فیرعەون و شوێنکەوتوانی دێنێ: ﴿ ۞ وَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنْ أَسْرِ بِعِبَادِىٓ إِنَّكُم مُّتَّبَعُونَ ﴿٥٢﴾ فَأَرْسَلَ فِرْعَوْنُ فِى ٱلْمَدَآئِنِ حَٰشِرِينَ ﴿٥٣﴾ إِنَّ هَٰٓؤُلَآءِ لَشِرْذِمَةٌ قَلِيلُونَ ﴿٥٤﴾ وَإِنَّهُمْ لَنَا لَغَآئِظُونَ ﴿٥٥﴾ وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَٰذِرُونَ ﴿٥٦﴾ فَأَخْرَجْنَٰهُم مِّن جَنَّٰتٍ وَعُيُونٍ ﴿٥٧﴾ وَكُنُوزٍ وَمَقَامٍ كَرِيمٍ ﴿٥٨﴾ كَذَٰلِكَ وَأَوْرَثْنَٰهَا بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ﴿٥٩﴾ فَأَتْبَعُوهُم مُّشْرِقِينَ ﴿٦٠﴾ فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلْجَمْعَانِ قَالَ أَصْحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدْرَكُونَ ﴿٦١﴾ ﴾ الشعراء (٥٢-٦١) واتە : ﴿(دوای ساڵەها) وەحی مان نارد بۆ موسا (ئیتر

ولات بەجیٚ بهێڵێت) شەوڕەوی بکە بەبەندەکانم و دڵنیاش بن کە (دوژمنان) شوێن تان دەکەون... فیرعەون (کەحەواڵی زانی) ناردی بۆ شارەکان کە هێز کۆبکەنەوە و (نەهێڵن نەوەی ئیسرائیل کۆچ بکەن)... (جاڕی داو وتی) بێ گومان ئەوانە دەستەیەکی کەمن و زووبالَبەستیان دەکەین... بەڕاستی ئەوانە سەرکەشیان کردووە و ئێمەیان توڕە کردووە... (خەمتان نەبێت) بێ گومان ئێمە هەموومان بێدارو ئاگادارین (لەنەخشەیان)... ئینجا ئێمە (بەو شێوەیە فیرعەون و دارو دەستەیان) دەرهێنا لەناو باغ باخات و کانیاوەکان... لەنێو گەنجینەی جۆراو جۆرو جێگەو ڕێگەی خۆش و ڕازاوەدا... نەوەی ئیسرائیل مان کرد بەخاوەنی (زۆربەی) ماڵ و سامانیان... ئەوسا (فیرعەون و دارو دەستەی) شوێنیان کەوتن، لەگەڵ خۆر هەڵاتن دا پێیان گەیشتن... کاتێك هەردوولا یەکتریان بەدی کرد، یارانی موسا وتیان بەڕاستی پێمان گەیشتن و ئێمە تیا چووین﴾. وەلە بارودۆخێکی ئاوادا یارانی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) وایان گومان دەبرد کەئەوان لەدەست دەرچوون و گیاون و تیاچوون، وەلەبەرامبەریشدا فیرعەون و دارو دەستەکەی وایان گومان دەبرد کە پێیان دەگەن، بەلاّم حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بەیارانی وت کەنائومێد نەبن لە ڕەحم و سۆزی خوای گەورە لەبەرئەوە پێی وتن : ﴿ قَالَ كَلَّآ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهۡدِينِ ۝٦٢ ﴾ الشعراء (٦٢) واتە : ﴿موسا وتی : نەخێر، وانیە، من بەڕاستی پەروەردگارم لەگەڵدایەو ڕێنمونیم دەکات (بۆڕزگاری و سەرفرازی)﴾. وەلەو کاتەدا خوای گەورە نەوەکانی ئیسرائیلی ڕزگار کرد، دەریاکەی کرد بە دوو کەرتەوە، دوای ئەوەی کەنەوەی ئیسرائیل لەدەریاکەدا پەڕینەوە فیرعەون و گەلەکەی لەدەریاکەدا نوقم بوون و ژێر ئاو کەوتن. خوای گەورەش ئەم ڕووداوەمان لە قورئاندا بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت :

﴿ فَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضۡرِب بِّعَصَاكَ ٱلۡبَحۡرَۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرۡقٖ كَٱلطَّوۡدِ

ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ وَأَزْلَفْنَا ثَمَّ ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٦٤﴾ وَأَنجَيْنَا مُوسَىٰ وَمَن مَّعَهُۥٓ أَجْمَعِينَ ﴿٦٥﴾ ثُمَّ أَغْرَقْنَا ٱلْءَاخَرِينَ ﴿٦٦﴾ إِنَّ فِى ذَٰلِكَ لَءَايَةً ۖ وَمَا كَانَ أَكْثَرُهُم مُّؤْمِنِينَ ﴿٦٧﴾ وَإِنَّ رَبَّكَ لَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٦٨﴾ ﴾ **الشعراء (٦٣-٦٨)** واته : ﴿ئەوسائیّمە وەحیمان ناردبۆموساکە: بە عەساکەی بمالّە بەدەریاکەدا، (هەرکەئەوکارەی کرد) دەریاشەق بوو وهەررێگەوشەقامێکی دەورە درابەشەپۆلی گەورەی ئاو، کەوەك کێوێکی گەورەو مەزن وابوو... پاشان ئەوانی ترمان لەوشوێنە نزیك کردەوە... موسا و هەموو ئەوانەش لەگەڵیدا بوون ڕزگارمان کردن... پاشان ئەوانی ترمان نوقمی دەریاکرد. بەڕاستی ئالەوەدا بەڵگەو نیشانەی (بەهێز هەیە لەسەر دەسەلاّتی خوای پەروەردگار) کەچی زۆر بەیان باوەڕدار نەبوون. بەڕاستی هەر پەروەردگاری تۆ ئەی محمد (درودی خوای لیّ بیّت)، (ئەی ئیماندار) بالاّ دەستە (بەسەر بیّ باوەڕاندا) بەسۆزو میهرەبانیشە (بەئیمانداران)﴾. گۆچانەکەی حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لیّ بیّت) موعجیزەیەکی تایبەتی بوو، کاتێك خوای پەروەردگار نیگای بۆ نارد گۆچانەکە بوو بەهەژدیهایەکی گەورە، وەکاتێکیش جادووگەران بەڵگەیان هێنایەوە دیسانەوە گۆچانەکە بوو بە هەژدیهاو سەرجەم هەژدیهاکانی جادووگەران و گۆچانۆچکەکانیانی هەڵ لوشی، وەهەمان گۆچانیش ئێستادەریاکەی کرد بەدوو بەشەوە ﴿فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ﴾ واتە : ﴿هەر ڕێگەو شەقامێکی دەورەدرا بەشەپۆلی گەورەی ئاو، کە وەك کێوێکی گەورە و مەزن وابوو، ئاوەکە هەڵدرایەوە دوانزە کۆلاّنی بۆ دوانزە تایفەکەی نەوەی ئیسرائیل دروست کرد و بەنێوانیاندا پەڕینەوە﴾. وەئەمەش بەگەورەترین موعجیزەی حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لیّ بیّت) دادەنرێت.

# ئایا ئەم کارەساتەی کە ڕوویدا لە دەریای ناوەڕاستدا بوو یان لە دەریای سووردا ؟

تاکوو ئێستا هیچ کۆدەنگیەك نیە لەسەر ئەو شوێنەی کە حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) دەریاکەی تێدا کرد بەدوو بەشەوە، وەلەگەڵ ئەوەشدا قورئانی پیرۆز ئەم باسەی بە درێژی بۆ نەگێڕاوینەتەوە، لەبەرئەوە ناتوانین دڵنیا بین لەڕاستێتی ئەو پێشنیارانەی کەبۆ ئەم باسە کراوە، هەندێکیان دەڵێن : کەنارەکانی میسر لەسەر دەریای ناوەڕاستن لەبەرئەوە ڕووداوەکە لەو شوێنەدا بووە، ئەمەش لەمەوسوعەی جودایکادا هاتووە : Judaica. زۆربەی زۆرینەی ئەو ڕاوبۆچوونانە ئەوەیان دیاری کردووە کە ئەم کارەساتە لەیەکێك لە دەریا تەنکاوەکاندا ڕوویداوە کە دەکەوێتە سەرکەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاستەوە [1]. وەئەم ڕووداوەش پێدەچێت لەماوەی دەسەلاتی ڕەمسیسی دووەمدا ڕوو یدابێت، وەدەکرێت دوای ڕووخانی سوپای قادیش ڕوویدابێت، چونکەلە کتێبی (الخروج) ی عەهدی قەدیمدا هاتووە : کەئەم ڕووداوانە لە (میغدول و بعل ی زیفون) دا بووە کە دەکەونە باکوری دەلتاوە [2]. وەئەم بۆچوونەش پشت بە عەهدی قەدیم دەبەستێت، کەلە تەفسیرەکانی کتێبی (الخروج) ی عەهدی قەدیمدا هاتووە : فیرعەون و دارو دەستەکەی لەدەریای سووردا نوقمی ژێر ئاو بوون ( Red Sea )، وەئەو کەسانەشی کە ئەو ڕایە پشت ڕاست دەکەنەوە دەڵێن : ئەو ووشەی کە وەرگێڕاوە کە دەریای سوورە ( Thered Sea ) لەڕاستیدا ئەوە ( TheSeaof Reeds ) ، کەبە مانای دەریای

---

[1] دافید بن غوربون ، اليهود في بلادهم ، نيويورك ١٩٧٤ ، الصفحات ٣٢ ، ٣٣

[2] سبأ ، الموسوعة الأسلامية : العالم الأسلامي ، تأريخ ، جغرافية ، إنثوغرافيا ، وقاموس بيبلوغرافيا ، المجلد ١٠ ،صفحة ٢٦٨

قامیش دیت، وەئەم ووشەش لە زۆرێك لەوسەرچاوانە بە (RedSea) بەکار هێنراوە، لەگەڵ ئەوەی کەئەمە نیشانەیە بۆ ئەو جێگایە بەهەرحاڵ ؛ (TheSeaof Reeds) ئاماژەبە کەنارەکانی میسر دەکات لەسەر دەریای سپی ناوەڕاست دا، وەلەڕاستیشدا ناوچەکانی میغدوڵ و بەعل و زیفون لەعەهدی قەدیمدا باس کراوە لەو ڕێگەیەی کە فیرعەون و داروودەستەکەی گرتبوویانە بەر. وەئەم دوو جێگایەش لەباکوری (دەلتا) دان کەدەکەونە کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاستەوە، وەمەبەست لە (دەریای قامیش) یش دەبێتە پاڵپشت بۆ ئەوگومانەی کەئەم ڕوودارە لەسەر کەنارەکانی دەریای سپی ناوەڕاستدا ڕوویداوە، چونکە ئەم ناوچەیە قامیشی زۆر تێدا گەشە دەکات ئەویش بەهۆی خلتەی دەلتاوەیە، ئەمەش لەگەڵ ئەو ناونانەدا هاوڕایە.

## ژێرئاوکەوتنی فیرعەون و داروودەستەکەی لەدەریادا

قورئانی پیرۆز گرنگترین لایەنەکانی شەق بوونی دەریاکەمان بۆباس دەکات، وەبەپێی گێڕانەوە قورئانیەکە: حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) لەگەڵ نەوەی ئیسرائیل دا ئەوانەی کە شوێنی کەوتبوون لە میسر چوونە دەرەوە لەڕاستیدا فیرعەون بەمە قایل نەبوو کە ببێ ڕەزامەندی ئەو هەستاون بەم کارەیان، خۆی و سەربازانی بۆ ستەم و دەست درێژی شوێنیان کەوتن (بَغۡيٗا وَعَدۡوًاۖ سَبِيلَ یونس (۹۰) نەوەی ئیسرائیل لەگەڵ حەزرەتی موسادا (سەلامی خوای لێ بێت) گەیشتنە سەرکەنارەکانی دەریا و فیرعەون و دارو دەستەکەشی بە شوێنیانەوە بوون، هەندێ لەنەوەی ئیسرائیلی کەتێبینی ئەمەیان کرد لەم کاتەدا کەوتنە گلەیی و گازندە لەسەرحەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت)، بە پێی باسەکانی عەهدی قەدیم : نەوەی ئیسرائیل بە موسا یان وت : ((بۆچی لەسەرماڵ

و مولکمان دەرت هێناین، ئێمە لەوێدا بەندە بووین، بەلام لەسەرژیانی خۆمان بووین و بۆخۆمان دەژیاین، بەلام ئەوەتا ئێستاکە دەمرین)). قورئانی پیرۆزیش باسی لاوازی ئەم کۆمەڵەی نەوەی ئیسرائیلمان بۆ دەکات : ﴿فَلَمَّا تَرَٰٓءَا ٱلۡجَمۡعَانِ قَالَ أَصۡحَٰبُ مُوسَىٰٓ إِنَّا لَمُدۡرَكُونَ ۝٦١﴾ الشعراء (٦١) واتە : ﴿کاتێك هەردوولا یەکتریان بەدی کرد، یارانی موسا وتیان بەڕاستی پێمان گەیشتن و ئێمە تیاچووین﴾. لەڕاستیدا ئەمەیەکەم جارو دواین جاریان نەبووە کەنەوەی ئیسرائیلی سەرپێچی لە پێغەمبەرەکەیان بکەن، لەبەر ئەوە سەرەتا دەستیان کرد بە سکالا کردن ئینجا وتیان : ﴿قَالُوٓاْ أُوذِينَا مِن قَبۡلِ أَن تَأۡتِيَنَا وَمِنۢ بَعۡدِ مَا جِئۡتَنَاۚ قَالَ عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُهۡلِكَ عَدُوَّكُمۡ وَيَسۡتَخۡلِفَكُمۡ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَيَنظُرَ كَيۡفَ تَعۡمَلُونَ ۝١٢٩﴾ الأعراف (١٢٩) واتە : ﴿(قەومەکەی موسا دیارە زۆر لەناخۆشیدا بوون) بۆیە وتیان : پێش ئەوەی تۆ بێیتە ناومان و دوای ئەوەش کەهاتویت (بارو دۆخی ئێمە نەگۆڕاوە) هەرئازار دراو بووین، موسا وتی : ئومێد وایە پەروەردگارتان دوژمنەکەتان لەناو ببات و بتانکاتە جێ نشین لەزەویدا، ئەوسا سەیرتان دەکات کە ئێوە چۆن کاردەکەن !!﴾. وەبەپێچەوانەی گەلەکەی کە پشت ئەستوور نەبوون بە خوای گەورە حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) تەواو دڵنیا بوو لەوەی کە خوای گەورە سەریان دەخات چونکە متمانەی تەواوی بەخوای گەورە هەبوو، هەرلەسەرەتای جەنگەکەیەوە خوای گەورە هەواڵی دایە کەخۆی کۆمەك کاروسەرخەریشیان دەبێت. ﴿قَالَ لَا تَخَافَآۖ إِنَّنِي مَعَكُمَآ أَسۡمَعُ وَأَرَىٰ ۝٤٦﴾ طه (٤٦) واتە : ﴿خوای گەورە فەرمووی : مەترسن من بەڕاستی لەگەڵتاندام، دەبیستم و دەبینم (ناهێڵم دەست درێژی بکاتە سەرتان)﴾.



فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً ۚ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ
عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾

کاتێك حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) بۆ یەکەمین جار جادو گەرەکانی بینی ﴿ فَأَوْجَسَ فِي نَفْسِهِۦ خِيفَةً مُّوسَىٰ ﴿٦٧﴾ ﴾ طه(٦٧) واته : ﴿ئەوسا موسا هەستی کرد بە ترسێك لە دڵ و دەرونیدا﴾. ئینجالەوێدا خوای پەروەردگاریش نیگای بۆ نارد کەپێویستەلەسەری هەرگیز نەترسێت، چونکە بێگومان لەکۆتاییدا هەرتۆ سەرکەوتوویت و براوەیت، خوای پەروەردگار حەزرەتی موسای فێر کرد و لەسەر ڕێگەی ڕاست و دروست دایمەزراند، لەبەر ئەوە کاتێك هەندێ لەگەلەکەی ترسان لەوەی کە فیرعەون لەناویان ببات حەزرەتی موسا (سەلامی خوای لێ بێت) پێی وتن : ﴿ قَالَ كَلَّآ إِنَّ مَعِيَ رَبِّي سَيَهْدِينِ ﴿٦٢﴾ ﴾ الشعراء (٦٢) واته : ﴿موسا وتی نەخێروانیەمن بەڕاستی پەروەردگارم لەگەڵدایەوڕێنموویم دەکات (بۆڕزگاری وسەرفرازی).﴾. خوای گەورە نیگای نارد بۆ موسا پێغەمبەر (سەلامی خوای لێ بێت) کە گۆچانەکەی بکێشێ بەدەریاکەدا : ﴿ فَأَوْحَيْنَآ إِلَىٰ مُوسَىٰٓ أَنِ ٱضْرِب بِّعَصَاكَ ٱلْبَحْرَ ۖ فَٱنفَلَقَ فَكَانَ كُلُّ فِرْقٍ كَٱلطَّوْدِ ٱلْعَظِيمِ ﴿٦٣﴾ ﴾ الشعراء (٦٣) واته ﴿ئەوسا ئێمە وەحیمان ناردبۆموساکە: بە عەساکەی بماڵە بە دەریاکەدا، (هەرکەئەوکارەی کرد)دەریاشەق بوو وهەرپێکەوشەقامێکی دەورە درابەشەپۆلی گەورەی ئاو، کەوەك کێوێکی گەورەو مەزن وابوو.﴾. لەم کاتەدا فیرعەون ئەم موعجیزەیەی بینی هەستی بەوە کرد کەئەوە شتێکی نائاساییە و هەستی بە بینینی هێزێکی خوایی کرد لەم بارو دۆخەدا، دەریاکەش لەبەرامبەر ئەو گەلەدا کرایەوە کەفیرعەون نیازی وابوولەناویان ببات، وەفیرعەون و سەربازانی لەو بڕوایەدا نەبوون کەئەم دەریایە دادەخرێتەوە دوای ئەوەی موسا و شوێنکەوتوانی پیایدا پەڕینەوە، لەوکاتەدا فیرعەون و سەربازانی بەهۆی دژایەتی و ستەمکاریانەوە بیرکردنەوەیان لەدەستداو سوور بوون لەسەرئەوەی کە لەگەڵ سەربازانیدا

بەدەریاکەدا بپەڕنەوە و شوێنیان بکەون، ﴿ فَٱلْيَوْمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنْ خَلْفَكَ ءَايَةً وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنْ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾ يونس (٩٢) واتە : ﴿ئەمڕۆ ئیتر لاشەی تۆ ڕزگار دەکەین تا ببێتە موعجیزەو پەندو ئامۆژگاری بۆئەوانەی دوای تۆ دێن، بەلاّم بەڕاستی زۆربەی خەلکی لەئایەت و موعجیزەکانی ئێمە بێ ئاگان.﴾. بێ توانا بوون لەوەی کە تێبگەن لە موعجیزەکانی خوای گەورە لەو ڕووداوەدا، وەقورئانی پیرۆزیش وەسفی دواین ساتەکانی فیرعەونمان بۆ دەکات لەسورەتی یونس دا : ﴿ ۞ وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓا۟ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ﴾ يونس (٩٠) واتە : ﴿ئەوسا نەوەی ئیسرائیلمان بەدەریادا پەڕاندەوە، فیرعەون و سەربازانی بۆ ستەم و دەست درێژی شوێنیان کەوتن، تائەو کاتەی (کە ئاوەکە چووەوە باری ئاسایی خۆی)' فیرعەون خەریك بوو دەخنکا ئالەو کاتەدا ووتی : وا ئیتر باوەڕم هێنا بەوەی کەهیچ خوایەکی تر نیە جگە لەو خوایەی کەنەوەی ئیسرائیل باوەڕیان پێی هێناوە و من ئیتر لەموسلّمان و ملکەچانم.﴾. با موعجیزەیەکی تربیبینین لە موعجیزەکانی حەزرەتی موسا (سەلامتی خوای لێ بێت) دوای چاوخشان بەم دووئایەتەدا : ﴿ وَقَالَ مُوسَىٰ رَبَّنَآ إِنَّكَ ءَاتَيْتَ فِرْعَوْنَ وَمَلَأَهُۥ زِينَةً وَأَمْوَٰلًا فِى ٱلْحَيَوٰةِ ٱلدُّنْيَا رَبَّنَا لِيُضِلُّوا۟ عَن سَبِيلِكَ ۖ رَبَّنَا ٱطْمِسْ عَلَىٰٓ أَمْوَٰلِهِمْ وَٱشْدُدْ عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ فَلَا يُؤْمِنُوا۟ حَتَّىٰ يَرَوُا۟ ٱلْعَذَابَ ٱلْأَلِيمَ ﴿٨٨﴾ قَالَ قَدْ أُجِيبَت دَّعْوَتُكُمَا فَٱسْتَقِيمَا وَلَا تَتَّبِعَآنِّ سَبِيلَ ٱلَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ ﴿٨٩﴾ ﴾ يونس (٨٨-٨٩) واتە : ﴿(جاکاتێك ستەمی فیرعەون لەسنوور دەرچوو) موسا نزای کردوو وتی : پەروەردگارا بەڕاستی تۆ لەژیانی دونیادا نازو نیعمەت و ماڵ و

حاڵ و جێگەو ڕێگەی خۆش و ڕازاوەت بەخشیوە بە فیرعەون و دارو دەستەی، پەروەردگارا ئەو شتانە بووەتە هۆی ئەوەی کە (خەڵکی) لەڕێبازو بەرنامەی تۆ وێڵ و گومڕابن، پەروەردگارا : ماڵ و سامانیان تەفرو تونا بکە و کوێری بکەرەوەو دڵیان بگوشە (تاهەست بەخۆشی نەکەن) ئەمانە باوەڕ ناهێنن هەتا سزاو ئازاری بە ئێش نە بینن. پەروەردگار فەرمووی : بێگومان دوعای هەردووکتان وەرگیرا، بەلا م ئێوە هەربەردەوام بن لەسەر ڕێبازی ڕاست و دروستی هیدایەت و شوێن ڕێبازی ئەوانە مەکەون کە حەق نازانن و نافامن.﴾. لەم ئایەتانە دا ئەوەرۆشن دەبێتە وە کە خوای گەورە هەوالی دابە موسا (سەلامی خوای لێ بێت) کە پاڕانەوەکەی وەرگرتوەو وەلامی ئەوملکەچیەی دەداتەوە: لەڕاستیدا فیرعەون کەگەیشت بەسزای خۆی باوەڕی هێنابەخوای گەورە، وەکاتێك فیرعەون ئاوەکە دایدەپۆشی باوەڕی هێنا، بەلاّم دیارە ئەم هەڵسوکەوتەش لەڕاستی ودڵسۆزیەوە دوورە،فیرعەون بۆیەوای دەووت کەلەمردن ڕزگاری بێت، لەڕاستیدا خوای گەورە لەدوایین ساتەکانی ژیاندا ئیمان و باوەڕ وەرناگرێت... وە فیرعەون وسەربازانی لەنوقم بون دەربازنەبون. ﴿ ءَآلۡـَٔـٰنَ وَقَدۡ عَصَيۡتَ قَبۡلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلۡمُفۡسِدِينَ ﴿٩١﴾ فَٱلۡيَوۡمَ نُنَجِّيكَ بِبَدَنِكَ لِتَكُونَ لِمَنۡ خَلۡفَكَ ءَايَةٗۚ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ عَنۡ ءَايَٰتِنَا لَغَٰفِلُونَ ﴿٩٢﴾ ﴾یونس (٩١-٩٢) واتە : ﴿(ئەوسا پێی وترا) ئایا ئێستە، (باوەڕ دەهێنیت !) لەکاتێکدا بەڕاستی پێشتر یاخی بوویت و لە ڕیزی ئەوانەدا بوویت کە تۆوی خراپەیان دەچاند ؟!. ئەمڕۆ ئیتر لاشەی تۆ ڕزگار دەکەین تا ببێتە موعجیزەو پەندو ئامۆژگاری بۆئەوانەی دوای تۆ دێن، بەلاّم بەڕاستی زۆربەی خەڵکی لەئایەت و موعجیزەکانی ئێمە بێ ئاگان.﴾وەهەروەها قورئانی پیرۆزباسی سەربازانی فیرعەونمان بۆدەکات کەهەمان چارەنووسیان هەیەکەچارەنووسی

فیرعەون بووە،چونکە بۆستەم ودەستدرێژی شوێنیان کەوتبون (بَغۡيٗا وَعَدۡوًا) (یونس ٩٠) ﴿كَانُواْ خَٰطِـِٔينَ ۝٨﴾ القصص (٨) واتە : ﴿سەربازەکانیشی گوناهبارو تاوانکارو هەڵە بوون﴾. ﴿ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٤٠﴾ القصص (٤٠) واتە : ﴿ستەم کار بوون﴾. ﴿وَظَنُّوٓاْ أَنَّهُمۡ إِلَيۡنَا لَا يُرۡجَعُونَ ۝٣٩﴾ القصص (٣٩) واتە : ﴿گومانیان وابوو بۆلای ئێمە ناهێنرێنەوە﴾. بەو شێوەیە سزای خوایی وەك گەورەکەیان درا بەسەریاندا و خوای گەورە پێکەوە لەناوی بردن وەك دەفەرموێت : ﴿ فَأَخَذۡنَٰهُ وَجُنُودَهُۥ فَنَبَذۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّۖ فَٱنظُرۡ كَيۡفَ كَانَ عَٰقِبَةُ ٱلظَّٰلِمِينَ ۝٤٠ ﴾القصص (٤٠) واتە : ﴿سەرەنجام ئێمە خۆی و سەربازان و دەست و پێوەندیمان پێچایەوە و فڕێمان دانە ناو دەریاکەوە، سەرنج بدەو تەماشا بکەو بزانە : چۆن بوو سەرەنجامی ستەمکاران.﴾. وەهەروەها لەم ئایەتەشدا دەفەرموێت : ﴿ فَٱنتَقَمۡنَا مِنۡهُمۡ فَأَغۡرَقۡنَٰهُمۡ فِي ٱلۡيَمِّ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ۝١٣٦ ﴾ الأعراف (١٣٦) واتە : ﴿جائێمەش تۆڵەمان لێ سەندن و نوقمی دەریامان کردن، چونکە ئەوان بڕوایان بە بەڵگەو موعجیزەکانی ئێمە نەبوو بە درۆیان دادەنا و ئەوان لێی بێ ئاگا بوون.﴾. وەخوای پەروەدگار لەیەك ڕستەدا وەسفی دوای مردنی فیرعەون مان بۆ دەکات و دەفەرموێت : ﴿ وَأَوۡرَثۡنَا ٱلۡقَوۡمَ ٱلَّذِينَ كَانُواْ يُسۡتَضۡعَفُونَ مَشَٰرِقَ ٱلۡأَرۡضِ وَمَغَٰرِبَهَا ٱلَّتِي بَٰرَكۡنَا فِيهَاۖ وَتَمَّتۡ كَلِمَتُ رَبِّكَ ٱلۡحُسۡنَىٰ عَلَىٰ بَنِيٓ إِسۡرَٰٓءِيلَ بِمَا صَبَرُواْۖ وَدَمَّرۡنَا مَا كَانَ يَصۡنَعُ فِرۡعَوۡنُ وَقَوۡمُهُۥ وَمَا كَانُواْ يَعۡرِشُونَ ۝١٣٧ ﴾ الأعراف (١٣٧) واتە : ﴿ئەوسا ئەو قەوم و گەلەی لاواز دەکران و دەچەوسێنرانەوە لەهەموو خۆر هەڵات و

خۆرئاوای ئەو وڵاتەی کەفەرو بەرەکەتمان بەسەردا ڕژاندبوو کردە جێ نشین و بەڵێنی ڕاست و جوانی پەروەردگارت (ئەی موحەممەد) (درودی خوای لێ بێت) جێ بە جێ بوو بۆنەوەی ئیسرائیل بەهۆی ئەوەی کە ئارامیان لەسەر گرت (کەواتە ئەگەر ئومەتی تۆیش ئاوا خۆگربن بێگومان هەمان ئەنجام بەدەست دەهێنن) هەرچیش فیرعەون و قەومەکەی دروستیان دەکردوو ئەو کۆشك و تەلار سازیەی کەدەیانکرد، هەرهەمووی‌یان کاول و وێران کرد.﴾.

## بەشی حەوتەم گەلی سەبەء (لافاوی وێرانکەر)

﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾﴾

سبأ (١٥-١٦) واتە : ﴿سوێند بەخوا بەڕاستی بۆ خەڵکی سەبەء لە وڵاتی خۆیاندا بەڵگە و نیشانەی دەسەڵاتی خوا ئاشکرایە، کەئەویش دوو باخی زۆر گەورە بوو لەلای ڕاست و چەپی ناوچەکەدا، فەرمانیان پێ درابوو کە : بخۆن لەڕزق و ڕۆزی پەروەردگارتان و سوپاس گوزاری بن، وڵاتێکی خۆش و ئاوەدان، پەروەردگارێکی لێ خۆش بوو لێ بووردە... جائەوان لەباتی شوکرانە بژێری و خواپەرستی پشتیان هەڵکردوو بەدەم بانگەوازی خواوە نەچوون، بەهۆی ئەوەوە ئێمەش لافاوێکی وێران کەرمان بەسەردا بەرەڵا کردن، (کەباخ و بێستانی کاول کردن) ئەوسا لەجیاتی ئەو دوو باخە گەورەیە دوو باخی دڕکاوی بەرو بووم تاڵ و درەختی بێبەری وەك دار گەزۆ کەمێك درەختی (سدر) یش کە بەروو بومێکی کەمی هەیە پێمان بەخشین.﴾. کۆمەڵگای سەبەء بەیەکێك لەو چوار شارستانیەتە گەورەیە دادەنرێت کەلەباشووری دوورگەی عەرەبیدا ژیاون، وای بۆ دەچن کە ئەم گەلانە لە نێوان ساڵانی (٧٥٠-١٠٠٠) پیش زاین کۆمەڵگایان بونیاد نابێت وەشارستانیەتەکەشیان لە نزیکەی (٥٥٠) ی دوای زایندا ڕووخاوە، ئەویش بەهۆی ئەو هێرشانەی لەلایەن فارس و عەرەبەکانەوە دوو چاریان دەبوو کە دورسەدە درێژەی کێشا. مێژووی دروست بوونی شارستانیەتی سەبەء تاکو ئێستا جێگەی مشت و مڕو جیاوازیە و هەروا ماوەتەوە، سەبەئیەکان ڕاپۆرتە حکومیەکانیان هەتا ساڵی (٦٠٠) ی پێش زاین نەنوسیوەتەوە لەبەر ئەوە هیچ تۆمارێکی

رابردوویان بەدی ناکرێت لەم مێژووەیاندا. کۆنترین سەرچاوەکان کە ئاماژە بە گەلی سەبەو دەکات دەگەڕێتەوە بۆ تۆمارەجەنگیەکانی سیرجۆنی دووەمی پاشای ئاشووری لەسالانی (٧٠٥-٧٢٢) ی پێش زاین، وەپاشای ئاشووری لەتۆمارەکانیدا ئاماژەدەکات بەپاشای سەبەو لەوتۆمارانەیدا کەئەو نەتەوانەی تیایداتۆمارکردووە کەباجیان بۆدەهێنا. (ئیت عمارا) کۆنترین سەرچاوەیە کە ئاماژە بەشارستانیەتی سەبەئی دەکات، ئەمە سەرە ڕای ئەوەی ڕاست نیە گەر بڵێین ئەم شارستانیەتە لە نزیکەی (٧٠٠) ی پێش زایندا دروست بووە و تەنها پشت بەم سەرچاوەش ببەستین، چونکە ڕەنگە ئەم شارستانیەتە زۆر لە پێشتردا دروست بوو بێت، ئەمەش ئەوە دەگەیە نێت کە مێژووی سەبەو زۆرلە پێش ئەم مێژووەوەیە، وەلە نەخشەکانی (ئاراد ئانارد) کەیەکێکە لەدوایین پاشا کانی شاری ئوور ئەوە هاتووە کە ووشەی (سابوم) (شاری سەبەو) دەگەیەنێت[1]. وەئەگەر تەفسیری

[1] هومیل ، المکتشفات في أرض الأنجیل ، فیلادلفیا ١٩٠٣ ، صفحة ٧٣٩



نەخشی نوسراو بەزمانی گەلی سەبەء

ئەم ووشەیە ڕاست بێت کەشاری سەبەئە، کەواتە مێژووی سەبەء دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی (٢٥٠٠) پێش زاین. سەرچاوە مێژووییەکان کەباس لەم شارستانیەتە دەکەن دەڵێن : ئەم شارستانیەتە هاوشێوەی شارستانیەتی فینیقیەکانە، زۆربەی چالاکی ئەمْ شارستانیەتەش بازرگانی بووە، لە ڕاستیشدا ئەو گەلانە دەسەلاتیان گرتبوو بەسەر ڕێگا بازرگانیەکاندا کەبەباکوری دوورگەکەدا تێپەڕ دەبوو، وە بازرگانە سەبەئیەکان دەبوایە مۆڵەت لە سێر جۆنی دووەمی دەسەڵاتداری ئاشووری وەربگرن کەفەرمانڕەوای ئەو ناوچە بوو کە دەکەوێتە باکووری دوورگەکەوە، ئەگەر بیان ویستایە کالا بازرگانیەکانیان بگەیەننە غەزە و دەریای ناوەڕاست یان لەسەر بازرگانیەکانیان باجێکیان بدایە بەپاشای ئاشووری سێرجونی دووەم، وەکاتێك ئەم بازرگانانەدەستیان کردبەهێنانی باجەکانیان بۆ پاشای ئاشووری ناوەکانیان لەتۆماری ساڵانەی ئەو ناوچەدا تۆمارکرا. سەبەئیەکان لەناو مێژوودا بەگەلێکی پێشکەوتوو ناسراون، چەند ووشەیەك وەك (گەڕانەوە —تەرخانکردن —دروست کردن) بەشێوەیەکی دووبارە لە نەخشی فەرمانڕەواکانیاندا دەرکەوتووە، وەبەنداوی (مأرب) کەیەکێکە لە گرنگترینی بەردنیشانەکانی ئەم شارستانیەتە، وەبەبەڵگەیەکی ڕۆشن دادەنرێت لەسەرئاستی هونەری پێشکەوتوو کەئەم گەلە پێی گەیشتبوون، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کە ئەوان لەبواری سەربازیدا لاواز بووبن، چونکە لەڕاستیدا سوپای سەبەئیەکان یەکێکە لە گرنگترین ئەوبەرد نیشانانەی کەبووتە هۆی بەردەوامی ئەم شارستانیەتە کە بۆماوەیەکی دوورو درێژ دامەزراو جێگیر بووە. سوپای سەبەئیەکان بەهێزترین سوپای ئەوکاتە بوو، وەڕووبەرێکی فراوانی بۆ دەسەلاتدارانی خۆی زامن کردبوو، وەسەبەء توانی ناوچەی قوتبیەکان وێران بکات، وەهەروەها توانیشی دەسەلات لەچەند ناوچەیەکی کیشوەری ئەفریقادا بگرێتەدەست، وەلەساڵی (٢٤) پێش زاینیشدا لەکاتی هەڵمەتی شالاوەکانی بۆ سەر مەغریب، سوپای سەبەئیەکان سوپای مارکوس ئیلوس

غالوسی ڕۆمانییان کەلە میسردا وەك بەشێك لەفەرمانڕەوای ڕۆمانی کە گەورەترین و بەهێزترین هێزو دەسەلاتی ئەو سەردەمە بوون بەبێ ڕکابەر تێك شکاند، ئەتوانین سەبەء بەولاتێکی سیاسی مامناوەند وێنا بکەین هەرچەند ئەم ولاتە وانەبوو کە دوابکەوێت لەبەکارهێنانی هێز لەکاتی پێویستدا، سەبەء بەسوپاو شارستانیەتە پێشکەوتووەکەیەوە یەکێك بوو لە هێزە گەورەکانی ئەو کاتە. وەقورئانی پیرۆزیش باسی بەهێزی سوپای سەبەئی بۆ گێڕاوینەتەوە، وەمتمانە بەخۆ بوونی ئەم سوپایەش لەوەدا دەردەکەوێت کاتێك سەرکردەکانی سوپای سەبەء لەگەڵ شاژنەکەیاندا لە ڕاوێژکردندابوون، وەك لەسورەتی (النمل) دا ئاماژەی پێکراوە : ﴿ قَالُوا۟ نَحۡنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأۡسٍ شَدِیدٍ وَٱلۡأَمۡرُ إِلَیۡكِ فَٱنظُرِی مَاذَا تَأۡمُرِینَ ﴿٣٣﴾ ﴾ النمل (٣٣) واتە : ﴿ئەنجوومەنەکەی وتیان : خۆت دەزانیت کە ئێمە خاوەنی هێزو تواناو دەسەلاتی توندو تیژین، فەرمانیش فەرمانی تۆیە، بیر بکەرەوە و تێفکرە چ فەرمانێك دەدەیت (ئێمە ئامادەین)﴾. (مأرب) پایتەختی سەبەء بوو لەگەڵ ئەوەش زۆر دەوڵەمەند و سەرمایەدار بوو، وەئەم شکۆمەندیەش دەگەڕایەوە بۆ پێگە جوگرافیەکەی، کەئەم پایتەختە زۆر نزیك بووە لە ڕووباری (دهنا) کەخالی بەیەکگەیشتنی بووە لەگەڵ کێوی (بلق) دا کەزۆر شیاوبوو بۆ بونیادنانی بەنداو لەوناوچەیەدا، سەبەئیەکان ئەم تایبەتمەندیەیان قۆستەوە وەلەو ناوچەیەشدا بەنداوێکیان دروست کرد ئیتر شارستانیەتیان پێکهات، سەرەتا دەستیان کرد بەکشتوکاڵ و ئاودێریەوە بەو شێوازەش گەیشتنە ئاستێکی زۆر بەرز لە گەشەسەندندا، بەم شێوەیە (مأرب) ی پایتەخت بووە یەکێك لەوناوچانەی کەلەوکاتەدا زۆر لەگەشە کردندا بوو، نوسەری ئیغریقی بلینی - کەسەردانی ناوچەکەی کردووە زۆر پیایدا هەڵداوە - وتوویەتی کە ناوچەیەکی فراوان و

**هەمیشە سەوزە[1]. بەنداوی (مأرب) بەرزیەکەی گەیشتە (١٦) مەترو پانیەکەشی (٦٠) مەترو درێژیەکەشی (٦٢٠) مەتر، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێت بەم پێیە دەکرێت (٩٦٠٠) هێکتار زەوی و زاری پێ ئاودێری بکرێت، لەوانەش (٥٣٠٠) بۆ دەشتایی باشوور، ئەوەشی دەمێنێتەوە بۆ دەشتاییەکانی باکوور، لەنەخشەکانی سەبەئیدا ئاماژە بەم دوودەشتەکراوە (مأرب و دوو دەشتاییەکە)[2].**

**وەلە قورئانی پیرۆزیشدا زۆر بە وردی ئاماژەی پێکراوە دەفەرموێت : ﴿ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ ﴾ ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەلەم دوو دۆڵە یاخود دەشتاییەدا باخچە و میوەهات هەبووە، وەلەڕاستیدا ئەم ناوچەیە بووە یەکێك لەزۆرترین ناوچەکانی یەمەن کەسەرمایەدارو بەرهەم دار بوو ئەویش بەهۆی بەنداوو ئاوەکانیەوە بوو، هەردوو توێژەر (ج هوفلی فەرەنسی و غلاسری نەمساوی) ئەوەیان سەلماندووە : کەبەنداوی (مأرب) لە دێرزەمانەوە دۆزراوەتەوە، وەبەڵگەنامە نوسراوەکانیش کەبەزمانی (حیمیەر) نوسراون دەگێڕنەوە کەئەم بەنداوە بووەتە مایەی پیت و بەرەکەت و بەخشش لەم ناوچەیەدا، وەچاککردنی ئەم بەنداوەش لەماوەی دوو سەدەی پێنجەم و شەشەمی زایینی تەواو بوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم چاکسازیەش ڕێگرنەبوو لەبەردەم داڕووخانی ئەم بەنداوە لەساڵی (٥٤٢) ی زاینیدا بەنداوەکەش بەهۆی (لافاوێکی وێران کەرەوە) داڕووخا کە قورئانی پیرۆزیش باسی لێوە کردووە، کەبووە هۆی زەرەو زیانێکی گەورە، سەرجەم باخ و بێستان و میوە و باخچەکانی ئەوناوە تیاچوون — کەچەند سەدە بوو سەبەئیەکان چاودێریان کردبوو، چونکە لەسەرهەمان ڕێچکەی باووباپیریان مابوونەوە، دوای وێران بوونی بەنداوەکە سەبەئیەکان بۆماوەیەکی زۆرداماوو گرفتار بوون و هیچیان پێ نەدەکرا...**

---

[1] مارب ، الموسوعة الأسلامية : العالم الأسلامي ، تاريخ ، جغرافية ، إنثوغرافيا ، وقاموس بيبلوغرافيا ، المجلد ٧ ، الصفحات ٣٢٣ ، ٣٣٩

[2] المونودي ، تفهيم القران ، سيلت ٤ ، أستنبول : إنسان يێێلاري ، صفحة ٥١٧

وەئەمەش کۆتایی ئەم گەلە بوو کەسەرەتا بەداڕوخانی بەنداوەکە دەستی پێکرد.



دوای ئەوەی سەبەئیەکان بەنداوی (مارب) یان دروست کرد بوونە خاوەنی گەورەترین شارستانی لەئاوەدانیدا کەبەتازەترین ئامێری تەکنیکی دروستیان کردبوو، لەراستیدا زەویە بەپیتەکان بواری بۆ رەخساندبوون کە دەست بگرن بەسەر رێڕەوە بازرگانیەکاندا، وە بەو هۆیەشەوە لەژیانێکی پێشکەوتودا ژیانیان بەسەربەرن، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پشتیان لەخوای گەورە کرد کە دەبوو سوپاسگوزار بونایە لەسەر ئەو هەموو نازو نیعمەتەی کە دابووی پێیان، لەبەر ئەوەی بەنداوەکەیان روخاو هەرچییان بونیاد نابوو بەلافاوەکە وێران بوو.

هەموو زەوی ناس و شوێنەوارناسەکان ئەوەیان سەلماندوە کەلە قورئانی پیرۆزدا هاتووە،هەروەکو چۆن قورئانی پیرۆز باسی کردووە -کەئەم گەلە شایستەی ئەوەبوون کاتێك گوێیان بۆ ئامۆژگاری پێغەمبەرەکەیان نەگرت و ئەو ڕەوایەیان بەدرۆ خستەوە کە پێغەمبەرەکەیان بۆی هێنا بوون بەسزائ لافاوی وێرانکەر، قورئانی پیرۆز لەسورەتی (سبأ) داوەسفی ئەم لافاوەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت

: ﴿لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ ءَايَةٌ جَنَّتَانِ عَن يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُوا لَهُۥ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ ﴿١٥﴾ فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ وَبَدَّلْنَٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ذَٰلِكَ جَزَيْنَٰهُم بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَٰزِىٓ إِلَّا ٱلْكَفُورَ ﴿١٧﴾﴾ سبأ (١٥-١٧) واته : ﴿سوێند بەخوا بەڕاستی بۆ خەڵکی سەبەء لە وڵاتی خۆیاندا بەڵگە و نیشانەی دەسەڵاتی خوا ئاشکرایە، کەئەویش دوو باخی زۆر گەورە بوو لەلای ڕاست و چەپی ناوچەکەدا، فەرمانیان پێ درابوو کە : بخۆن لەڕزق و ڕۆزی پەروەردگارتان سوپاس گوزاری بن، وڵاتێکی خۆش و ئاوەدان، پەروەردگارێکی لێ خۆش بوو لێ بووردە... جائەوان لەباتی شوکرانە بژێری و خواپەرستی پشتیان هەڵکردوو بەدەم بانگەوازی خواوە نەچوون، بەهۆی ئەوەوە ئێمەش لافاوێکی وێران کەرمان بەسەردا بەڕەڵا کردن، (کەباخ و بێستانی کاول کردن) ئەوسا لەجیاتی ئەو دوو باخە گەورەیە دوو باخی دڕکاوی بەرو بووم تاڵ و درەختی بێبەری وەك دار گەزۆ کەمێك درەختی (سدر) یش کە بەرو بومێکی کەمی هەیە پێمان بەخشین. ئابەو جۆرە سەختە تۆڵەمان لێ سەندن بەهۆی ئەوەوە کە بێ باوەڕو سپڵە بوون، ئایا ئێمە تۆڵە هەرلەکافرو سپڵە ناسێنین ؟!﴾. سەبەئیەکان وەك ئایەتە پیرۆزەکان ئاماژەیان پێ دەکات لەناوچەیەکدا دەژیان کەبەناوبانگ بوو بەجوانی و ڕازاوەیی، وەمیوەهاتی کەوتبوویە سەر ڕێگای بازرگانیش، کەلە ئاستێکی زۆر پێشکەوتوودا بوو سەبارەت بەشارەکانی ئەوسەردەمە. وەبارودۆخی بژێوی ئەم شارە لەئاستێکی زۆر باشدا بوو، وەئەم گەلە هیچ هەوڵێکیان لەسەر شان نەبوو وەك ئایەتەکەش دەفەرموێت ﴿كُلُوا مِن رِّزْقِ رَبِّكُمْ وَٱشْكُرُوا لَهُۥ قُرِئ واتە : ﴿بخۆن لەڕزق و ڕۆزی پەروەردگارتان و سوپاس گوزاری بن﴾، بەڵام خەڵکی ئەم شارە ستایشی پەروەردگاریان نەکردلەسەر

ئەو نازو نیعمەتەی کە خوای گەورە ڕژاندبووی بەسەریاندا، بەڵکو هەموو ئەو بژێوییە باشەی کە هەیان بوو دەیان خستە پاڵ خۆیان و پشتیان لە پەروەردگار دەکردو واشیان گومان دەبرد کە خۆیان خاوەنی ئەم وڵاتەن، وەهەروەها هەرخۆشیان ئەم هەموو بەرەو پێشچوون و گەشەسەندنەیان بۆ خۆیان پەیدا کردووە، لەبری ئەوەی شوکرانە بژێری و خوا پەرستی بکەن پشتیان هەڵکردو لە خۆیان بایی بوون و خۆیان بەگەورە دادەنا وەك ئایەتەکە دەفەرموێت

﴿فَأَعۡرَضُواْ ...﴾ واتە : ﴿پشتیان هەڵکرد...﴾ چونکە هەرچی نازو نیعمەتی خوای گەورە بوو بەسەریانەوە دەیاندایە پاڵ خۆیان و خوای گەورەیان لە بیرکرد، وەسور بوون لەسەر ئەوەی کەئەمە بەرهەمی دەستی خۆیانەو خۆیان بەرهەمیان هێناوە، بەڵام بەهۆی ئەو لەخۆبایی بوونەیانەوە هەموشتێکیان لەدەست چوو زیانێکی گەورەیان لێ کەوت... لەڕاستیدا هەرچیان دروست کردبوو بە دەستەکانیان لافاوە وێرانکەرەکە لەناوی بردن و تیا چوون. قورئانی پیرۆز باسی تۆڵەی خوای گەورەمان بۆ دەکات کەبە ناردنی لافاوێکی وێران کەرەوە بوو ﴿سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ﴾ وەئەم دەربڕینە قورئانیەش چۆنیەتی ڕوودانی کارەساتەکەمان پێ دەڵێت، ووشەی (ٱلۡعَرِمِ ) بەمانای ڕاگر یان بەست دێت (سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ ) واوەسف دەکرێت کەلافاوێك هاتووە تاوەکو ئەم بەست و ڕاگرانە وێران بکات، وەلەڕاستیدا ڕاڤەکەرە موسڵمانەکان بابەتەکانی کات و شوێنەکانیان لەسەر تیشکی زاراوە قورئانیەکان داڕشتووە کەلەوەسفی لافاوە وێرانکاریەکەدا هاتووە، مەودودی لەتەفسیرەکەیدا دەڵێ : وەك چۆن (سَيۡلَ ٱلۡعَرِمِ ) لەدەربڕینەدا بەکار هاتووە، ووشەی (عَرِمَ) لەووشەی (عرمِن) وەرگیراوە کە دانیشتوانی باشوری دوورگە ئەم زاراوەیان بەکار هێناوە، کەبەمانای (بەست، ڕاگر) دێت، وەئەم ووشەیەشمان لەکاتی گەڕان و

بەدواداچوونەکاندا دەستمان کەوتن کەلە باشووری یەمەندا جێ بە جێ کرا کەبەچەند واتایەك بەکاریان هێناوە کە ئەم واتایە دەبەخشێت، بۆ نمونە : ئەم ووشەیە



جارێکی تر بەنداوی سەبە ، گەڕایەوە وەك چۆن لەپێشدا هەبووی



شوێنەواری بەنداوی مارب کە لەوێنەکەی سەرەوەدا دەردەکەوێت، یەکێکە لەبەناوبانگترین جێ دەستی سەبەئیەکان. ئەم بەنداوە بەهۆی لافاوێکی وێرانکەرەوە وێران بوو کە لەقورئانی پیرۆزیشدا ئاماژەی پێکراوە، وەسەرجەم ناوچە کشتوکاڵیەکانیش بوون بەژێر ئاوەوە. لەڕاستیدا شارەگەش بەهۆی داڕوخانی بەنداوەکەوە تیاچوو، لەماوەیەکی زۆر کورتدا وڵاتی سەبە ، داهاتی ئابووری لەدەستدا.

بۆ تەبرەهەی پاشای حەبەشی دادەنرا بەکار هێنراوە، دوای چاککردنەوەی بەنداوی

(مأرب) لەسالانی (٥٤٢-٥٤٣) زاینیدا جارێکی تر بەمانی بەست یان ڕاگر هاتووە، کەواتە (سَيْلَ ٱلْعَرِمِ) واتە { ڕووداوێکی لافاو بووە کەلە دوای وێران بوونی بەنداوەکەوە ڕوویداوە }.



وەك لە قورئاندا باسی ئێرە کراوە دەفەرموێت : ﴿ فَأَعْرَضُوا۟ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ ٱلْعَرِمِ وَبَدَّلْنَـٰهُم بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَىْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَىْءٍ مِّن سِدْرٍ قَلِيلٍ ﴿١٦﴾ ﴾ سبأ (١٦) واتە ﴿جانەوان لەباتی شوکرانە بژێری و خواپەرستی پشتیان هەلکردوو بەدەم بانگەوازی خواوە نەچوون، بەهۆی ئەوەوە ئێمەش لافاوێکی وێران کەرمان بەسەردا بەرەلا کردن، (کەباخ و بێستانی کاول کردن) ئەوسا لەجیاتی ئەو دوو باخە گەورەیە دوو باخی دڕکاوی بەرو بووم تاڵ و درەختی بێبەری وەك دار گەزۆ کەمێك درەختی (سدر) یش کە بەرو بومێکی کەمی هەیە پێمان بەخشین﴾.
ئەم شارە بەتەواوەتی نوقمی ژێرئاو بوو دوای ئەوەی بەهۆی لافاوێکی وێران کارەوە بەنداوەکەمان داڕووخاند، وەتەواوی باخ و بێستانی سەبەئیەکانی کاول کرد

کەمەلێیان کەندبوو، وەهەروەها ئەو دیوارە ڕاگرانەی کەلە نێوانی شاخەکاندا دروستیان کرد بوو وەك ڕاگرێك هیچیان بۆ نەمایەوە بەم شێوەیە لەجیاتی ئەو دوو باخە گەورەیە دووباخی دڕکاوی بەرو بووم تاڵ و درەختی بیٚ بەری وەك دارگەزۆ کەمێك درەختی (سدر) کەبەرو بوومێکی کەی هەیە، پێمان بەخشین[1] .نوسەروشوێنەوارناسی گاور وەخاوەنی کتێبی (الکتاب المقدس کان صحیحاً) دانی بەوەداناوە کەلافاوە وێرانکاریەکە ڕوویداوە، هەروەك چۆن لەقورئانی پیرۆزیشداوەسفی ئەم وێرانکاریە هاتووە هاوکات هەرلەوناوچەیەشدا ڕوویداوە، وەتیاچوونی دانیشتوانەکەشی بەهۆی ئەم داڕووخانەوەبوو،ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئەونموونەی لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە سەبارەت بەگەلی دووباخەکە ئەوەدەسەلێنێت کەئەم ڕووداوە لەڕاستیدا ڕوویداوە[2]. دوابەدوای کارەساتی بەنداوەکە، زەویەکانی ئەم ناوچەیە بوونە بیابان وشك هەڵهاتن، وەگرنگترین ئەو سەرچاوانەی کە گەلی سەبەء هەیانبوو لەگەڵ زەویە کشتوکاڵیە کانیاندا تیا چوون و ورن بوون، ئەوەش سەرەنجامی ئەم گەلە بوو کەبەهۆی پشت هەڵکردن و سوپاسگوزاری نەکردنیان بۆ پەروەردگاریان دووچاری ئەم کارەساتە هاتن، وەدوا بەدوای ئەم کارەساتەش گەلی سەبەء بلاوبوونەوە و زەوی و زارەکانیان جیٚ دەهێشت و ڕووە و باکووری دوورگەکە کۆچیان دەکرد، واتە بەرەو مەککەو سوریا[3]. دوای ئەو سەردەمەی ئەم کارەساتانە تیایداڕوویداوە تۆماری عەهدی قەدیم وعەهدی جەدید دەستی پیٚ کردووە، لەبەر ئەوەیەئەم باسە تەنها لەقورئانی پیرۆزدا هاتووە. شوێنەواری (مأرب) بەوێران بوویی مایەوە کە ڕۆژێك لە ڕۆژان نیشتیمانی سەبەئیەکان بوو،خوای گەورە وەك نیشانەیەك لە نیشانەکانی سزاو تۆڵە ئاگاداری

---

[1] فيرنر كيللر ، ألأنجيل كتأريخ ، إثبات كتاب الكتب ، نيويورك : وليام مورو ، ١٩٦٤ ، صفحة ٢٠٧

[2] الدليل الحديث للمسافرين إلى اليمن ، صفحة ٤٣

[3] مرسى باران ، إيفس الصفحة ٢٣ ، ٢٤

ئەوکەسانە دەکاتەوە کەهەڵەی ئەم گەل و نەتەوەیە دووبارە دەکەنەوە، وەئەوەشمان لەیاد نەچێت تەنها سەبەئیەکان نەبوون کەبەلافاو تیاچوون، ئەوەتا قورئانی پیرۆز باسی چیرۆکی خاوەنی دووباخەکەمان لەسورەتی (الکهف) دا بۆ دەگێڕێتەوە، کەئەم پیاوە دووباخی بە پیت و جوانی هەبوو هاوشێوەی باخەکانی گەلی سەبەوبەلام هەمان هەڵەی ئەو گەلەی دووبارە کردەوە و ئەنجامدا : وەپشتی لەخوای گەورە هەڵکردوو، وای گومان برد کەئەم نازو نیعمەتە بەرهەمی دەستی خۆیەتی وە هەربۆخۆشی دەگەڕێتەوەو هی کەسی ترنیە، قورئانی پیرۆز بەم شێوەیەبۆمان دەگێڕێتەوە : ﴿ ۞ وَٱضۡرِبۡ لَهُم مَّثَلٗا رَّجُلَيۡنِ جَعَلۡنَا لِأَحَدِهِمَا جَنَّتَيۡنِ مِنۡ أَعۡنَٰبٖ وَحَفَفۡنَٰهُمَا بِنَخۡلٖ وَجَعَلۡنَا بَيۡنَهُمَا زَرۡعٗا ﴿٣٢﴾ كِلۡتَا ٱلۡجَنَّتَيۡنِ ءَاتَتۡ أُكُلَهَا وَلَمۡ تَظۡلِم مِّنۡهُ شَيۡـٔٗاۚ وَفَجَّرۡنَا خِلَٰلَهُمَا نَهَرٗا ﴿٣٣﴾ وَكَانَ لَهُۥ ثَمَرٞ فَقَالَ لِصَٰحِبِهِۦ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَنَا۠ أَكۡثَرُ مِنكَ مَالٗا وَأَعَزُّ نَفَرٗا ﴿٣٤﴾ وَدَخَلَ جَنَّتَهُۥ وَهُوَ ظَالِمٞ لِّنَفۡسِهِۦ قَالَ مَآ أَظُنُّ أَن تَبِيدَ هَٰذِهِۦٓ أَبَدٗا ﴿٣٥﴾ وَمَآ أَظُنُّ ٱلسَّاعَةَ قَآئِمَةٗ وَلَئِن رُّدِدتُّ إِلَىٰ رَبِّي لَأَجِدَنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهَا مُنقَلَبٗا ﴿٣٦﴾ قَالَ لَهُۥ صَاحِبُهُۥ وَهُوَ يُحَاوِرُهُۥٓ أَكَفَرۡتَ بِٱلَّذِي خَلَقَكَ مِن تُرَابٖ ثُمَّ مِن نُّطۡفَةٖ ثُمَّ سَوَّىٰكَ رَجُلٗا ﴿٣٧﴾ لَّٰكِنَّا۠ هُوَ ٱللَّهُ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴿٣٨﴾ وَلَوۡلَآ إِذۡ دَخَلۡتَ جَنَّتَكَ قُلۡتَ مَا شَآءَ ٱللَّهُ لَا قُوَّةَ إِلَّا بِٱللَّهِۚ إِن تَرَنِ أَنَا۠ أَقَلَّ مِنكَ مَالٗا وَوَلَدٗا ﴿٣٩﴾ فَعَسَىٰ رَبِّيٓ أَن يُؤۡتِيَنِ خَيۡرٗا مِّن جَنَّتِكَ وَيُرۡسِلَ عَلَيۡهَا حُسۡبَانٗا مِّنَ ٱلسَّمَآءِ فَتُصۡبِحَ صَعِيدٗا زَلَقًا ﴿٤٠﴾ أَوۡ يُصۡبِحَ مَآؤُهَا غَوۡرٗا فَلَن تَسۡتَطِيعَ لَهُۥ طَلَبٗا ﴿٤١﴾ وَأُحِيطَ بِثَمَرِهِۦ فَأَصۡبَحَ يُقَلِّبُ كَفَّيۡهِ عَلَىٰ مَآ أَنفَقَ فِيهَا وَهِيَ خَاوِيَةٌ عَلَىٰ عُرُوشِهَا وَيَقُولُ يَٰلَيۡتَنِي لَمۡ أُشۡرِكۡ بِرَبِّيٓ أَحَدٗا ﴿٤٢﴾ وَلَمۡ تَكُن لَّهُۥ فِئَةٞ يَنصُرُونَهُۥ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَمَا كَانَ مُنتَصِرًا ﴿٤٣﴾ هُنَالِكَ

ٱلْوَلَٰيَةُ لِلَّهِ ٱلْحَقِّ هُوَ خَيْرٌ ثَوَابًا وَخَيْرٌ عُقْبًا ﴿٤٤﴾ ﴾ الكهف (٣٢-٤٤) واته : ﴿ (دەربارەی دۆزەخیان و بەهەشتیان) ئەی موحەممەد (درودی خوای لێ بێت) نمونەیان بۆ بهێنەرەوە بە دوو پیاو کەیەکێکیانمان کردووە بەخاوەنی دوو باخی ڕەزوو دەوری هەردوو باخەکەمان بەدارخورما تەنیوە و لە نێوانیاندا باخ و بێستانمان فەراهەم هێناوە... هەردوو باخەکەش میوەی چاکیان بەرهەم هێناوە و هیچیان لێ خەسار نەبووە و لە نێوان هەردوو باخەکەشدا ڕووبارێکمان هەڵقولاندووە... جائەو خاوەن باخە زۆر سەروەت و سامانی تری هەبوو، بۆیە بە هاوەڵە هەژارە ئیماندارەکەی ووت کاتێك گفت و گۆی لەگەڵدا دەکرد : من سامانی زۆر زیاترم هەیە لەتۆ ماڵ و منالێشم بەهێزترە لەوانەی تۆ. ڕۆژێك چوو بۆ سەردانی یەکێك لەباخەکانی (لەگەڵ هاوەڵەکەیدا) لە کاتێکدا کە ستەم کار بوو لەخۆی (بەهۆی لەخۆ بایی بوونیەوە) بۆیە لەبەر خۆیەوە وتی : گومان نابەم کەئەم باخ و باخاتە هەرگیز لەناو بچێت... واش نازانم قیامەت بەرپا دەبێت، سوێند بەخوا ئەگەر بم گێڕنەوە بۆلای پەروەردگارم دوای مردنم، ئەوە دڵنیام کەلای ئەویش جێگەو ڕێگەو چەندەها باخی ڕازاوەی لەمە باشترم بۆ ئامادەکراوە. هاوەڵە ئیماندارەکەی لەکاتێکدا کە گفتوگۆی لەگەڵدا دەکرد پێی وت : ئایا باوەڕت نەماوە بەو زاتەی کەسەرەتا تۆی لەخاك دروست کردووە ؟! لەوە و دوا نوتفەیەك بوویت پاشان کردیتی بەپیاو ؟! بەلاّم من دەڵێم : - الله- (بەدی هێنەری هەموو بونەوەر) هەرئەو پەروەردگارمە، هیچ جۆرە هاوەڵ و شەریکێك بۆ ئەو پەروەردگارە بڕیارنادەم. دەبوا کاتێك چوویتە ناو باخەکەتەوە بتوتایە : ماشاءالله، هەرچی خوا ویستی لەسەر بێت هەرئەوە پێش دێت ئەم هەموو نازو نیعمەتە بەخششی خوایەو بەهەرکەس بیەوێت دەی بەخشێت، هیچ هێزوو توانایەك بۆ هیچ کەس نیە تەنها بەهۆی خواوە نەبێت، ئەگەر تۆ من دەبینیت ماڵ و سامان و نەوەم لەتۆ کەمترە... ئەوە نزیکەو ئومێدەوارم

پەروەردگارم لەو باخەی تۆ چاکترم پێ ببەخشێت بەلاَیەکیش لەئاسمانەوە بۆ باخەت بنێرێت و بیکاتە زەویەکی ڕووت و خلیسك و وشك... یاخود (دوور نیە) ئاوی باخەکە ڕۆ بچێت و هەرگیز نەتوانیت بەدەستی بهێنیت. (سەرەنجام پێش بینی هاوەڵی خواناسی هاتەدی) سەروەت و سامانی بەبادرا و لەناو برا، ئینجا (بەدەم ئاخ و داخ و هەناسەی ساردەوە) دەستی دەدا بەیەکدا و لەسەر ئەو مەسرەفەی کەتێیدا کردبوو، لەکاتێکدا باخەکە بەسەر یەکدا تەپی بوو ن لە جێی خۆیدا کاول بوو ئەوسا دەیوت : خۆزگە من هیچ جۆرە هاوەڵێکم بۆ خوا بڕیارنەدایا (باوەڕی دامەزراوم تەنها بەو هەبوایا) ئیتر هیچ دەستە و تاقمێك نەبوو جگە لەخوا فریای بکەوێت و لە خەشمی خوا دەربازی بکات، سەرکەوتووش نەبوو. ئالەو کاتانەدا و لەو جۆرە حالاَنەدا یارمەتی و کۆمەك تەنها لەخوای پەروەردگاری حەق و ڕاست و درووست وەردەگیرێت، هەرخۆی چاکترین پاداشتی ئامادە کردووە، چاکترین سەرەنجامیش چاوەڕێی بەختەوەرانە﴾. ئەوەی لە ئایەتەکاندابۆمان ڕوون دەبێتەوە: خاوەنی باخەکە نکولی بوونی خوای نەکرد، بەڵکو بە پێچەوانەوە پێی وابوو ئەگەر هاتوو بگەڕێتەوە بۆلای خوای گەورەش لەم باخ و بێستانەی چاکتر دەست دەکەوێت، وەهەموو ئەو ناز و نیعمەتانەشی کە هەیبوو هەمووی دابویە پاڵ کارەکانی خۆی. تەواوی ئەم بیرکردنەوانەش دەڕژێتە خانەی هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای گەورە، وەگەڕانەوەی هەرچی تایبەت بەخوای گەورەیە بۆ غەیری خوا، وەلەدەستدانی ترس وبیم بەرامبەربەخوالەگەڵ باوەڕبوون بەوەی کەئەم هاوبەشە خاوەنی جیاکەرەوەیەکی تایبەتە هاوکات ئەم پلەوپایەخوای گەورە ئەوی پێ هەدیل داركردووە. ئەمەش ئەو ڕەفتارانە بوو کەگەلی سەبەء دەیانکرد، وەدەرەنجامەکەشیان ئەوە بوو کەولاَت و باخ و بێستانیان ژێرئاوکەوت و نوقم بوو تاوەکو تێ بگەن کەئەوانە خاوەنی هیچ هێزێك نین، بەڵکوتەنها ئەمە ناز و نیعمەتێکە خوای گەورە پێی بەخش بوون...

## بەشی هەشتەم

# حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) و شاژنی سەبەء

﴿قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٤﴾﴾ النمل (٤٤)) واتە : ﴿ئەوسا پێی وترا بچۆرە کۆشکەکەوە، (کاتێك بەرەو کۆشك کەوتەرێ ئاوێك لەبەردەم کۆشکەکەدا بوو بەشووشە سەری گیرا بوو) جاکە بەلقیس بینی وای زانی ئاوێکی زۆرە و قاچی خۆی هەلکرد تاتەڕ نەبێت، سولەیمان وتی ئەو پانتاییە بەشووشە سەری گیراوە (بەلقیس سەرسام بوو لەدەسەلاّت و کۆشك و تەلارو نازو نیعمەتی مادی و مەعنەوی کە خوای گەورە بە سولەیمانی بەخشیوە) بۆیە وتی : پەروەردگارا من بەڕاستی تائێستا ستەمم لەخۆم کردووە، ئیتر والەگەلّ سولەیماندا تەسلیمی خوای پەروەردگاری جیهانیان بووم﴾.

ئەوتۆمارە مێژوویيانە دەرکەوتن کەبەیەك گەیشتنی حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) و شاژنی سەبەئمان بۆ دەگێڕێتەوە وەهەروەها لەگەلّ ئەو شوێنەوارە دۆزراوانەشدا کەلە باشووری یەمەندا ئەنجامدرا، واتە لەسەبەئی کۆندا. وەلەڕاستیدا ئەو پشکنین و بەدوادا چونانەی کەلە شوێنەوارەکانی ئەو ناوچەیەدا ئەنجامدرا ئەوەی دەرخست کە شاژنێك لەو ناوچەیەدا لەنێوانی سالاّنی (٩٥٠) بۆ (١٠٠٠) پێش زایندا ژیاوە، کەگەشتی بەرەو باکوور کردووە بەئاراستەی قودس. وەسورەتی (النمل) وردەکاری ئەو ڕووداوانەی کەلەنێوان ئەم دوو سەرکردەدا

ڕوویانداوە پیشان دەدات، هاوکات لەگەڵ پیشاندانی هێزی ئابووری و سەربازی هەردوو وڵات و ڕژێمی فەرمانڕەوایی تیایدا، چیرۆکەکە کە گەورەترین بەشی سوورەتی (النمل) ی داگیرکردووە دەست پێ دەکات، چیرۆکەکەئاماژە دەکات بە شاژنی سە بەء و ئەوهەواڵانەی کە (پەپوو) گواستیەوە بۆ حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) کەیەکێك بوو لەئەندامانی سوپاکەی، قورئانی پیرۆز ئەم باسەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت : ﴿ فَمَكَثَ غَيْرَ بَعِيدٍ فَقَالَ أَحَطتُ بِمَا لَمْ تُحِطْ بِهِۦ وَجِئْتُكَ مِن سَبَإِۭ بِنَبَإٍ يَقِينٍ ﴿٢٢﴾ إِنِّي وَجَدتُّ ٱمْرَأَةً تَمْلِكُهُمْ وَأُوتِيَتْ مِن كُلِّ شَيْءٍ وَلَهَا عَرْشٌ عَظِيمٌ ﴿٢٣﴾ وَجَدتُّهَا وَقَوْمَهَا يَسْجُدُونَ لِلشَّمْسِ مِن دُونِ ٱللَّهِ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَعْمَٰلَهُمْ فَصَدَّهُمْ عَنِ ٱلسَّبِيلِ فَهُمْ لَا يَهْتَدُونَ ﴿٢٤﴾ أَلَّا يَسْجُدُوا۟ لِلَّهِ ٱلَّذِي يُخْرِجُ ٱلْخَبْءَ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَيَعْلَمُ مَا تُخْفُونَ وَمَا تُعْلِنُونَ ﴿٢٥﴾ ٱللَّهُ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ ٱلْعَرْشِ ٱلْعَظِيمِ ۩ ﴿٢٦﴾ ۞ قَالَ سَنَنظُرُ أَصَدَقْتَ أَمْ كُنتَ مِنَ ٱلْكَٰذِبِينَ ﴿٢٧﴾ ﴾ النمل (٢٢-٢٧) واتە : ﴿سولەیمان زۆر چاوەڕێی نەکرد (پەپوو پەیدا بوو یەکسەر هات و نیشتەوە و) وتی : ئەوەی من پێم زانیوە تۆ پێت نەزانیوە، من لەوڵاتی سەبەئەوە هەواڵێکی ڕاست و دروستم بۆ هێناوی !! بەڕاستی من بۆم دەرکەوت ئافرەتێك فەرمانڕەواییان دەکات و لەهەموو جۆرە دەسەڵات و نازو نیعمەتێکی پێ بەخشراوە، تەختێکی پاشایەتی گەورەشی هەیە، بینیم خۆی و قەومەکەی سوژدە بۆ خۆر دەبەن لەجیاتی خوا، شەیتان کارو کردەوەی چەوتیانی بۆ ڕازاندوونەتەوە، بەو هۆیەوە ڕێبازی ڕاست و دروستی لێگرتوون، بۆیە ئەوان ڕێنموونی وەرناگرن (شەیتان ڕێی لێگرتن) بۆئەوەی سوژدە نەبەن بۆ ئەو خوایەی کە نهێنی دەردەکێشێت لە ئاسمانەکان و زەویدا و دەزانێت ئێوە چی دەشارنەوە و چیش ئاشکرا دەکەن...خوا ئەو زاتەیە کە جگەلەو خوایەکی تر نیە، خاوەنی تەختی

و مەزن و گەورەیە. سولەیمان وتی بە پەپوو : ئێمە لەمە و دوا لەو گوفتارەی تۆ دەکۆڵینەوە تابزانین ڕاست دەکەیت یان لە ڕیزی درۆزنانیت﴾. دوای ئەوەی کەسولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) ئەم هەواڵانەی پێگەیشت لەپەپووەکەوە فەرمانی پێدا : ﴿ ٱذْهَب بِّكِتَـٰبِى هَـٰذَا فَأَلْقِهْ إِلَيْهِمْ ثُمَّ تَوَلَّ عَنْهُمْ فَٱنظُرْ مَاذَا يَرْجِعُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ النمل (٢٨) واتە : ﴿(ئەوسا سولەیمان نامەیەکی نوسی و دای بەپەپوو فەرمانی پێدا کە) : برۆ ئەم نامەیە ببەو (لەشوێنێکی بەر چاودا) بۆیان فڕێ بدەو پاشان (لەپەنایەکدا خۆت حەشار بدەو بزانە دەڵێن چی و چ باس و خواسێك دەکەن﴾. دواجارقورئانی پیرۆز ئەو ڕووداوانە باس دەکات کەلەسەبەئدا ڕوویاندا دوای ئەوەی نامەکەی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) گەیشتەلای شاژنی سەبەء : ﴿ قَالَتْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ إِنِّىٓ أُلْقِىَ إِلَىَّ كِتَـٰبٌ كَرِيمٌ ﴿٢٩﴾ إِنَّهُۥ مِن سُلَيْمَـٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَـٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣٠﴾ أَلَّا تَعْلُوا۟ عَلَىَّ وَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣١﴾ قَالَتْ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَفْتُونِى فِىٓ أَمْرِى مَا كُنتُ قَاطِعَةً أَمْرًا حَتَّىٰ تَشْهَدُونِ ﴿٣٢﴾ قَالُوا۟ نَحْنُ أُو۟لُوا۟ قُوَّةٍ وَأُو۟لُوا۟ بَأْسٍ شَدِيدٍ وَٱلْأَمْرُ إِلَيْكِ فَٱنظُرِى مَاذَا تَأْمُرِينَ ﴿٣٣﴾ قَالَتْ إِنَّ ٱلْمُلُوكَ إِذَا دَخَلُوا۟ قَرْيَةً أَفْسَدُوهَا وَجَعَلُوٓا۟ أَعِزَّةَ أَهْلِهَآ أَذِلَّةً ۖ وَكَذَٰلِكَ يَفْعَلُونَ ﴿٣٤﴾ وَإِنِّى مُرْسِلَةٌ إِلَيْهِم بِهَدِيَّةٍ فَنَاظِرَةٌۢ بِمَ يَرْجِعُ ٱلْمُرْسَلُونَ ﴿٣٥﴾ فَلَمَّا جَآءَ سُلَيْمَـٰنَ قَالَ أَتُمِدُّونَنِ بِمَالٍ فَمَآ ءَاتَىٰنِۦَ ٱللَّهُ خَيْرٌ مِّمَّآ ءَاتَىٰكُم بَلْ أَنتُم بِهَدِيَّتِكُمْ تَفْرَحُونَ ﴿٣٦﴾ ٱرْجِعْ إِلَيْهِمْ فَلَنَأْتِيَنَّهُم بِجُنُودٍ لَّا قِبَلَ لَهُم بِهَا وَلَنُخْرِجَنَّهُم مِّنْهَآ أَذِلَّةً وَهُمْ صَـٰغِرُونَ ﴿٣٧﴾ قَالَ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلْمَلَؤُا۟ أَيُّكُمْ يَأْتِينِى بِعَرْشِهَا قَبْلَ أَن يَأْتُونِى مُسْلِمِينَ ﴿٣٨﴾ قَالَ عِفْرِيتٌ مِّنَ ٱلْجِنِّ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن تَقُومَ مِن مَّقَامِكَ ۖ وَإِنِّى عَلَيْهِ لَقَوِىٌّ أَمِينٌ ﴿٣٩﴾ قَالَ ٱلَّذِى عِندَهُۥ عِلْمٌ مِّنَ ٱلْكِتَـٰبِ أَنَا۠ ءَاتِيكَ بِهِۦ قَبْلَ أَن يَرْتَدَّ إِلَيْكَ طَرْفُكَ ۚ فَلَمَّا رَءَاهُ مُسْتَقِرًّا عِندَهُۥ

﴿ قَالَ هَٰذَا مِن فَضْلِ رَبِّي لِيَبْلُوَنِيٓ ءَأَشْكُرُ أَمْ أَكْفُرُ ۖ وَمَن شَكَرَ فَإِنَّمَا يَشْكُرُ لِنَفْسِهِۦ ۖ وَمَن كَفَرَ
فَإِنَّ رَبِّي غَنِيٌّ كَرِيمٌ ﴿٤٠﴾ قَالَ نَكِّرُوا۟ لَهَا عَرْشَهَا نَنظُرْ أَتَهْتَدِيٓ أَمْ تَكُونُ مِنَ ٱلَّذِينَ لَا يَهْتَدُونَ
﴿٤١﴾ فَلَمَّا جَآءَتْ قِيلَ أَهَٰكَذَا عَرْشُكِ ۖ قَالَتْ كَأَنَّهُۥ هُوَ ۚ وَأُوتِينَا ٱلْعِلْمَ مِن قَبْلِهَا وَكُنَّا مُسْلِمِينَ ﴿٤٢﴾
وَصَدَّهَا مَا كَانَت تَّعْبُدُ مِن دُونِ ٱللَّهِ ۖ إِنَّهَا كَانَتْ مِن قَوْمٍ كَٰفِرِينَ ﴿٤٣﴾ قِيلَ لَهَا ٱدْخُلِي ٱلصَّرْحَ ۖ
فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا ۚ قَالَ إِنَّهُۥ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ ۗ قَالَتْ
رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَٰنَ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾ **النمل (٢٩-
٤٤)** واته ﴿(شاژن هاتوو نامەی بینی و خوێندیەوە، پاشان وەزیران و
ئەنجومەنەکەی خۆی کۆکردەوە و) وتی : ئەی ڕێزداران، بەڕاستی من نامەیەکی
پیرۆزو بەڕێزم بۆ دانراوە. نامەکە لەسولەیمانەوەیە و بەناوی خوای بەخشندەو
میهرەبانەوە (دەست پێ دەکات و دەڵێت) : خۆتان بەگەورە مەزانن و لێم یاخی
مەبن و وەرن موسڵمان ببن (واز لە خۆر پەرستی بهێنن و بەدیهێنەری خۆرو مانگ
و ئەستێرە و زەوی و... هتد، بپەرستن). ئینجا بەلقیس بە ئامادەبوانی وت : ئەی
ڕێزداران ڕاتان چییە، چی بکەم باشە، خۆمن هیچ بڕیارێکم نەداوە هەتا ئێوە لێی
ئاگادار نەبوو بن و ڕاتان لەسەری نەدا بێت. ئەنجومەنەکەی وتیان : خۆت دەزانیت
کە ئێمە خاوەنی هێزو تواناو دەسەڵاتی توندو تیژین، فەرمانیش فەرمانی تۆیە،
بیر بکەرەوە و تێفکرە چ فەرمانێك دەدەیت (ئێمە ئامادەین). بەلقیس وتی
بەڕاستی لەشکری پاشاکان کاتێك چوونە شارو دێهاتەکانەوە، وێران و کاولیان
کردووە و تۆوی خراپەیان چاندووە، کەسانی خاوەن دەسەڵات و پیاوی ناوداری ئەو
شوێنەیان زەلیل و ڕیسوا کردووە و هەمیشە ئەوە پیشەیانە و بەو جۆرە دەکەن و
هەرواش دەبن (بێگومان من حەزلەکارەساتی واناکەم)... بێگومان لەبەر ئەوە من
بڕیارم داوە کە : دیارییەکیان بۆ بنێرم، جا چاوەڕێ دەکەم بزانم نوێنەرەکان چ

هەواڵێکم بۆ دەهێننەوە و (هەڵوێستی سولەیمان چۆن دەبێت). جاکاتێك (نوێنەری) نێردراوەکان گەیشتە لای سولەیمان، (هەواڵی دیاریەکەی گەیاند، سولەیمان بەتوڕەییەوە) پێی وت ئێوەدەتانەوێت بەماڵ و سامان و دیاری کۆمەکیم بکەن ؟! من دڵنیام کە ئەو شتانەی خوا پێی بەخشیوم لەوە چاکترو بەنرختره کە بەئێوەی بەخشیوە، نەخێر من بەو دیاریە دڵشاد نابم، بەڵکو ئێوەن بەدیاریەکەتان شاد دەبن. (ئەی نوێنەری بەڵقیس) بگەڕێرەوە بۆلایان بە خۆت و دیاریەکەتەوە، سوێند بەخوا دەبێت بەسەربازانێکەوە بچینەسەریان کەنەیان دیبێت و نەتوانن بەرگری بکەن، دەبێت دەریان بکەین لەولاتیان لەکاتێکدا ئەوان زەلیل و ریسواو شکاون. (سولەیمان زانی هەڕەشەکەی کاریگەردەبێت بۆیە ڕوو بەئەندامانی حکومەتەکەی) وتی : ئەی خەڵکینە کامتان دەتوانێت تەختی شاژنە بەڵقیسم بۆ بهێنێت پێش ئەوەی بێن بۆلام و تەسلیم ببن. دێوێك لەپەرییەکان وتی : من بۆت دەهێنم پێش ئەوەی دەوام تەواو ببێت و لەجێی خۆت هەستیت، بەڕاستی من بۆ ئەو کارە خۆم بەبەهێزو ئەمین دەزانم. (بەڵام یەکێك لە پیاو چاکان) کە زانست و زانیاری لە (نهێنیەکانی) کتێبی تەورات هەبوو وتی : من بۆت دەهێنم بەچاو تروکاندنێك (دەستی کرد بە نزاو پاڕانەوە و داوای لەخوا کرد)، ئەوسا کتوپڕ سولەیمان بینی تەختی پاشایەتی لەلایدا دانراوە وتی ئەمە لەفەزڵ و بەخششەکانی پەروەردگارمە بۆ ئەوەی تاقیم بکاتەوە.. کە : ئایاسوپاسگوزاردەبم یان ناشوکرو بەدنمەك، جائەوەی سوپاسگوزاربێت ئەوە بەڕاستی سوپاسگوزارە بۆ خۆی، ئەوەش کە سپڵەیە، ئەوە بێگومان پەروەردگارم دەوڵەمەندو بێ نیازەو خاوەنی بەخششە بەهەموان. (ئینجا سولەیمان فەرمانی داو) وتی تەختی پاشایەتیەکەی دەست کاری بکەن (هەندێك ڕەنگ و نەخشی بگۆڕن) سەرنج دەدەین بزانین بەڵقیس دەیناسێتەوە، یان لەو کەسانە دەبێت کە نایناسنەوە.

جاکاتێك بەڵقیس گەیشت، پێی وترا : تەختی پاشایەتی تۆ ئاوایە ؟! بەڵقیس وتی

: هەروەڵێی ئەوە و لەو دەچێت، ئێمە پێش ئەمەش زانیاریمان هەبوو (دەربارەی تواناو دەسەلاتی سولەیمان) ئێمە تەسلیم بووین (نیازی جەنگمان نیە). ئەو شتانەی کە بەلقیس دەیپەرست لەجیاتی خوا بوو بوونە بەربەست لەدڵ و دەروونیدا لەبەرامبەر ئاینی خوادا، بەڕاستی ئەو کاتی خۆی لە ڕیزی قەومێکی بێ باوەڕ و خوا نەناسدا بوو. ئەوسا پێی وترا بچۆرە کۆشکەکەوە، (کاتێك بەرەو کۆشك کەوتەڕێ ئاوێك لەبەردەم کۆشکەکەدا بوو بەشووشە سەری گیرا بوو) جاکە بەلقیس بینی وای زانی ئاوێکی زۆرە و قاچی خۆی هەلکرد تاتەڕ نەبێت، سولەیمان وتی : ئەو پانتاییە بەشووشە سەری گیراوە (بەلقیس سەرسام بوو لەدەسەلات و کۆشك و تەلارو نازو نیعمەتی مادی و مەعنەوی کە خوای گەورە بە سولەیمانی بەخشیوە) بۆیە وتی : پەروەردگارا من بەڕاستی تائێستا ستەمم لەخۆم کردووە، ئیتر والەگەڵ سولەیماندا تەسلیمی خوای پەروەردگاری جیهانیان بووم﴾.

# کۆشکی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت)

ئەو ئایەت و بڕگانەی کەباسی شاژنی سەبەء دەکات بەو شێوەش باسی حەزرەتی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) دەکات، قورئانی پیرۆز باسی وردەکاری تری کۆشکمان بۆ دەکات ئەویش لایەنی گەورەیی خۆی و کۆشك و ولاتەکەیەتی، کۆشکەکەش پێك دێت لەچەند پارچەیەکی هونەری سەرنج ڕاکێش وچەند شتومەکێکی گران بەهای ترکەهەرکەس بیان بینێت سەرسامیان دەبێت، وەدەروازەی کۆشکەکەش لەشووشە دروست کراوەو ڕازێنراوەتەوە، ئەمانە هەمووی بەدەستی سولەیمان پێغەمبەر کاتێك کەپەریەکە هێنایەبەردەستی، قورئانی پیرۆزیش باسی ئەم کۆشکەمان بۆ دەکات کەچۆن کاریگەری لەسەر شاژنی سەبەء دروست کردووە : ﴿ قِيلَ لَهَا ادْخُلِي الصَّرْحَ فَلَمَّا رَأَتْهُ حَسِبَتْهُ لُجَّةً وَكَشَفَتْ عَن سَاقَيْهَا قَالَ إِنَّهُ صَرْحٌ مُّمَرَّدٌ مِّن قَوَارِيرَ قَالَتْ رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي وَأَسْلَمْتُ مَعَ سُلَيْمَانَ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٤٤﴾ ﴾ **النمل** (٤٤) واتە : ﴿ئەوسا پێی وترا بچۆرە کۆشکەکەوە، (کاتێك بەرەو کۆشك کەوتەڕێ ئاوێك لەبەردەم کۆشکەکەدا بوو بەشووشە سەری گیرا بوو) جا کە بەلقیس بینی وای زانی ئاوێکی زۆرە و قاچی خۆی هەلکرد تاتەڕ نەبێت، سولەیمان وتی : ئەو پانتاییە بەشووشە سەری گیراوە (بەلقیس سەرسام بوو لەدەسەلات و کۆشك و تەلارو نازو نیعمەتی مادی و مەعنەوی کە خوای گەورە بە سولەیمانی بەخشیوە) بۆیە وتی : پەروەردگارا من بەڕاستی تائێستا ستەمم لەخۆم کردووە، ئیتر والەگەڵ سولەیماندا تەسلیمی خوای پەروەردگاری جیهانیان بووم﴾. کۆشکی سولەیمان (سەلامی خوای لێ بێت) لەئەدەبی یەهودیدا بە ((پەرستگای سولەیمان)) ناودەبرێت، لەم کۆشکەش یاخود لەم پەرستگایەدا هیچ شتێك نەماوەتەوە جگە لە (دیواری ڕۆژئاوای) نەبێت،

کەجولەکە بەمە دەڵێن (دیواری گریەنەر) کەئەمەش بۆچوونی نوسەرەکەیەتی، ئەو هۆکارانەی کەلەپشت وێرانبونی ئەم کۆشکەوەن و چەند ناوچەیەکی تری قودس هەڵسوکەوتی خۆبەگەورە دانانی نەوەکانی دوای یەهودن کەلە قورئانی پیرۆز دا بۆمان دەگێڕێتەوە : ﴿وَقَضَيْنَآ إِلَىٰ بَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ فِى ٱلْكِتَٰبِ لَتُفْسِدُنَّ فِى ٱلْأَرْضِ مَرَّتَيْنِ وَلَتَعْلُنَّ عُلُوًّا كَبِيرًا ﴿٤﴾ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ أُولَىٰهُمَا بَعَثْنَا عَلَيْكُمْ عِبَادًا لَّنَآ أُو۟لِى بَأْسٍ شَدِيدٍ فَجَاسُوا۟ خِلَٰلَ ٱلدِّيَارِ ۚ وَكَانَ وَعْدًا مَّفْعُولًا ﴿٥﴾ ثُمَّ رَدَدْنَا لَكُمُ ٱلْكَرَّةَ عَلَيْهِمْ وَأَمْدَدْنَٰكُم بِأَمْوَٰلٍ وَبَنِينَ وَجَعَلْنَٰكُمْ أَكْثَرَ نَفِيرًا ﴿٦﴾ إِنْ أَحْسَنتُمْ أَحْسَنتُمْ لِأَنفُسِكُمْ ۖ وَإِنْ أَسَأْتُمْ فَلَهَا ۚ فَإِذَا جَآءَ وَعْدُ ٱلْءَاخِرَةِ لِيَسُۥٓـُٔوا۟ وُجُوهَكُمْ وَلِيَدْخُلُوا۟ ٱلْمَسْجِدَ كَمَا دَخَلُوهُ أَوَّلَ مَرَّةٍ وَلِيُتَبِّرُوا۟ مَا عَلَوْا۟ تَتْبِيرًا ﴿٧﴾﴾ الأسراء (٤-٧) واتە : ﴿لە کتێبی تەوراتدا یان لە (لوح المحفوظ) دا بڕیارمان داوە و پێمان ڕاگەیاندوون کە سوێند بەخوا ئێوە (لەبەرنامەی ئێمە لادەدەن و یاخی دەبن) و فەسادو خراپە دوو جار لەزەویدا بەرپا دەکەن، (لەغەفڵەتی خەڵکیدا) زۆر گەشە دەکەن و دەسەڵاتێکی زۆر گەورە بەدەست دەهێنن. جاکاتێك (ئەی جوەکان) بەڵێنی یەکەمیان دێت (کەتۆڵەتان لێ بکەینەوە) بەندەتایبەتیەکانی خۆمان دەنێرینە سەرتان کەخاوەنی هێزو توانای زۆرن، ئیتر ئەوان بەهەموو کون و کەلێنێکی قەلاو شارۆچکەکاندا دەسوڕێنەوە و دەگەڕێن بە شوێنیاندا و ئەم هەڕەشەی تۆڵەیە بەڵێنی خوایە و دەبێت بێتەدی. لەدوای ئەو لاوازیەتان تۆڵەتان دەدەینەوە و دەسەڵاتمان بەسەر ولاتی ئیمانداراندا پێ دەدەین و ماڵ و سامان و کوڕی زۆرتان پێ دەبەخشین و واتان لێ دەکردن کە زۆر ئامادە بن بۆ هێرش بردن و پەلاماردان و پڕوپاگەندە کردن. ئەگەر (لەکاتی دەسەڵاتدا) چاکە بکەن، ئەوە هەربۆ خۆتان چاك و بەسوودە، ئەگەر خراپەو تاوانیش بکەن ئەوە هەریەخەی خۆتان

دەگرێتەوە، جاکاتێك کەنێرەی ئەنجامدانی بەڵێنی دواجار دێت، ئیمانداران کارێکتان پێ دەکەن کەلەڕووخسارتاندا ڕەنگ بداتەوە، ئەوسا دەبا ئیماندار بچنە مزگەوتەوە وەکو یەکەمجار چوونە ناوی، دەبا ئیتر ئیمانداران تۆڵەی خۆیان بکەنەوە و دەستیان بسەر هەرچیەکدا دەڕوات درێغی نەکەن (چونکە ئەوان لە ستەم و زۆرداری و خوێن ڕێژی درێغیان نەکرد))». لەڕاستیدا ئەوانە شیاوی ئەو سزایەن کەئایەتەکانی قورئان باسی لێوە کردن ئەویش لەبەریاخی بوون و سوپاس گوزاری نەکردنی بەخششەکانی خوای گەورەوەبوو، بەم شێوەیە سزای خوای گەورە داباری بسەریاندا، وەبەردەوام بەشارو ناوچەو وڵاتەکاندا دەگەڕان بەبێ نیشتیمانێك تاوەکو گەیشتنە زەوی پیرۆز لەسەردەمی حەزرەتی سولەیماندا (سەلامی خوای لێ بێت)، بەڵام ئەوان بەجێگری و شێوازی خۆشگوزەرانی نەمانەوە، بەڵکو جارێکی ترتووشی کاولکاری هێنرانەوە، چونکە هەمووسنوورێکی خواییان دەبەزاندو هەرخەریکی یاخی بوون و خراپەکاری بوون کە لەبنچینەدابۆیان ماوەتەوە، وەجارێکی تر جولەکە لەڕابووردویەکی نزیکدا گەڕانەوە بۆئەوەی هەمان تاوچە داگیر بکەنەوەو دەست بکەنەوە بەبێ کەڵکی وخراپەکاری لەسەرزەویدا، بەهەمان شێوە هەروەك چۆن پێش یەکەم ئاگادارکردنەوە ڕەفتاریان کرد.




**کۆشکی سولەیمان پێکهاتوە لە نوێترین هونەری تەکنیکی سەردەمی خۆی و ڕواڵەتی جوانی، وێنەکەی سەرەوە ناوەندی قودس دەردەخات لەماوەی دەسەڵاتداریەتی حەزرەتی سولەیماندا:**

**١-دەرگای باشوری ڕۆژئاوا ٢-کۆشکی شاژن ٣-کۆشکی سولەیمان ٤-دەروازەکەی لە٣٢ کۆڵەکە پێکهاتوە ٥-دادگای یاسا ٦-دارستانی لوبنان ٧-ماڵی قەشە گەورەکان ٨-دەروازەی پەرستگاکە ٩-حەوشەی پەرستگاکە ١٠-پەرستگا.**



کۆشکی سولەیمان



دوای وێران بوونی پەرستگای سولەیمان جگە لەدیواری رۆژئاوای کە جولەکەکان گۆڕیبوویان بۆ دیواری گریەنەر هیچی تر نەمابووەوە.

دوای ئازادکردنی قودس لەلایەن موسـ‍ـ‍ـڵمانەکانەوە لەسـ‍ـ‍ـەدەی حەوتەمـ‍ـ‍ـدا، موسـ‍ـ‍ـڵمانەکان مزگەوتی عومەرو (قبة الصخرة) یان دروست کرد، لەکاتێکدا رۆژێك لـ‍ـ‍ـەرۆژان ئـ‍ـ‍ـەم پەرسـ‍ـ‍ـتگایە دروستکرابوو، وەبەردەوام قودس پارێزگاری لەمە دەکات. (قبة الصحرة) لـ‍ـ‍ـەلای راسـ‍ـ‍ـتیەوە دەردەکەوێت

## بەشی نۆیەم هاوەڵانی ئەشکەوت

﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَـٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَـٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ ﴾

سورەتی هەژدە لە قورئانی پیرۆزدا ناوی سورەتی (الكهف) ە و باس لە چیرۆکی کۆمەڵە لاوێك دەکات کە پەنایان برد بۆ یەکێك لەئەشکەوتەکان تاوەکو لەچاوی دەسەڵاتدارە بێ باوەڕەکەیان خۆیان حەشار بدەن کە بڕوای بە خوای گەورە نەبو وەبڕواداەرەکانیشی لەهەمان کاتدا دەچەوساندەوە، ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزیش دەربارەی ئەم چیرۆکە زانیاری تەواومان دەداتێ کە دەفەرموێت :﴿ أَمْ حَسِبْتَ أَنَّ أَصْحَـٰبَ ٱلْكَهْفِ وَٱلرَّقِيمِ كَانُوا۟ مِنْ ءَايَـٰتِنَا عَجَبًا ﴿٩﴾ إِذْ أَوَى ٱلْفِتْيَةُ إِلَى ٱلْكَهْفِ فَقَالُوا۟ رَبَّنَآ ءَاتِنَا مِن لَّدُنكَ رَحْمَةً وَهَيِّئْ لَنَا مِنْ أَمْرِنَا رَشَدًا ﴿١٠﴾ فَضَرَبْنَا عَلَىٰٓ ءَاذَانِهِمْ فِى ٱلْكَهْفِ سِنِينَ عَدَدًا ﴿١١﴾ ثُمَّ بَعَثْنَـٰهُمْ لِنَعْلَمَ أَىُّ ٱلْحِزْبَيْنِ أَحْصَىٰ لِمَا لَبِثُوٓا۟ أَمَدًا ﴿١٢﴾ نَّحْنُ نَقُصُّ عَلَيْكَ نَبَأَهُم بِٱلْحَقِّ ۚ إِنَّهُمْ فِتْيَةٌ ءَامَنُوا۟ بِرَبِّهِمْ وَزِدْنَـٰهُمْ هُدًى ﴿١٣﴾ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا۟ فَقَالُوا۟ رَبُّنَا رَبُّ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَا۟ مِن دُونِهِۦٓ إِلَـٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَآ إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَـٰٓؤُلَآءِ قَوْمُنَا ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ ءَالِهَةً ۖ لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَـٰنٍۭ بَيِّنٍ ۖ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ ٱفْتَرَىٰ عَلَى ٱللَّهِ كَذِبًا ﴿١٥﴾ وَإِذِ ٱعْتَزَلْتُمُوهُمْ وَمَا يَعْبُدُونَ إِلَّا ٱللَّهَ فَأْوُۥٓا۟ إِلَى ٱلْكَهْفِ يَنشُرْ لَكُمْ رَبُّكُم مِّن رَّحْمَتِهِۦ وَيُهَيِّئْ لَكُم مِّنْ أَمْرِكُم مِّرْفَقًا ﴿١٦﴾ ۞ وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَـٰتِ ٱللَّهِ ۗ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾

وَتَحۡسَبُهُمۡ أَيۡقَاظٗا وَهُمۡ رُقُودٞۚ وَنُقَلِّبُهُمۡ ذَاتَ ٱلۡيَمِينِ وَذَاتَ ٱلشِّمَالِۖ وَكَلۡبُهُم بَٰسِطٞ
ذِرَاعَيۡهِ بِٱلۡوَصِيدِۚ لَوِ ٱطَّلَعۡتَ عَلَيۡهِمۡ لَوَلَّيۡتَ مِنۡهُمۡ فِرَارٗا وَلَمُلِئۡتَ مِنۡهُمۡ رُعۡبٗا ﴿١٨﴾
وَكَذَٰلِكَ بَعَثۡنَٰهُمۡ لِيَتَسَآءَلُواْ بَيۡنَهُمۡۚ قَالَ قَآئِلٞ مِّنۡهُمۡ كَمۡ لَبِثۡتُمۡۖ قَالُواْ لَبِثۡنَا
يَوۡمًا أَوۡ بَعۡضَ يَوۡمٖۚ قَالُواْ رَبُّكُمۡ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثۡتُمۡ فَٱبۡعَثُوٓاْ أَحَدَكُم بِوَرِقِكُمۡ هَٰذِهِۦٓ
إِلَى ٱلۡمَدِينَةِ فَلۡيَنظُرۡ أَيُّهَآ أَزۡكَىٰ طَعَامٗا فَلۡيَأۡتِكُم بِرِزۡقٖ مِّنۡهُ وَلۡيَتَلَطَّفۡ وَلَا
يُشۡعِرَنَّ بِكُمۡ أَحَدًا ﴿١٩﴾ إِنَّهُمۡ إِن يَظۡهَرُواْ عَلَيۡكُمۡ يَرۡجُمُوكُمۡ أَوۡ يُعِيدُوكُمۡ
فِي مِلَّتِهِمۡ وَلَن تُفۡلِحُوٓاْ إِذًا أَبَدٗا ﴿٢٠﴾ وَكَذَٰلِكَ أَعۡثَرۡنَا عَلَيۡهِمۡ لِيَعۡلَمُوٓاْ أَنَّ وَعۡدَ
ٱللَّهِ حَقّٞ وَأَنَّ ٱلسَّاعَةَ لَا رَيۡبَ فِيهَآ إِذۡ يَتَنَٰزَعُونَ بَيۡنَهُمۡ أَمۡرَهُمۡۖ فَقَالُواْ ٱبۡنُواْ عَلَيۡهِم
بُنۡيَٰنٗاۖ رَّبُّهُمۡ أَعۡلَمُ بِهِمۡۚ قَالَ ٱلَّذِينَ غَلَبُواْ عَلَىٰٓ أَمۡرِهِمۡ لَنَتَّخِذَنَّ عَلَيۡهِم مَّسۡجِدٗا
﴿٢١﴾ سَيَقُولُونَ ثَلَٰثَةٞ رَّابِعُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ وَيَقُولُونَ خَمۡسَةٞ سَادِسُهُمۡ كَلۡبُهُمۡ رَجۡمَۢا
بِٱلۡغَيۡبِۖ وَيَقُولُونَ سَبۡعَةٞ وَثَامِنُهُمۡ كَلۡبُهُمۡۚ قُل رَّبِّيٓ أَعۡلَمُ بِعِدَّتِهِم مَّا يَعۡلَمُهُمۡ إِلَّا
قَلِيلٞۗ فَلَا تُمَارِ فِيهِمۡ إِلَّا مِرَآءٗ ظَٰهِرٗا وَلَا تَسۡتَفۡتِ فِيهِم مِّنۡهُمۡ أَحَدٗا ﴿٢٢﴾ وَلَا تَقُولَنَّ
لِشَاْيۡءٍ إِنِّي فَاعِلٞ ذَٰلِكَ غَدًا ﴿٢٣﴾ إِلَّآ أَن يَشَآءَ ٱللَّهُۚ وَٱذۡكُر رَّبَّكَ إِذَا نَسِيتَ وَقُلۡ
عَسَىٰٓ أَن يَهۡدِيَنِ رَبِّي لِأَقۡرَبَ مِنۡ هَٰذَا رَشَدٗا ﴿٢٤﴾ وَلَبِثُواْ فِي كَهۡفِهِمۡ ثَلَٰثَ مِاْئَةٖ
سِنِينَ وَٱزۡدَادُواْ تِسۡعٗا ﴿٢٥﴾ قُلِ ٱللَّهُ أَعۡلَمُ بِمَا لَبِثُواْۖ لَهُۥ غَيۡبُ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۖ
أَبۡصِرۡ بِهِۦ وَأَسۡمِعۡۚ مَا لَهُم مِّن دُونِهِۦ مِن وَلِيّٖ وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا ﴿٢٦﴾ ﴾

**الكهف (٩-٢٦) واتە : ﴿ئایا وادادەنێیت کەبەڕاستی یارانی ئەشکەوت و تابلۆ (کەناویانی لەسەر نوسراوە) لەنیشانە و بەڵگە سەرسوڕهێنەرەکانی ئێمەن ؟!.**

کاتێك لاوەکان پەنایان بردە بەر ئەشکەوتەکە .ونزایان کرد وتیان : پەروەردگارا لەلایەن خۆتەوە رەحمەت و میهرەبانی تایبەتیمان پێ ببەخشەو لەسۆزی خۆت بەهرەوەرمان بکەو رێگەی رزگاری و سەرفرازیمان بۆ بسازێنە لەم کارەماندا. ئینجا (ئێمەش نزامان گیرا کردن) پەردەمان هێنا بەسەر گوێیاندا، (تابەئارامی) چەندەها ساڵ لەئەشکەوتەکەدا بۆ خۆیان (بەخەوتوویی) بمێننەوە. پاشان (دوای ماوەیەکی دوورو درێژ) لەخەو خەبەرمان کردنەوە و لەنوستن هەستان تابزانین کام دەستەیەیان دەزانن کەچەندە خەویان لێ کەوتووە. ئێمە بەڕاستی و دروستی هەواڵی بەسەرهاتی ئەو لاوانەت بۆ دەگێڕینەوە، بەڕاستی ئەوانە لاوانێك بوون باوەڕی دامەزراویان هێنابوو بەپەروەردگاریان، ئێمەش زیاتر لەنوری ئیمان و هیدایەت بەهرەوەرمان کردن. ئێمەش دڵەکانیانمان دامەزراو کردوو ترسمان تێدا نەهێشت کاتێك هەستان و وتیان : پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەکان و زەویە، هەرگیزهاناو هاوار بۆ هیچ خوایەکی تر نابەین جگەلەو، ئەگەر لەو ڕاستیە لابدەین، سوێند بەخوا ئەوە بێ گومان ئێمە لەو کاتەدا قسەی نابەجێ و نادروستمان کردووە. ئائەوانە قەومەکەی خۆمانن شتی تریان کردووە بە خوای خۆیان، دەبا بەڵگەیەکی ئاشکراش بهێنن لەسەریان، جاکێ ستەم کارترە لەوەی کە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێ ؟!. (هەندێکیان وتیان) جائێستەکە ئێوە بڕیارتان داوە خۆتان دوورە پەرێز بگرن لەم خەڵکەو لەو شتانە کەلە جیاتی خوا دەیانپەرستن، تەنها خواپەرستی بکەن دەپەنا بەرنە بەرئەشکەوتەکە ئەوکاتە پەروەردگارتان رەحمەت و میهرەبانی خۆیتان بەسەردا پەخش دەکاتەوە و هۆکاری حەوانەوەتان بۆ دابین دەکات کاتێ کەخۆر هەڵدێت تیشکەکەی دەبینیت لەلای ڕاستی ئەشکەوتەکەوە دەدات و تێپەڕدەبێت، کاتێکیش کە ئاوا دەبێت لەلای چەپی دەدات و تیشکەکەیان بەسەردا تێپەڕدەبێت، لەوکاتەدا ئەو لاوانە لەناو بۆشایی فراوانی ئەشکەوتەکەدا ڕاکشاون، ئەوە هەمووی بەڵگەو نیشانەیەکە لەبەڵگەو نیشانەکانی

خوا، ئەوەی خوا هیدایەتی بدات هەرئەو هیدایەت دراوە و ڕێنمویی وەرگرتووە، ئەوەش خوا گومڕای بکات، ئەوەهەرگیز کەسێکت دەست ناکەوێت کە پشتیوانی بکات و ڕێنمویی بکات. (پاشان دیمەنیان دەهێنێتە بەرچاووەفەرموێت) وادەزانیت بەخەبەرن لەکاتێکدا بەخەوتوویی ڕاکشاون، ئێمە ئەم دیوو ئەو دیویان پێ دەکەین و بەلای چەپیاندا هەڵیان دەگێڕینەوە (بۆئەوەی زەوی جەستەیان نەخوات و هەوای پاك لێیان بدات)، سەگەکەشیان چەمۆڵەی داداوە لەبەردەم کەلەبەری ئەشکەوتەکەدا، ئەگەرتۆ (ئەی پێغەمبەر. درودی خوای لێ بێت، ئەی ئیماندار) سەرێکت بکێشایە بۆسەر دیمەنیان ئەوە بەپەلە هەڵدەهاتیت و ترسێکی زۆر لە دیمەنیان دەچووە دڵتەوە. هەربەو شێوەیەش کەبەدەسەڵاتی خۆمان خەومان لێ خستن خەبەرمان کردنەوە، بۆئەوەی لەیەکتر بپرسن، یەکێکیان وتی : باشە ئەوە ئێوە وادەزانن چەندە خەوتووین، هەندێکیان وتیان : ڕۆژێك یان کەمتر لەڕۆژێك خەوتووین، هەندێکی تریان وتیان : مەگەر پەروەردگارتان خۆی بزانێت چەندە خەوتوون، دیارە هەستیان بە برسێتی کردووە، بۆیە لاوێکیان پێشنیاری کردوو وتی : دەیەکێکتان بنێرن بائەم پارە زیوەتان ببات بۆ شار، جاسەرنج بدات بزانێت کێ خۆراکی خاوێنتری هەیە باڵە و خۆراکەتان بۆ بکرێت و بۆتان بهێنێت، باوریا و نەرم و نیان و لەسەر خۆش بێت، باکەسیش ئاگادارنەکات لەکارو بارتان. چونکە بەڕاستی ئەو بت پەرستانە ئەگەر پێتان بزانن، ئەوە بەرد بارنتان دەکەن یان دەتان گێڕنەوە بۆ ناو ئاینی خۆیان، ئەوکاتە ئیتر هەگیز سەرفراز نابن. (وادیارە کەیەکێکیان ناردووە بۆ کڕینی خواردەمەنی و پارە زیوەکەی دەرهێناوە، کابرای دووکاندار خەڵکی لەدەور کۆدەکاتەوە، چونکە مێژووی سکەی پارەکە زۆر کۆن بوو، ئەوسا بۆیان دەرکەوت ئەم لاوە یەکێکە لەوانەی کەچەند سەدەیەك لەمەو بەر لەدەست پاشای بت پەرست و ستەمکار هەڵاتوون، خەڵکەکە لەگەڵ لاوەکەدا بەرەو ئەشکەوتەکە بۆ سەردانی ئەوانی تر چوون) ئابە و شێوەیەش خەڵکیمان ڕێنمویی

کرد تابیان دەژینەوە و بزانن و دڵنیابن کەبەڕاستی بەڵێنی خوا لەزیندوو کردنەوەی مردووەکاندا حەق و ڕاستەو بێگومان قیامەتیش هەر دێت و هیچ گومانی تێدا نیە (لەوێ کەبەدیداریان شاد بوون لاوەکان خەوی یەکجارییان لێ کەوت) لەکاتێکدا ئەو خەڵکە کێشەیان بوو لەسەرمەسەلەی زیندوو بوونەوە ئینجا هەندێکیان وتیان : باچەند خانوویەکیان لەسەر دروست بکەن، پەروەردگاریان زانایە پێیان، بەلاّم ئەوانەی کە دەسەلاّتیان هەبوو بەسەر کارو باریاندا وتیان : بێگومان مزگەوتێکیان بەسەرەوە دروست دەکەین (کەئەمەش شتێکی داهێنراو بوو لە ئاینی گاوریدا کەلەسەر گۆڕی پیاوچاکان پەرستگایان دروست دەکرد). جا (دەربارەی ژمارەی یارانی ئەشکەوت) لەئاییندەدا دەڵێن : سیانن و چوارەمیان سەگەکەیانە، هەندێکی تر دەڵێن : پێنجن و شەشەمیان سەگەکەیانە، کەهەمو ئەمانە قسەیەکی بێ بەڵگەن و چێو لەتاریکی کوتانە، هەندێکی تر دەڵێن حەوتن و هەشتەمیان سەگەکەیانە، ئەی موحەممەد (دروودی خوای لێ بێت) پێیان بڵێ : هەرپەروەردگارم خۆی دەزانێ ژمارەیان چەندە، تەنها کەمێك نەبێت کەس ژمارەیان نازانێت، لەبەرئەوە موجادەلە مەکە لەبارەی ئەوانەوە جگەلە موجادەلەیەکی ئاشکرا و ئاسان نەبێت، دەربارەشیان لە هیچ کەسێك لە خاوەنانی کتێب مەپرسە، هەرگیز دەربارەی هیچ شتێك و هیچ کارێك مەڵێ، من بەڕاستی سبەینێ ئەنجام دەری ئەو کارەم... مەگەر بڵێیت : ئەگەر خوا بیەوێت و ویستی پەروەردگاری لەسەر بێت، یادی پەروەردگاریشت بکە کاتێك کەلە بیرت چوو بڵێیت (إنشاءالله ) لەئەنجامدانی هەرکارێکدا بڵێ ئومێدەوارم پەروەردگارم ڕێنموییم بکات بۆ بەڵگەیەکی نزیکتر لەمە تابەو شێوەیەی کە پێی چاکە و لای پەسەندە جێ بەجێی بکەم. ئەوسا ئیتر یارانی ئەشکەوت سێ سەد ساڵی تەواوی (هەتاوی) لەئەشکەوتەکەیاندا مانەوە (ئەگەر بەساڵی مانگی حیسابی بکەیت) نۆدانە ساڵی تریشیان خستەسەر (واتە دەکاتە ٣٠٩ ساڵ خەویان لێ کەوت). پێیان بڵێ : خوا

خۆی دەزانێت بەماوەی مانەوەیان لەئەشکەوتەکەدا، هەربۆ خوایە زانینی نهێنی ئاسمانەکان و زەوی، ئای کەچەندە بینەرو بیسەرە خوای گەورە ! هیچ کەس نیە جگەلەو زاتە پشت و پەنای خەڵکی بێت، بێگومان ئەو خوایە لەکارو فەرمانڕوایەتیەکەیدا هیچ کەس ناکات بە هاوتاو هاوبەشی خۆی﴾. بیروڕاباوەکان سەبارەت بەهاوەڵانی ئەشکەوت کەلەپەڕتووکە ئیسلامی و مەسیحیەکاندا تا ئەندازەیەك وەك یەك پیایدا هەڵدەدەن، دەڵێت : ئەو کۆمەڵە لاوانە لەسایەی ئیمپراتۆر دیسیوسی ستەمکاری ڕۆمانیدادەژیان، وەئەو لاوانە ڕووبەڕووی دیسیوسی یاخی وەستانەوەو گەل و نەتەوەکەشیان ئاگادارکردەوە و جارلەدوای جار ئامۆژگاریان دەکردن کەدەست بگرن بەئاینی ڕاست و دروستی پەروەردگارەوە و دەستی لێ بەرنەدەن، بەڵام گوێ پێنەدانی گەلەکەیان بۆ ئەو بانگەوازە و بێ ئاگاییان بۆی لەپاڵ ئەوەدائەوچەوساندنەوەیە کەتوشیان هات لەلایەن ئەو دەسەڵاتدارە نارەوایەیانەوە کەتاسنووری مردن ولەناوچوون وتەفروتونابوون ترسناك بوو، ئەمەش وای لێکردن کە نیشتیمانەکەیان بەجێ بهێڵن. تۆمارە مێژووییەکان ژمارەیەك قەشەی گەورەی مەسیحی ئاشکرا دەکات کە سیاسەتی چەوساندنەوە و تۆقاندن و سزادانیان پیادە دەکرد دەرهەق بە بڕوادارە سەرەتاکانی مەسیحیەت کە پابەند بوون بەئاینی سەرەکی خاوێنی مەسیحیەوە. فەرمانڕەوای ڕۆمانی بیلینوس کەفەرمانڕەوایی باکووری ئەنازۆلی دەکرد لەدەورو بەری سالانی (٦٩-١١٣دوای زاین) دا لەنامەیەکدا کە بۆ ئیمپراتۆر تریانوس نوسیویەتی تیایدا هاتووە کە دەڵێ کۆمەڵە مەسیحیەك سزادران بەهۆی مل نەدانیان بۆ بەندایەتی کردنی پەیکەری ئیمپراتۆر، وەئەم نامەیەش بەیەکێك لەگرنگترین بەڵگەنامەکان دادەنرێت کە ئەو چەوساندنەوانەشی سەلماندووە کە مەسیحیە سەرەتاکانی ئەوکاتە دووچاریان دەهاتن، وەلەباروودۆخێکی لەم شێوازەشدا ئەو کۆمەڵەلاوە کە داواکرالێیان

پەیکەری ئیمپراتۆر بپەرستن ئەوانیش ئەوداوایانەیان ڕەتکردەوەو وتیان : ﴿ وَرَبَطْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ إِذْ قَامُوا فَقَالُوا رَبُّنَا رَبُّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ لَن نَّدْعُوَ مِن دُونِهِ إِلَٰهًا ۖ لَّقَدْ قُلْنَا إِذًا شَطَطًا ﴿١٤﴾ هَٰؤُلَاءِ قَوْمُنَا اتَّخَذُوا مِن دُونِهِ آلِهَةً ۖ لَّوْلَا يَأْتُونَ عَلَيْهِم بِسُلْطَانٍ بَيِّنٍ ۖ فَمَنْ أَظْلَمُ مِمَّنِ افْتَرَىٰ عَلَى اللَّهِ كَذِبًا ﴿١٥﴾ ﴾ **الكهف** (١٤-١٥) واتە : ﴿ئێمەش دڵەكانیانمان دامەزراو كردوو ترسمان تێدا نەهێشت كاتێك هەستان و وتیان : پەروەردگاری ئێمە پەروەردگاری ئاسمانەكان و زەویە، هەرگیز هاناو هاوار بۆ هیچ خوایەكی تر نابەین جگەلەو، ئەگەر لەو ڕاستیە لابدەین، سوێند بەخوا ئەوە بێ گومان ئێمە لەو كاتەدا قسەی نابەجێ و نادروستمان كردووە. ئائەوانە قەومەكەی خۆمانن شتی تریان كردووە بە خوای خۆیان، دەبا بەڵگەیەكی ئاشكراش بهێنن لەسەریان، جاكێ ستەمكارترە لەوەی كە درۆ بۆ خوا هەڵدەبەستێ ؟!﴾ بەڵام سەبارەت بەو ناوچەی كە هاوەڵانی ئەشكەوتی تێدا ژیاون، ڕاوبۆچوونی جیاوازی زۆری لەسەرە، ئەوەی كەزیاتر لەڕاستیەوە نزیكترە ناوچەی (ترسوس) ە، وەتێكڕای سەرچاوە مەسیحیەكان (ئیفسوس) یان وەك ناوچەی ئەشكەوتەكە دیاری كردووە كە ئەو لاوە بڕوادارانە پەنایان بۆ بردووە، وەهەندێ توێژەرو ڕاڤەكەرانی موسڵمانیش لەسەر ئەم ڕایەن، لەگەڵ ئەوەی ئەوانی دیكەیان بەدرێژی ئەوەیان ڕۆشن كردووەتەوە كە (ئیفسوس) جێگاو شوێنی ئەشكەوتەكە نەبووە، وەهەوڵیان دا ئەوەبسەلمێنن جێگای ڕاست بریتی بوولە (ترسوس)، بەهەرحاڵ تاوتوێی هەردوو ناوچەكە دەكەین و لێیان دەكۆڵینەوە. وەلەگەڵ جیاوازی ڕاوبۆچوونەكان سەبارەت بەناوچەكە، توێژەرو ڕاڤەچیانی موسڵمان و مەسیحیەكان لەسەر ئەوە یەكدەنگن كەئەم ڕووداوە لەسەردەمی ئیمپراتۆر دیسیوسی ڕۆمانیدا ڕوویداوە كەبە (دیسیانوس) ناسراوە لەدەوروبەری

(٢٥٠) زایینی دا، ئاشکرایە کە دیسیوس و نیرۆن یەکێك بوون لەو ئیمپراتۆرە رۆمانیانەی کە مەسیحیەکانیان دەچەوساندەوە، لەوماوە کورتەی دەسەلاتداریەتیدا دیسیوس لەسەر هەموو تاکێکی گەلەکەی پێویست کردبوو کە قوربانی بەخواکانی رۆمان پێشکەش بکەن، وەلەسەر هەموان پێویست بوو کە قوربانی پێشکەش بەو بتانە بکەن بەلکو بروانامەیەك دەستەبەربکەن کەبیێتە بەلگە لەسەرئەوەی ئەوان بەوکارە هەلساون، بەمەبەستی ئەوەی کەپێشکەشی کارمەندانی دەسەلاتداری بکەن، ئەگەر کەسێك ئەم کارەی ئەنجام نەدایە لەسێدارەیان دەدا، سەرچاوە مەسیحیەکان دەلێن : زۆرینەی زۆری مەسیحیەکان ئەم بتانەیان رەت کردەوە، وە دەستیان دایە دەرچوون لەشارێکەوە بۆ شارێکی تر، رەنگە هاوەلانی ئەشکەوت دەستەیەك بن لەومەسیحیە سەرەتاییانە. لێرەدا پێویستە جەخت لەسەر خالێکی زۆر گرنگ بکەینەوە، ئەویش ئەوەیە : ئەم بابەتە وەك چیرۆکێك لەلایەن هەندێ موسلمان و گاورو توێژەرو موفەسیرەکانەوە دەگێرێتەوە، کەوای لێ هاتووە بگۆرێت بۆ داستان ئەویش لەدەرەنجامی ئەو زیادەو درێژیانەی کە هێنراونەتە ناویەوە،لەگەل ئەوەشدائەم بابەتە بە رووداوێکی مێژوویی راستەقینە دەمێنێتەوە.

# ئاياهاوەلانی ئەشکەوت لە ئیفسوس دا بوون ؟

ئاماژە بەچەند ناوچەو شارێك دەکرێت لەسەرئەوەی کەئەوناوچانە ئەوناوچانەن کە هاوەلآنی ئەشکەوتیان تێدا ژیاوە، هۆکاری ئەم جۆرە قسەو رایانەش ئەوەیە کەخەلکی بەگشتی بەو هیوایەوەن کە ئەم لاوە ئازاونەبەردانە لەشارەکەیاندا ژیابن و بەشێکبن لە خۆیان، ئەمە سەرەرای ئەوەی کەلە نێوان ئەشکەوتەکانی ئەم ناوچەیەدا هاوشێوەیەکی گەورە هەیە، بۆ نموونە : لەتەواوی ئەم ناوچانەدا جێگەی خواپەرستی تێدایە دەوترێت: لەناو ئەم ئەشکەوتانەدا بونیاد نراوە. وەك زانراوە، ئیفسوس لای مەسیحیەکان بە جێگایەکی پیرۆز دادەنرێت، هۆکەشی ئەوەیە : لەم شارەدا مالێکی لێ یە گوایە دەلێن : مالی حەزرەتی مەریەمە، کە دواجار گۆراوە بۆ کلێسا، رەنگە هاوەلآنی ئەشکەوت لەیەکێك لەم شوێنە پیرۆزانەدا نیشتەجێ بوو بن، وەهەندێ لەسەرچاوە مەسیحیەکانیش بۆ دوورترلەمە بۆی دەچن و جەختیش لەسەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەم جێگایە شوێنی هاوەلانی ئەشکەوتە. کۆنترین سەرچاوەش لەم بابەتەدا قەشەیەکی سوریە بەناوی جیمس کە قەشەیەکی ساروقە لە سالی (٤٥٢) زاینیدا لەدایك بووە، مێژوونوسی بەناوبانگ (جیبون) ژمارەیەك لەو بڕگانەی کۆکردووەتەوە کە جیمس لە کتێبەکەیدا بەناوی ((دارمانی ئیمپراتۆری رۆمانیدا)) هێناویەتی وەبەپێی ریوایەتەکانی ئەم کتێبە ئەو ئیمپراتۆرەی کە هەستاوە بەئازاردانی حەوت لەو بڕوادارە مەسیحیانە و ناچاری کردوون کە خۆیان لەناو ئەشکەوتەکەدا بشارنەوە دیسیوس بووە، وەدیسیوس لەناو ئیمپراتۆریەتی رۆمانیدا لەدەورووبەری سالآنی (٢٤٩-٢٥١) زاینی دەسەلآتداری کردووە، وەدەسەلآتەکەشی جیادەکرێتەوە بەوەی کەبەناوبانگ بووە بەو سزادانەی کەبەسەر شوێنکەوتوانی حەزرەتی عیسادا جێ بەجێ کرا، سەبارەت بە راڤەکەرە موسلمانەکانیش پێیان وایە کە ناوچەی ئەفسوس ئەو ناوچەیە بووە کە هاوەلآنی

ئەشكەوتی تێدا بووە، بەلام جیبون پێی وایە کە ئیفسوس ناوچەی هاوەلانی ئەشکەوت بووە، وەبەو پێیەی کە ئەم ناوچەیە کەوتۆتە کەناری ڕۆژ ئاوای ئەنازۆلەوە گەورەترین ئازوقەی دەریایی ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی بووە، وەئەمڕۆ بە شوێنەوارەکانی ئەم شارەش دەوترێت ((شاری ئیفسی شوێنەواری)). بەپێی سەرچاوە ئیسلامیەکانیش : ناوی ئەو ئیمپراتۆرە (تینوس) بوو کە هاوەلانی ئەشکەوت لەسەردەمیدا بێداربوونەوە، بەلام جیبون پێی وایە : ناوی ئیمپراتۆرەکە ((ثۆدوسیوسی دووەم بوو)) ئەم ئیمپراتۆرەش لە دەوروبەری سالانی (٤٠٨-٤٥٠) زاینی دەسەلاتداریەتی کردووە، دوای ئەوەی کە ئیمپراتۆریەتەکە گۆڕا بۆ مەسیحی. بابگەڕێینەوە بۆ ئەو ئایەتانەی کەوەسفی دەروازەی ئەشکەوتەکە دەکەن، هەندێ لەڕاڤەکەران دەڵێن دەروازەی ئەشکەوتەکە بەرەو باکوور ڕووەدەدات تیشکی خۆر ناچێتە ناوێەوە، بەم شێوەیە هەرکەس بەلای ئەشکەوتەکەدا تێپەڕ بێت شتێك لەناویدا بەدی ناکات، ئایەتە پیرۆزەکەش ئاماژە بەوە دەکات کە دەفەرموێت : ﴿ ۞ وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ مِّنْهُ ۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِ ۗ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِ ۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾ ﴾ **الكهف** (١٧) واتە : ﴿کاتێ کەخۆر هەڵدێت تیشکەکەی دەبینیت لەلای ڕاستی ئەشکەوتەکەوە دەدات و تێپەڕدەبێت، کاتێکیش کە ئاوا دەبێت لەلای چەپی دەدات و تیشکەکەیان بەسەردا تێپەڕدەبێت، لەوکاتەدا ئەولاوانە لەناو بۆشایی فراوانی ئەشکەوتەکەدا ڕاکشاون، ئەوە هەمووی بەڵگەو نیشانەیەکە لەبەڵگەو نیشانەکانی خوا، ئەوەی خوا هیدایەتی بدات هەرئەوهیدایەت دراوە و ڕێنموییی وەرگرتووە، ئەوەش خوا گومڕای بکات، ئەوەهەرگیز کەسێکت دەست ناکەوێت کە پشتیوانی بکات و ڕێنموییی بکات﴾. شوێنەوار ناس دکتۆر (موسا باران) لە کتێبەکەیدا بەناوی ((ئیفسوس)) دەڵێ :

ئەم ناوچەیە ئەو جێگەیە بووە کە لاوە بڕوادارەکانی تێدا ژیاون، هەروەها دەڵێ :
لەسالآنی (٢٥٠) زاینیدا حەوت لاو ئاینی مەسیحیان هەڵبژاردو هاوکات
بتەکانیشیان ڕەتکردەوە و پشتیان تێ کردن، وەلەهەولێکیاندائەولاوانە بۆ ئەوەی
دەرباز بن و لەوشارەدا بچنە دەرەوە ئەشکەوتێکیان بەدی کرد کەکەوتبوویە
خوارووی ڕۆژهەلاتی کێوی (بیون) ەوە، دواتریش سەربازە ڕۆمانیەکانیش ئەمەیان
بینی و دیوارێکیان لەسەر دەروازەی ئەشکەوتەکە دروست کرد [1]. وەئەمڕۆش
ژمارەیەك لەو کۆشکە ئاینیانە دەبینرێت کەلەسەر ئەم گۆڕو بەردانەدا دروست
کراوە، ئەو هەڵکۆڵەرانەی کە پەیمانگای شوێنەوارناسی ئوسترالی لەساڵی (١٩٢٦)
دا پێی هەستاوە ئاشکرای کردووە کەلە قەدباڵی کێوی (بیون) دا چەند
شوێنەوارێکی هاوەلآنی ئەشکەوت بەدیارکەوتووە کە مێژووی دروست بوونی
دەگەڕێتەوە بۆ ناوەڕاستی سەدەی حەوتەم لە (سەردەمی دەسەڵاتداریەتی
ثیودوسیوسی دووەم)[2] دا.

## ئایا هاوەلآنی ئەشکەوت لەترسوس دابوون

دووەم جێگا کە ئاماژەی پێ دەکرێت تەرسوسە کە هاوەلآنی ئەشکەوتی تێدا
نیشتەجێ بووبن، لەڕاستیدا ئەشکەوتێك هەیە کە زۆر هاوشێوەی ئەو وەسفانەیە
کەلە قورئانی پیرۆزدا باس کراون ئەویش لەسەر شاخێکە بە ناوی (ئینسلوس) یان
(بینسیلوس) ە و لەباکووری ڕۆژئاوای ترسوسدایە. زۆرینەی زۆری توێژەرە
موسڵمانەکان بڕوایان وایە کە ترسوس شوێنی نیشتەجێ بوونی هاوەلآنی
ئەشکەوتە، تەبەریش کەبە یەکێك لەمەرجەعە گەورەکانی تەفسیری ئیسلامی
دادەنرێت لە کتێبە کەیدا بەناوی (تأریخ الأمم) ناوی ئەوشاخەی دیاری کردووە

---

[1] ماسنیون ، أوبرا مینورا ، المجلد الثالث ، الصفحات ١٠٤ ـ ١٠٨
[2] الطبري ، تأریخ الأمم.

کەئەشکەوتەکەی تێدا بووە بەوەی کە بریتیە لە (بینیکیلوس)، وە دەڵێ ئەم شاخەش دەکەوێتە ترسوسەوە [1] هاوکات (محمد ئەمین) یش کە توێژەرەوێکی گەورەیە یەکێکە لە مەرجەکانی تەفسیری قورئان هاورایە لەگەڵ ئەو بۆ چوونەدا کە بینیکیلوس ناوی ئەو شاخەیە و کەوتووەتە تەرسوسەوە.





ڕوی ناوەوەی ئەشکەوتی ئیفسوس، کە پێیان وایە ئەو ئەشکەوتەیە کە هاوەڵانی ئەشکەوت پەنایان بۆ بردوە.

---

[1] محمد أمين ...



کێوی ئیفسوس لەڕووی دەرەوە.

هەندێ جار بینیکیلوس بە ئینکیولس دەخوێنرێتەوە، وەك دەڵێ هۆی ئەم جیاوازیەش لە نێوان هەردوو ووشەکەدا هۆکەی لە ووتنی پیتی (باء) یاخود لابردنی ئەم پیتە لەوشە بنەڕەتیەکەدا کە پێی دەوترێت (مێژوو وشە دەخوات [1]) فەخرەدین ڕازی –کە توێژەرێکی ناسراوی دیکەی ئیسلامیە دەڵێ : لەگەڵ ئەوەی کە ئەم ناوچەیە ئیفسوسی پێ دەوترێت، بەڵام مەبەست لێرەدا ترسوسە، چونکە ئیفسوس شتێك نیە جگە لەوەی کە ناوەکەی تریێت بۆ ترسوس[2]. وەلەمەدا لەلای هەردوو موفەسیر بەیزاوی و نەسەفی جیاوازیەك نیە هەروەها لەتەفسیری (الجلالین والتبیان) و ژمارەیەك لەتوێژەری ئیسلامی تریش بەهەمان شێوەیە، کەتەواوی ئەوانەش کۆکن لەسەر ئەوەی کە جێگای هاوەڵانی ئەشکەوت (ترسوس) ە وەڕاقەی ئەم ئایەتە پیرۆزەشی بۆ دەکەن کەدە فەرموێت : ﴿ ۞ وَتَرَى ٱلشَّمْسَ إِذَا طَلَعَت تَّزَٰوَرُ عَن كَهْفِهِمْ ذَاتَ ٱلْيَمِينِ وَإِذَا غَرَبَت تَّقْرِضُهُمْ ذَاتَ ٱلشِّمَالِ وَهُمْ فِى فَجْوَةٍ

---

فخر الدين الرازي

من تفسير القاضي البدوي ، النسفي ، الجلالين والتبيان

مِنْهُۚ ذَٰلِكَ مِنْ ءَايَٰتِ ٱللَّهِۗ مَن يَهْدِ ٱللَّهُ فَهُوَ ٱلْمُهْتَدِۖ وَمَن يُضْلِلْ فَلَن تَجِدَ لَهُۥ وَلِيًّا مُّرْشِدًا ﴿١٧﴾ ﴾ **الكهف (١٧)** واته : ﴿كاتێ کەخۆر هەڵدێت تیشکەکەی دەبینیت لەلای ڕاستی ئەشکەوتەکەوە دەدات و تێپەڕدەبێت، کاتێکیش کە ئاوا دەبێت لەلای چەپی دەدات و تیشکەکەیان بەسەردا تێپەڕدەبێت، لەوکاتەدا ئەو لاوانە لەناو بۆشایی فراوانی ئەشکەوتەکەدا ڕاکشاون، ئەوە هەمووی بەڵگەو نیشانەیەکە لەبەڵگەو نیشانەکانی خوا، ئەوەی خوا هیدایەتی بدات هەرئەو هیدایەت دراوە و ڕێنموویی وەرگرتووە، ئەوەش خوا گومڕای بکات، ئەوەهەرگیز کەسێکت دەست ناکەوێت کە پشتیوانی بکات و ڕێنموویی بکات﴾. کەدەروازەی ئەشکەوتەکەش ڕووی کردووەتە باکوور



ئەشکەوتی ترسوس وای بۆ دەچن کە شوێنی هاوەڵانی ئەشکەوتە

وەلەسەردەمی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیشدا شوێنەواری هاوەڵانی ئەشکەوت جێگەی گرنگی پێدانی توێژەرەکان بووە، کە هەستاون بەجێ بەجێ کردنی هەندێ توێژینەوە لەسەر شوێنەوارەکانی هاوەڵانی ئەشکەوت، وەهەندێ پەیام و زانیاری تالو گۆڕ سەبارەت بەم بابەتە لەئەرشیفی سەرۆك وەزیرانی عوسمانیدا هەیە، بۆ

نمونه : لەو نامەیەدا کە بەڕێوەبەرایەتی ناوخۆ لەتەرتوس ناردوویەتی بۆ سەرۆکی خەزێنەی عوسمانی، کە داوایەکی فەرمی تێدایە کەتیایدا داوای دیاری کردنی موچە دەکات بۆ ئەو کەسانەی کەهەڵدەستن بەپاککردنەوە و چاودێری کردنی ئەشکەوتی (هاوەلانی ئەشکەوت) وەلەوەلامی ئەم نامەیەشدا کەئەوەی لەخۆ گرتووە لە خەزێنەی دەوڵەتدا موچەی چەند کەسایەتیەکی وەك ئەمانە دابین بکرێت، پێویستە پشت ڕاست بکرێتەوە لەو ناوچەیەدا کە ئەمە بێگومان ناوچەی هاوەلانی ئەشکەوتە، وەئەو پشکنینانەش کە ئەنجام دران بە پێی ئەمە زۆر بەسودن لە دیاری کردنی جێگاکەدا. وەلەو ڕاپۆرتەی کەلەلایەن ئەنجومەنی نیشتیمانیەوە ڕێکخرا دەڵێ : (ئەم کێوە دەکەوێتە لای باکوری تەرسوس لەمیر نشینی (ئەزنە) کە کێوێکە دوو کات ژمێر لە تەرسوسەوە دوورە، وەدەروازەی ئەم کێوەش ڕوو بەڕووی باکورە بە تەواوی وەك چۆن لەقورئانی پیرۆزیشدا باس کراوە [1]). سەبارەت بەکات و شوێنی هاوەلانی ئەشکەوت کەتیایدا ژیابن مشت و مڕەکان هەروا ماونەتەوە، ئەمەش وادەکات لەدەسەلاتەکان کە بەدواداچوونی زیاتر بۆ توێژینەوەکان بکەن لەو بوارەدا، چونکە ڕاو بۆچوونی زۆر هەڵدەگرێت. کەواتە : تاکو ئێستا هیچ شتێك سەبارەت بەم بابەتە نەسەلمێنراوە، وەئەو پرسیارەش لێرەدا دەمێنێتەوە : لە چ سەردەمێکدا ئەو لاوە بڕوادارانە ژیاون ؟ وەئەو کێوەش کەلە قورئانی پیرۆزدا باسی لێوە کراوە دەکەوێتە کوێوە ؟ ئەمەش تاکو ئێستا بەبێ وەلامێکی دڵنیا کەرەوە ماوەتەوە...

---

[1] Sidney Fox سیدنی فوکس ، Klaus Dose کلوس داز The Origin of life Molecular Evolution and التطور الجزيني وأصل الحياة ، نيويورك : ١٩٧٧ Marcel Dekker ص ٢

# کـــۆتـــایـــی

خوای گەورە فەرمویەتی : ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ ۖ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الروم (٩) واتە : ﴿ئایا بەسەر زەویدا نەگەڕاون، تاتەماشا بکەن و سەرنج بدەن چیمان بەسەر ئەو نەتەوانەی پێش ئەماندا هێناوە، لەمان زۆر بەهێزترو بەدەسەڵات ترو، زەوییان ژێرە و ژوور دەکرد (واتە دەیان کێڵا بۆ کشتوکاڵ و کانزایان لێ دەردەهێنا) و ئاوەدانیان کردبوویەوە زیاتر لەمان پێغەمبەرەکانیشیان کاتی خۆی بەڵگەی زۆر و ئاشکرایان بۆ هێنان ؟ (بەڵام بێ سوود بوو، زۆربەیان بڕوایان نەکرد) جاوەنەبێت خوا ستەمی لێ کردبن، بەڵکو هەرخۆیان ستەمیان لەخۆیان دەکرد﴾. ئەو گەل و نەتەوانەی کەتاکو ئێستا چیرۆکەکانیانمان گێڕایەوە سیفەتەکانیان هاوشێوەی یەکن، وەك : سەرپێچی کردنی فەرمانەکانی خوای گەورەو یاخی بوون لێیان، هاوبەش بۆ خوا دانان، لوت بەرزی و خۆبەگەورە زانین لەسەر زەویدا، زەوت کردنی مافی خەڵکی بەستەم، ئالودە بوون بەکاری سێکسیەوە، ستەم کردن، وەهەروەها چەند سیفەتێکی تریش کەلەناویاندا بلاوەی کردبوو، وەك : پێشێل کردن و ستەم کردن لەو موسڵمانانەی کەلە دەوروو بەریاندا دەژیان، وەبە هەموو شێوازێك هەوڵیان دەدا کە ترس و بیم لەناودلیاندا دروست بکەن. لەڕاستیدا مەبەست و ئامانج لەپاڵ گێڕانەوەی قورئاندا بۆ ئەو پەندو ئامۆژگاریانە ئەوە نیەکەچەند وانەیەکی مێژوویی بدات بە خوێنەر، قورئانی پیرۆز پێمان دەفەرموێت : ئەم چیرۆکانە پەندو ئامۆژگاری و نمونەن، چونکە ئەو

پێغەمبەرانەی کەنەتەوەکانیان تیاچوون ئامۆژگاری ئەوانە دەکەن کەبە دوایاندا دێن بۆ سەر رێگای راست : ﴿ أَفَلَمْ يَهْدِ لَهُمْ كَمْ أَهْلَكْنَا قَبْلَهُم مِّنَ الْقُرُونِ يَمْشُونَ فِي مَسَاكِنِهِمْ إِنَّ فِي ذَٰلِكَ لَآيَاتٍ لِّأُولِي النُّهَىٰ ﴿١٢٨﴾ ﴾ طه (١٢٨) واتە : ﴿ئایا بۆیان روون نەبووەتەوە کەچەندەها نەوەمان پێش ئەمان لەناو بردووە، بەناو شوێنەوار و ماڵ و حاڵیاندا هاتوو چۆ دەکەن، بەڕاستی ئاڵە و بەسەر هاتانەدا بەڵگەو نیشانەی زۆر هەیە بۆ خاوەن بیر و هۆشمەندەکان﴾. ئەگەر پەندوو ئامۆژگاریمان لەم نمونانە وەرگرت، ئەوسا دەبینین چەند بەشێکی زۆر لەکۆمەڵگاکانمان باشتر نین لەو کۆمەڵگایانەی کە لەناو بران، وەئەوەی کە چیرۆکەکانی قورئانی پیرۆز بەهەڵوەشان و یاخی وەسفیان دەکات. بۆ نمونە زۆربەی دانیشتوانی کۆمەڵگاکان لە ئەمرۆماندا بەرێژەیەکی زۆر نێر بازیو کاری ناڕەوا ئەنجام دەدەن، کەئەمەش گەلی (لوط) مان بیر دەخاتەوە، زۆربەی ئەوانەی کەکاری ناڕەوای سێکسی دەکەن خۆیان بەهێز دەکەن لەگەڵ ئەوانەی دەرکەوتەی کۆمەڵگەن لەبەستنی کۆڕەکانی سێکسی، واتە : ئەوانە لەم لادانەدا زۆر لەدانیشتوانی (سەدوم و غوموورا) خراپەکارترن. تەواوی ئەو کۆمەڵگایانەی کە پیشان دران بەکارەساتی سروشتی لەناو چوون وەك : زەمین لەرزە، رەشەبا و گەردەلوول، لافاو، هتد....، هەروەها ئەو کۆمەڵگایانەش کەبە هەمان رێگەی گومڕایدا دەڕۆن و بوێریشیان هەیە کە هەمان تاوانی گەلەکانی پێشوو چەند بارە بکەنەوە ، ئەوە بێگومان بەهەمان شێوە سزاو تۆڵە یەخەیان پێ دەگرێت. پێویستە ئەوەمان لەیاد نەچێت کە خوای گەورە دەتوانێت سزا بنێرێت بۆهەر گەلێك کە ویستی لەسەر بێت وەلە چ کاتێکیشدا بێت سزایان دەدات یاخود دەتوانێت وازیان لێ بهێنێت تاوەکو لەژیانێکی ئاسایدا بژین پاشان لەدوا رۆژدا سزایان دەدات، خوای گەورە لەسورەتی (العنکبوت) دا دەفەرموێت :

﴿ فَكُلًّا أَخَذْنَا بِذَنبِهِ ۖ فَمِنْهُم مَّنْ أَرْسَلْنَا عَلَيْهِ حَاصِبًا وَمِنْهُم مَّنْ أَخَذَتْهُ

ٱلصَّيْحَةُ وَمِنْهُم مَّنْ خَسَفْنَا بِهِ ٱلْأَرْضَ وَمِنْهُم مَّنْ أَغْرَقْنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٤٠﴾ ﴾ **العنكبوت (٤٠) واته :** ﴿ئێمە هەریەکێك یان هەر دەستەیەك لەوانەمان بە سزای تاوانی خۆی گەیاند، جاهەیانبوو بەرد بارنمان کرد، هەیان بوو دەنگو سەدای بە هێز لەناوی برد، هەیان بوو بەناخی زەویدا بردمانە خوارەوە، هەشیان بوو نوقمی دەریامان کرد، جاوەنەبێت خوا ستەمی لێ کردبن، بەڵکو خۆیان ستەمیان لەخۆیان کرد﴾.

هەروەها قورئانی پیرۆز باسی بڕوادارێکی خانەوادەی فیرعەونمان بۆ دەکات، کە پیاوێکی بڕواداربووە لە خێزانی فیرعەون لەسەردەمی حەزرەتی موسادا کە باوەڕەکەی شاردبوەوە. ئەم پیاوە بەگەلەکەی ووت : ﴿ وَقَالَ ٱلَّذِيٓ ءَامَنَ يَٰقَوْمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُم مِّثْلَ يَوْمِ ٱلْأَحْزَابِ ﴿٣٠﴾ مِثْلَ دَأْبِ قَوْمِ نُوحٍ وَعَادٍ وَثَمُودَ وَٱلَّذِينَ مِنۢ بَعْدِهِمْۚ وَمَا ٱللَّهُ يُرِيدُ ظُلْمًا لِّلْعِبَادِ ﴿٣١﴾ وَيَٰقَوْمِ إِنِّيٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ يَوْمَ ٱلتَّنَادِ ﴿٣٢﴾ يَوْمَ تُوَلُّونَ مُدْبِرِينَ مَا لَكُم مِّنَ ٱللَّهِ مِنْ عَاصِمٍۗ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٣٣﴾ ﴾ **غافر (٣٠-٣٣) واتە :** ﴿ئەو پیاوەی کە ئیمانی هێنا بوو وتی : بێگومان من دەترسم ڕۆژێکتان بەسەر بێت وەکو ئەو ڕۆژەی بەسەر گرۆو قەومە نالەبارەکانی پێشودا هات... وەکو ئەوەی کەبەسەر قەومی نوح و عاد و ثەمود و ئەوانەی بەدوای ئەواندا هاتن، جاوەنەبێت خوا بیەوێت ستەم لەبەندەکان بکات و حەز بەتیاچوونیان بکات. ئەی قەوم و هۆزم من بەڕاستی دەترسم لەڕۆژی هاوارو ئاهوو ناڵەو بانگ کردنتان بۆ لێپرسینەوە لە قیامەتدا. ئەو ڕۆژەی کەهەموو لەبەری هەڵدێن و پشت هەڵدەکەن و هەموو سەرگەردانن، نازانن چی بکەن و ڕوو بکەنە کوێ، کەس نیە پەناتان بدات لە خەشم و قینی خوا، ئەوەش خوا گومڕای بکات بەهۆی خراپەکاری خۆیەوە، هیچ کەسی تر ناتوانێت هیدایەت و ڕێنموویی بکات﴾. لەڕاستیدا تەواوی

پێغەمبەران کەنێرراون باسی ڕۆژی دواییان بۆ گەلەکەیان کردووە، وەهەوڵی ئەوەشیاداوە بەسزای خوایی بیان ترسێنن، تەواو وەك ئەو بڕوادارەی کەباوەڕەکەی خۆی شاردبوویەوە، تێکڕای پێغەمبەرانیش ژیانیان لەم پێناوەدا تەرخان کرد وەگەلەکەشیان چەند جار لەم باسانە وریا کردووەتەوە، وەلەو کاتانەشدا کە پێغەمبەرەکانیان بانگهێشتی گەلەکەیان دەکرد گەلەکانیان تۆمەتیان بۆ درووست دەکردن وەك : درۆ و تەماعی دنیان و خۆبەگەورەدانان و داوای پلە و پایە و گەورەیی. دواتریش گەلەکەیان دەگەڕانەوە سەر هەمان کارو پیشەی خۆیان بەبێ ئەوەی بیر لەئامۆژگاری پێغەمبەرەکانیان بکەنەوە، هەشیان بوو دەڕۆشت بۆ دوورترین شوێن تاوەکو بڕوادارێك بکوژێت یاخود لە شوێنەکەی خۆیاندا دەربەدەریان بکات، وەلەهەموو حاڵەتەکانیشدا ژمارەی بڕواداران کەمبووە وەلەکاتی دابەزینی ئازارو ئەشکەنجەی خواییدا بۆ سەر ئەو گەلانە خوای گەورە تەنهاپێغەمبەران و شوێنکەوتوانیان دەرباز دەکرد لەو سزاو تۆڵەیە. لەگەڵ ئەوەی هەزاران ساڵ تێپەڕ بوو وەزۆرێك لەوگۆڕانکاریانەشی کەبەسەرجێگاوشارستانیەتی مرۆڤایەتیداڕوویاندا، کەچی ئەوپێکهاتەو ڕژێمە کۆمەلایەتیەی کافرانیش کەباسمان لێوەکردن نەگۆڕان، ئینجا وەك باسمان کرد تەواوی ئەو هۆکارەخراپانەی کەئەوگەلانە لەچیرۆکە قورئانیەکاندا باسکراون لەبەشێك لەکۆمەڵگا مرۆڤایەتیەکانماندا هەن، هەروەك چۆن گەلی مەدیەن تەرازوبازیان دەکرد، کۆمەڵگای ئەمڕۆشمان فرۆفێڵ و داگیرکاری دەکات، هەروەها چەندین کۆمەڵ و تاقمی خراپەکاری وبەدڕەوشت هەن کەهیچیان لەگەل ونەوەکەی لوط کەمترنیە لە گەندەڵی و لادانیاندا، وەلەهەموو کاتێکیشدا لەهەندێ ناوەندا بەرگریان لێ دەکرێت، وبەشێکی گەورەی کۆمەڵگاش وەك گەلی سەبە، خاڵی نیە لەوکەسانەی کەخۆبەزل زان و کوفرانە بژێری نیعمە تەکانی خوای گەورەن، وەهەروەها وەك گەلی ثیەمیش سوپاس گوزاری بەخششەکانی خوای گەورە ناکەن، وەجۆرەهائازارو

ئەشكەنجەو تۆمەت وەك گەلی نوح بۆبڕواداران دروست دەكەن، وستەمكارو زۆرداریشن وەك گەل ونەتەوەكەی عاد. ئەمانە هێماونیشانەیەكن..دەبێت هەمیشە ئەوەمان لەیادبێت كەهەرچەندە كۆمەڵگاكان لەگۆڕاندابن و ژیان و ژیاری كۆمەڵگاش لەئاستێكی پێشكەوتودابێت. هە مووئەمانەهیچ نین وەلەوپەڕی گرنگیشدانین، وەهیچ كام لەمانە لەسزای خوای گەورە دەربازمان ناكات، خوای گەورەش ئەم ڕاستیە بۆهەمووومان باس دەكات و دەفەرموێت : ﴿ أَوَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ ۚ كَانُوا أَشَدَّ مِنْهُمْ قُوَّةً وَأَثَارُوا الْأَرْضَ وَعَمَرُوهَا أَكْثَرَ مِمَّا عَمَرُوهَا وَجَاءَتْهُمْ رُسُلُهُم بِالْبَيِّنَاتِ ۖ فَمَا كَانَ اللَّهُ لِيَظْلِمَهُمْ وَلَٰكِن كَانُوا أَنفُسَهُمْ يَظْلِمُونَ ﴿٩﴾ ﴾الروم (٩) واتە :﴿ئایا بەسەر زەویدا نەگەڕاون، تاتەماشا بكەن و سەرنج بدەن چیمان بەسەر ئەو نەتەوانەی پێش ئەماندا هێناوە، لەمان زۆر بەهێزترو بەدەسەلاتر بوون، زەوییان ژێرە و ژوور دەكرد (واتە دەیان كێلا بۆ كشتوكاڵ و كانزایان لێ دەردەهێنا) و ئاوەدانیان كردبووەوە زیاتر لەمان، پێغەمبەرەكانیشیان كاتی خۆی بەڵگەی زۆرو ئاشكرایان بۆهێنان ؟ (بەڵام بێ سوود بوو، زۆربەیان بڕوایان نەكرد) جاوە نەبێت خوا ستەمی لێ كردبن، بەڵكو هەرخۆیان ستەمیان لەخۆیان دەكرد﴾.

## هەڵەكانی تیۆری پەرەسەندن

لەڕاستیدا تیۆری پەرەسەندن یاخود بڵێین داروینی ئەو تیۆرەیە لە بەرامبەر بیرۆكەی دروست بوونی زیندەوەرەكاندا هاتوەتەكایەوە، بەڵام ئەم قسەڵۆكە بێ مانایانە ئەوەندە بڕی نەكرد بەوپێیەی كەهیچ پەیوەندیەكی بەزانستەوە نیە، ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەم تیۆرە دوورە لەهەربەرەو پێش چوون وسەركەوتنێكیشەوە، ئەم

تیۆرە بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کەژیان لەمادەیەکی نازیندوو دروست بووە، وە ئەویش لەئەنجامی ڕێکەوتی کوێرانەوە بووە، بەلاّم زۆر بەزوویی ئەم بانگەشانە بێ ئاکام بوون و پوکانەوە لەبەرامبەر ڕاستیە زانستیەکاندا کە دروست بوونی زیندوو نازیندوو لەلایەن پەروەردگارەوە سەلماند. لەبەر ئەوە ئەو زاتەی کە بونەوەری دروست کردووە و تەرازوویەکی وردو درشتیشی بۆ دناوە، بێگومان تەنها خوای پەروەردگارە، وەتیۆری پەرەسەندن ناتوانێت ڕاستیەکان بپێکێت چونکە نوساوە بەو بیرۆکەوە کە نکولی دروست بوونی بوونەوەرەکان دەکات لەلایەن پەروەردگارەوە و لەبری ئەمەشدا پشتگیری لە (ڕێکەوت) دەکات، بەدڵنیایشەوە کاتێك لایەنەکانی ئەم تیۆرە لە هەموو ڕووەکانیەوە شی دەکەینەوە، دەبینین بەڵگە زانستیەکان یەك بەیەکی ئەم تیۆرە بەدرۆدەخەنەوە، چونکە ڕێکخستنی بوونەوەرە زیندووەکان زۆر ئالۆزەو لەویش ئالۆزتر بوونەوەر نازیندووەکانە، بۆ نموونە : گەردیلەکان بە پێی چەند پێوەرێکی زۆر ورد دانراون وە بەپێی ئەو یاسا هەستیارەیان کە هەیانە دەتوانین لەرێگەی توێژینەوە جۆربەجۆرەکانەوە بەئاشکرا ئەم پێوەرانە ببینین، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم گەردیلانە لەجیهانی زیندوودا بوونیان هەیە، بەلاّم بەشێوەیەك زۆرتر ئالۆزن، وەبەمادەیەکی سەرەکیش دادەنرێت بۆ پێکهێنانی پرۆتین و ئەنزیمەکان وەخانەکانیش بەشێوەیەك و لەرێگەی چەند پێوەرێکی هەستیارو سەرنج ڕاکێش کاردەکەن. لەڕاستیدا ئەم ڕێکخستنانەش هۆکارێکی سەرەکی بوون بۆ بەدرۆخستنەوەی بانگشەکەرانی ئەم تیۆرە بە تێپەڕبوونی کۆتاییەکانی سەدەی بیستەم.

# ئەو ئاستەنگانەی کەهەرەسی بە داروینزم هێنا

ئەم تیۆرە بەشێوەیەکی دیاری کراو لەسەدەی نۆزدەدا دەرکەوت کەلە بیرۆکەیەکی کەڵەکە بووەوە هەڵێنجرابوو، کەرەگ و ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ شارستانیەتی ئیغریقی، بەڵام ئەو ڕووداوەی کەبووە مایەی بەرەو پێشچوونی ئەم تیۆرە لەنێو جیهانی ئەمڕۆماندا دەرچوونی کتێبی (بنچینەی جۆرەکان) ی چارلس داروین بوو، کەتیایدا دانەری ئەم کتێبە دژایەتی و نەیاری خوای گەورە دەکات بەوەی



کەبوونەوەرە زیندووە جۆربەجۆرەکانی دروست کردبێت، وەلەبری ئەمەشدا بانگەشە بۆ ئەو بیرو ڕایە دەکات کەتەواوی بوونەوەرە زیندووە کان لەیەك باپیرەوە گەشەیان کردووە، وەبە تێپەڕبوونی کاتیش جیاوازی لەنێو زیندەوەرەکاندا دەرکەوت و دەرەنجام ئەو گۆڕانە جیاوازیەیان لێکەوتەوەلەڕاستیدا ئەم بانگەشانەی داروین پشتی بە هیچ بەڵگەیەکی زانستی نەدەبەست، وەئەبووە مایەی ئەوەی ببێتە (مشت و مڕێکی ژیرانە و مەنتیقی) جگەلەوەی کەتەنها خودی خۆی دانی بەم بیرو ڕایەدا دەنا، تەنانەت ئەم کتێبە بەشێکی بەناوی (ئاستەنگەکانی تیۆرەکەی) لەخۆ گرتووە کەبە درێژی باس لەدان پێدانانی داروین خۆی دەکات لەبەرامبەر ژمارەیەك لەو پرسیارانەی کەئەم تیۆرە دەسەو سان بووە لەوەلاَم دانەوەیان، بەو شێوەیەش کون و دەلاقەی فیکری لە دیواری تیۆرەکەدا دروست بوو، وەبەوئاواتەوە بوو کە بکات بەو زانستە پێشکەوتووە بۆ ئەوەی وەلاَمێکی گونجاو بۆ ئەم پرسیارانە بدۆزێتەوە، تاوەکو بە تێپەڕبوونی کات پەرەسەندنی زانستی ببێتە کلیلی تیۆرەکەی. وەئەم هیوار ئاواتەی لە کتێبەکەیدا باس کردووە، بەڵام زانستی نوێ داروینی نائومێد کردوو یەك بەیەکی هەوڵەکانیشی بەدرۆخستەوە، دەتوانین سێ لە

و هۆکارە سەرەکیانە باس بکەین کەوای کرد وەك تیۆری زانستی کۆتایی بە داروینزم بهێنێت ئەو هۆکارانەش ئەمانەن :

١ – لەڕاستیدا ئەم تیۆرە بەتەواوەتی بێ ئاکام بوو لەڕووی ئەوەی کەنەیتوانی ڕاڤەیەکی زانستی بۆ

چۆنیەتی پەیدا بوونی سەرەتای ژیان بدۆزێتەوە.

٢ – نەبوونی هیچ بەڵگەیەکی زانستی کە پاڵپشتی (بوونی هۆکاری تایبەت بە ئالیەتی پەرەسەندن بکات) وەك هۆکارێك بۆ گونجاندن لە نێو زیندەوەراندا.

٣ – تۆمارە بەبەردبووەکان کەهەڵکەندراون ئەوەمان بۆ ڕۆشن دەکەنەوە کە زیندەوەری جۆر بەجۆر لەیەك کاتدا دەرکەوتوون، ئەمەش پێچەوانەی بانگەشەکانی تیۆری پەرەسەندنە. وەبە درێژیش باس لەم سێ هۆکارە دەکەین.

# بنچینەی ژیان : ئەو کۆسپ و تەگەرانەی هەرگیز شی نابنەوە

تیۆری پەرەسەندن بانگەشەی ئەوە دەکات کە ژیان و تەواوی زیندەوەران لەیەك خانە دروست بوون پێش (٣,٨) ملیار ساڵ لەمەو پێش، بەڵام چۆن تەنها یەك خانەی زیندوو لە شێوازو پێکهاتەیاندا دەبێت بە ملیۆنەها زیندەوەری جۆربەجۆر ؟ وەئەگەر ئەم ڕووداوانەش بەڕاستی ڕوویداوە بۆچی هیچ بەبەردبوویەك نەدۆزراوەتەوە ئەمە بسەلمێنێ ؟. ئەم تیۆرە نەیتوانی وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە، وەبەر لەوەی بچینە ناو وردەکاری ئەم باسانەوە پێویست دەکات وەستانێك بکەین لەبەردەم بانگەشەی یەکەمدا کە خۆی لە ((لەخانەی دایکدا)) دەبینێتەوە. تۆ بڵێی ئەم خانەیەچۆن پەیدا بوو بێ ؟ ئەم تیۆرە بانگەشە بۆ ئەوە دەکات کەئەم خانەیە تەنها لەئەنجامی ڕێکەوتەوە پەیدا بووە، وەلە هەل ومەرجێکی سروشتیداو بەبێ هیچ جۆرە کاریگەریەکی دەرەکی یان ناسروشتی هاتوونەتەبوون.واتە ئەم تیۆرە

بەرەهایی بیرۆکەی بەدیهێنان ڕەتدەکاتەوە، بەواتایەکی دیکەش ئەم تیۆرە بانگەشەی ئەوەدەکات کەئەم خانەیە بەهۆی یاسا سروشتیەکانەوە پەیدابووەو بەبێ بوونی هیچ جۆرە ڕێکخستنێك یاخود نەخشەسازیەك، بەڵکو ئەم خانەیە لەڕێگەی ڕێکەوتە هەڕەمەکیەکانەوە پەیدابووە، جابەپێی ی ئەم تیۆرە مادە نازیندووەکان لەئەنجامی ڕێکەوتەوە هەستاون بەبەرهەم هێنانی خانەیەکی زیندوو، بەڵام ئەم بۆچونەش دژە لەگەڵ بنەمای یاسا بایەلۆجیەکانداکەهەن.

## ژیان تەنها لەژیانەوە دروست بووە

داروین لە کتێبەکەیدا هەرگیز باسی لە بنچینەی ژیان نەدەکرد، هۆکەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی ئەو تێگەیشتنە زانستیە هەڵەیەی کەلەسەردەمی خۆیدا باوبوو، بەوەی کەوا دروست بوونی ژیان بنەڕەتێکی زۆر سادەی هەیە. وەزانستی ئەوکاتە و هێشتا لە ژێر کاریگەری تیۆری دروست بوونی ((لەخۆوە ژیان)) دابوو کەهەر لەسەدەکانی ناوەڕاستەوە هەبووە، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە زیندەوەران زۆر بەئاسانی لەمادەی نازیندووەوە دروست دەبن، وەئەم تیۆرە پشتی بەست بەو بەڵگەیەی کە گوایە زۆربوونی مێرووەکان لەپاشماوەی خۆراکی زۆر بڵاو بووەوە دروست بوون وەزۆربوونی مشکیش لەناوسایلۆکانەوە دروست بوون ، هەتا دەست کرا بەتاقی کردنەوەی نوێ بۆ سەلماندنی ئەم بیرۆکەیە،



لویس باستۆر سەرکەوتنی بەدەست هێنا لە پوچەڵ کردنەوەی تیۆری پەرەسەندندا کە دەڵێ: ( مادە زیندووەکان لەمادە نازیندووەکانەوە پەیدابوون) ئەویش لەڕێگەی چەند تاقیکردنەوەیەکی سەرکەوتووەوە بوو کە بەدوایدا نوشوستی بەیەکێك لەبانگەکانی تیۆری پەرەسەندن هێنا.

هەندێ دانەوێڵەیان سەر پاچە قوماشێکی پیس ودڕاو دانا کە پێش بینی دەرکەوتنی مشکیان دەکرد، دوای ماوەیەکی دیاری کراو هەروەکو دەرکەوتنی کرمیان لەسەر گۆشتی بۆگەن وەك بەڵگەو سەلماندنێك دانا لەسەر دروست بوونی ژیان لە بێ گیان و مادەی نازیندوو، لەدواییدا ڕوونکرایەوە کەئەم کرمانە بەو شێوەیە لەخۆوە دەرناکەون، بەڵکو لە هێلکەی بچوکی بەچاو نەبینراو دێنە دەرەوە، مێش دەیان گوێزێتەوە و لەوێدا دایان دەنێت، بەڵام لەو سەردەمەی کە داروین تیۆرەکەی خۆی خستە ڕوو بیرۆکەی دروست بوونی بەکتریا زۆر بەسانایی لەمادەی نازیندووەوە یەکێك بوو لەبیرۆکە بڵاوەکان لە ژێر زانستدا، زانای بایەلۆجی فەرەنسی بەناو بانگ لویس باستەر دوای پێنج ساڵ لەبڵاوکردنەوەی کتێبەکەی داروین (بنچینەی جۆرەکان) هەستا بەهەڵوەشاندنەوەی ئەم بیرۆکەیە بە شێوەیەکی زانستی، لە کاتێکدا کەئەم بیرۆکەیە یەکێك بوو لەبنەماکانی تیۆری پەرەسەندن، کورتەی ئەو ئەنجامەی کە باستەر پێی گەیشت (دوای لێکۆڵینەوە و تاقی کردنەوەی هەمەجۆرو دوورو درێژ ئەوەبوو کە دروست بوونی ژیان لەمادەی نازیندووەوە هەڵەیەکی گەورەیەولەگەڵ بادارێشت) [1] بانگەشەکەرانی تیۆری پەرەسەندن تاماوەیەکی زۆرلەبەرامبەر ئەوبەڵگەزانستیانەی کەلویس باستەر پێی گەیشتبوو دەوەستانەوە. بەڵام زانست بەوگەشەسەندنەی بەخۆیەوە بینی ئەوەی سەلماند کەپێکهاتەی خانە چەند ئاڵۆزە، ئەمەش ئەوەمان بۆدەردەخات کەدەرکەوتنی شتێکی ئاوائاڵۆز هەرلەخۆیەوە دروست نابێت.

---

[1] Alexander I. Oparin الکسندر.ا. اوبارین ، Oparin of life أصل الحیاة ، ١٩٣٦ ، نیویورك ، مطبوعات دوفر ١٩٥٣ طبعة مکررة ص ١٩٦.

## ئەو هەوڵە بێ سودانەی کە لەسەدەی بیستدا دراون

لەسەرەتای سەدەی بیستەمدا زانای ڕووسی ناسراو بە ئەلیکسەندەر ئۆپارین Alexander Oparin یەکەم کەس بوو لەسەر بنچینەی دروست بوونی ژیان دواو، مەستیشی ئەوەبوو کە هەستێت بەباسکردنی چۆنیەتی دەرکەوتنی یەکەم خانەی زیندەوەر لەکاتێکدا تیۆری پەرەسەندن بانگەشەی ئەوەی کردبوو کەسەرەتایەکی هاوبەشە بۆ هەموو جۆرەکانی زیندەوەران، ئۆپارین لەسیەکانی سەرەتای سەدەی بیستەمدا هەوڵی دا بە پێشکەشکردنی هەندێ لە گریمانەکانی بانگەشەی بۆ ئەوە دەکرد کە دەگونجێ ژیان لەیەکەم خانەدا دروست بێت، کەلەمادەی نازیندووەوە سەری هەڵداوە لەدەرەنجامی ڕێکەوتەوە، هەرچەندە ئەم هەولانەی سەرکەوتنی بەدەست نەهێنا، ئۆپارین ناچار بوو دان بنێت بەوەدا کەبەداخەوە بیرۆکەی دەرکەوتنی (یەکەم خانەی زیندوو لەمادەی نازیندووەوە بەتاریکترین خاڵ دەژمێرێت لەتیۆری پەرەسەندندا)[1]. پاشان هەندێ لەزانایانی پەرەسەندن هەستان بە شوێنکەوتنی ڕێگەی ئۆپارین بۆ گەڕان بە شوێن ڕاڤەکردنی پەرەسەندن لەبابەت دەرکەوتن و دروست بوونی بنچینەی ژیان و لەم بارەیەوە چەند تاقی کردنەوەیەکیان ئەنجامدا، بەناو بانگترین تاقی کردنەوەش تاقی کردنەوەکەی زانای کیمیازانی ئەمەریکی ستانلی میلەر بوو لە ساڵی (١٩٥٣) دا ئەنجامی دا، میلەر ئەگەری بوونی هەندێ مادەی خاوەن گازی تایبەتی دانا لەتوێژی هەوادا، وتی ئەوگازانە هەموو



لەڕاستیدا ئەلیکسەندەر ئۆپارین لەسەرجەم تاقیکردنەوەکانیدا کە ئەنجامیدا بۆ سەلماندنی ئەوەی کە بکاتە ڕاڤەیەکی پەرەسەندن بۆ بنچینەی ژیانی سەرکەوتوو نەبوو.

---

[1] New Evidence onevolution of early atmosphere and life دلیل جدید عای نطور الغلاف الجوي القديم والحياة ، نشرة موجزة صادرة عن جمعية الأنواء الجوية الأمريكية ، المجلد ٦٣ نوفمبر ١٩٨٢ ص ١٣٢٨ ـ ١٢٢٠

لەیەك شوێندا کۆکراونەتەوەودانراون دواتریش وزەیان پێدراوە، وەتوانیویەتی هەندێ لەوترشە ئەمینی یە بەدەست بهێنێ کەدەچێتە ناو پێکهاتەی پرۆتینەوە، وە ئەو تاقی کردنەوەی کەلەو ساڵانەدا پێشکەشی کرد وەك هەنگاوێکی گرنگ لەلێکدانەوەی پەرەسەندن دا ناژێنەی ڕاستیەکان نیە، وە ڕوونی کردەوە کەئەو مادانەی کەبەکاری هێناوە لەتاقی کردنەوەکەیدا زۆر جیاواز بووە لەو مادانەی کە لە قۆناغەکانی یەکەمی ژیانداهەبوون،وەئەمەش لەساڵانی دوایدابەتەواوەتی سەلمێنرا[1].

وە میلەر دوای چەند ساڵێك لە بێ دەنگی دانی بەوەدانا کە تاقی کردنەوەکەی هیچی بەدەست نەهێناوە[2]، وە هەموو ئەو تاقی کردنەوانەی کەزاناکانی پەرەسەندن بە درێژایی سەدەی بیست ئەنجامیان دا بۆ لێکدانەوەی سەرەتای دروست بوون و بنچینەی ژیان بە پێچەوانەی تیۆری پەرەسەندن کۆتایی پێ هات، زانایەکی کیمیایی پرۆ فیسۆر جیفری بادا jeffrey Bada دانی نا بەم ڕاستیانەدا لەو وتارەیدا کەلە بەناوبانگترین گۆڤاری لەخۆگری تیۆری پەرەسەندن لەساڵی (١٩٨٨) دا بلاوی کردەوە ئەویش گۆڤاری (زەوی) ە تێیدا دەڵێ : (ئێمە سەدەی بیستەمان بەجێ هێشت کەچی هێشتا ڕوو بەڕووی هەمان گرفت دەبینەوە کەلەسەرەتای دەست پێ کردنی سەدەی بیستدا هەمان بوو کە ئەویش ئەوەیە چۆن ژیان لەسەرەتاوە دروست بوو ؟)[3].

---

[1] Stanley miller ستانلي ميلر ، Moleculer Evolution of life : Current status of the prebiotic synthesis of small Molecutes ١٩٩٨ ص ٤٠

[2] Jeffrrey Bada جيفري بادا ، الأرض Earth ، فبراير ١٩٩٨ ص ٤٠

[3] تشارلز داروين ،أصل الأنواع : نسخة طبق الأصل للطبعة الأولى مطابع جامعة هارفارد ١٩٦٤ ص ١٨٩

# ئالیەتە خەیاڵیەکانی تیۆری پەرەسەندن

مەسەلەی دووەم کەبووە هۆی ئەوەی تیۆری داروین لە بێخ دەربهێنێ ئەو تیۆرە بوو کە بە دەوری (ئالیەتەکانی پەرەسەندن دا) دەسوڕێتەوە، ئەم بانگەشەش لە هیچ شوێنێکی دونیای زانستدا نەسەلمێنرا ئەویش لەبەرنەبوونی ڕاستی لەڕووی زانستی و ناوەڕۆکەکەیەوە کە توانای پەرەسەندنی زیندەوەری نەبوو. وەبەپێی بانگەشەکانی داروین پەرەسەندن لەئەنجامی (هەڵبژاردنی سروشتیەوە) ڕوویداوە، وە گرنگیەکی بێ وێنەی دابوو بەم بانگەشەیە، تەنانەت ئەم بانگەشەشی لە پێشتردا ڕۆشن کردبوویەوە لە و کتێبەیدا کەبە (بنچینەی جۆرەکان ناسرابوو ئەویش لەڕێگەی هەڵبژاردنی سروشتیەوە). لە ڕاستیدا چەمکی هەڵبژاردنی سروشتی پشت ئەبەستێت بە بیرۆکەی مانەوەی بوونەوەرە هەرچاك و گونجاوەکان لەگەڵ ئەو بارودۆخە سروشتەی دەوروبەری، بۆ نموونە : ئەو ئاسکەی ئەتوانێ بە شێوەیەکی خێراتر ڕابکات لەناو ئەو مێگەلەی کەلەلایەن درندەوە هێرشی کراوەتە سەر ئەتوانێ لەژیاندا بمێنێتەوە، بەم شێوەیە تەنها ئەوانە دەمێننەوە کە بە هێزوخێران، بەلام ئەو ئالیەتە بەلگە نیە بۆ پەرەسەندنی ئاسك هەروەکو بەلگەش نیە بۆ گۆڕان و بۆ جۆرێکی تری زیندەوەران، بۆ نموونە : گۆڕانی ئەو ئاسکە بۆ ئەسپ، کەواتە (هەڵبژاردنی سروشتی) خاوەنی هیچ ئالیەتێکی پەرەسەندن نیە وە ناتوانرێت پشتی پێ ببەسترێت، تەنانەت خودی داروین ئەم ڕاستیەی زانی بوو، بۆیە ئە بینین کەلە کتێبەکەیدا (بنچینەی جۆرەکان) باسی دەکات و دەڵێت : (ئەگەر چەند گۆڕانکاریەکی بەکەڵك ڕوونەدات ئەوا هەڵبژاردنی سروشتی ناتوانێ هیچ کارێك بکات [1]).

---

[1] تشارلز داروين ، أصل الأنواع : نسخة طبق الأصل للطبعة الأولى مطابع جامعة هارفارد ١٩٦٤ ص ١٨٤

# کاریگەری لامارك

ئەو پرسیارەی کەدێتە ئاراوە ئەوەیە : چۆن ئەم گۆڕانە بەسودانە روویاندا ؟ داروین بەپاڵپشتی بیروڕای ئەوپیاوانەی پێش سەردەمی خۆی وەك لامارك وەڵامی ئەم پرسیارانەی داوەتەوە، زانای زیندەوەرزانی فەرەنسی لامارك کەلە پێش داروینیدا بە چەند ساڵێك ژیاوە ومردووە، ئەم زانایە بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە زیندەوەران دووچاری چەند گۆڕانکاریەك دەبنەوە وەئەم گۆڕانەش بۆ نەوەکانی داهاتوو دەگوێزرێتەوە، نەوە دوای نەوە ئەوگۆڕانکاریانە وەردەگرن لەئەنجامدادەبێتە هۆی دەرکەوتنی جۆری تازە و نوێ، وەبەپێی بانگەشەکانی لامارك کە زەرافەی وەك نموونە هێنایەوە کە وای دەرخست لە ئاسکەوە پەرەی سەندووە لەئاکامی درێژکردنی ملی بۆخواردنی گەڵای لقە بەرزەکانی درەختەکان کە بووەتە هۆی پەرەسەندنی ملی لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر، وەداروینیش نمونەیەکی هاوشێوەی وەك ئەمە لە کتێبەکەیدا بەناوی (بنچینەی جۆرەکان) پێشکەش کردووە کە دەڵێت نەهەنگ لە ورچەوە دروست بووە لەئەنجامی خواردنی بونەوەرە ئاویەکان وەئەمەش وای لێکردووە لەنێوان کاتێك وکاتێکی تردا بچێتەوە ناوئاوەوە [1] . ئەو یاسا بۆماوەییانەی کە مەندل دۆزیەوە و ئەو پەرەسەندنەی کە بەسەر زانستی جینی دا لەسەدەی بیستەمدا هاتووە بووە مایەی کۆتایی پێ هێنانی ئەو داستانە خەیاڵیەی کە وتراوە سیفاتی وەگیاو لەنەوەیەکەوە بۆ نەوەیەکی تر دەگوێزرێتەوە، بەم شێوەیە (ئالیەتی هەڵبژاردنی سروشتی) کە داروین پێشکەشی کرد ئالیەتێکی بێ سوودەو هیچ کاریگەریەکی نیە لە تێڕوانینی زانستی نوێ وە.

---

[1] B. G. Ranganathan بی. جي. رانكاناثان. Origins الأصول ؟ بنسلفانيا : مانشيت الحقيقة الموثوقة ١٩٨٨!

## داروینزمی نویٚ و بازدانە بۆماوەییەکان

داروینیەکان هەستان بەیەکخستنی تەواوی هەوڵەکانیان بەرامبەر گرفت و کێشەی هزری کە ڕووبەڕووی دەبونەوە بەتایبەتی لە سیەکانی سەدەی بیستدا، لەبەر ئەوە پێشنیازی تیۆرێکی نوێیان کرد و ناویان نا (تیۆری پێکهاتنی نویٚ) یاخود ئەوەی کە ناسرا بە (داروینزمی نویٚ)، بەپێی ئەم تیۆرە هۆکارێکی ترهەیە کە کاریگەری پەرەسەندنی هەیە لەبەرامبەر هەڵبژاردنی سروشتیەوە، وەئەم هۆکارەش بریتی بوو لە چەند بازدانێکی بۆماوەیی یاخود جینی




گومانی تێدا نیە هەر لەسەرەتای سەدەی بیستەمەوە داروینیەکان بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدا بوون کەچەند بازدانێکی بۆ ماوەیی لەمێشدا بەئەنجام بگەیەنن بۆ سەلماندنی سودی ئەم بازدانانە، جگە لەوەی ئەم تاقیکردنەوانەی کە دەیان ساڵە بەردەوامە ئەنجامەکەشی تەنها مێشی کەم ئەندام و تێکچوو نەخۆش بوو ئەم وێنەیەی لای چەپی سەرەوەی وێنەیەکی مێشی میوەیە بەشێوە ئاساییەکەی خۆی بەڵام وێنەکەی لای ڕاست سەری مێشێکە لەئەنجامی تاقیکردنەوەکاندا تووشی زیان هاتووە.

کە دەبێتە هۆی ڕوودانی ئەو گۆڕانە بەسودانەی کە دەیانەوێت، وەئەم بازدانانەش ڕوو دەدەن یان لەبەر هۆکاری توشهاتی ئەو تیشکانە یان ئەنجامێکی هەڵەیە لەگرتنەوەی بۆ ماوەیی جینی دا. وەبەردەوام ئەم تیۆرە پشتگیری لەپەرەسەندن

دەکات لای زیندەوەران لە ژێر ناونیشانی داروینزمی نوێ دا، وەئەم تیۆرەش بە درێژی باس لەوە دەکات کە ئەندامەکان و پێکهاتەکانی لاشە کەزیندەوەران خاوەنیانن لەچەند پێکهاتەیەکی ئاڵۆزی وەك چاوو گوێ و جگەرو هتد..تەنها لەژێر کاریگەریەکی ڕوودانی چەند بازدانێکی بۆماوەییەوە پێکهاتوون یان دەرکەوتوون یاخود لەرێگەی ڕوودانی گۆڕانکاریەوە هاتووە کەلە جینەکاندا ڕوویداوە، بەڵام ئەم بانگەشەیە ڕووبەڕووی زانستی ڕاستەقینەی پزیشکی بووەتەوە چونکە بازدانە بۆماوەییەکان بەبەردەوامی زیانمەندبووە لەسەر زیندەوەران وەرۆژێك لەرۆژانیش نەبوەتە هۆی سوود پێگەیاندن. هۆی ئەمەش زۆر ڕوونە چونکە گەردیلەکانی DNA لەپێکهاتەیەکی زۆر ئاڵۆز دروست بووە،وەهەر گۆڕانکاریەکی گەردیلەیی هەڕەمەکی هەرچەند ناسکیش بێت بێگومان هەر کاریگەریەکی خراپی دەبێت، وە ئەم ڕاستیە زانستیەش زانای ئەمەریکی ب. ج. رانکاناثان B.G.Ranganathan کە پسپۆڕە لە زانستی جینەکاندا لەبارەیەوە دەڵێ : بازدانە بۆ ماوەییەکان زۆر بچوك و هەڕەمەك و زیانبەخشن وەجارو بارێش نەبێت ڕوونادەن، وەلەباشترین باردا هێشتا هەر کاریگەریەکەی زۆرکەم دەبێت. ئەم سێ تایبەتمەندیە گشتیە ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە بازدان ڕۆڵی نابێت لەکاری پەرەسەندندا، بەتایبەت هەرگۆڕانکاریەکی هەڕەمەکی لەشتێکی ئاڵۆزدا دەبێت زیانمەندبێت یان ناکاریگەربێت، بۆنموونە: هەرگۆڕانکاریەکی هەڕەمەکی و کوێرانە لە کاتژمێری دەستدا بێت بەرەو پێشی نابات و وای لێ ناکات بەرەو پێشەوە بڕوات. ئەگەری گەورە ئەوەیە کەتووشی زیانێکی بکات یاخود هیچ کاریگەریەکی نەبێت [1] . بەڕاستی ئەمە ڕوویداوە چونکە هەتا ئەمڕۆش بوونی بازدانێکی بۆماوەیی نەهاتووەتە ئاراوە کە هۆکاربێت لە چاککردنی پێکهاتەی جینی لاشەی

[1] تشارلز داروين ، أصل الأنواع : نسخة طبق الأصل للطبعة الأولى مطابع جامعة هارفارد ١٩٦٤ ص ١٧٩

زیندەوەردا. بەڵگە زانستیەکان سەلماندویانە تا ئێستا هەر بازدانێکی بۆماوەیی بوبێت زیانمەندبووە، وە بەم شێوازە ڕوون دەبێتەوە کەئەم بازدانە بۆماوەییەی کەکراونەتە هۆکارێك بۆپەرەسەندنی زیندەوەران لەلای داروینزمی نوێ تەنها هۆکارێکی خراپەکاری کاریگەرن لەسەر زیندەوەران، بەشێوازێك کە زۆرکات کەم ئەندام دەبن، (وەباشترین نمونەش بۆڕوودانی ئەم بازدانە بۆماوەییە لەلەشی مرۆڤدا بریتیە لەتووشبون بەنەخۆشی شێرپەنچە) وە لە حاڵەتێکی بەم شێوەدا ناتوانرێت بازدانە بۆماوەییەکان کە کاریگەری زیانمەندیان هەیە بەئامرازێکی زانستی دابنرێت بۆڕاڤەکردنی کرداری پەرەسەندن. وەلەلایەکی ترەوە ئامرازی هەڵبژاردنی سروشتی ئەویش لە ڕۆڵی خۆیەوە ناکرێ خۆی بەتەنها کاریگەری هەبێ بە پێی ی دان پێدانانەکانی داروین، وەبەم شێوازەش چەمکێك نیە بەپەرەسەندن ناو ببرێت، واتە کرداری پەرەسەندن لە زیندەوەراندا هەرگیز ڕووی نەداوە.

### تۆمارە بەبەردبووەکان

## کاریگەریان نیە لەسەر دروستکراوە گۆڕاوەکان یاخود بازنەناوەندەکان

تۆمارە بەبەردبووەکان بە باشترین بەڵگە دادەنرێن لەسەر بەرپانەبوونی هیچێك لەو سیناریۆیانەی کە تیۆری پەرەسەندن بانگەشەیان بۆ دەکات، ئەم تیۆرە بانگەشەی ئەوە دەکات کە بونەوەرە زیندووەکان بەهەموو جۆرەکانیانەوە یەك لەیەکتردروست بوون، جا لەبەر ئەوە بە پێی ئەم بانگەشەیە دەکرێت جۆرێك لەو بوونەوەرە زیندوانە بە تێپەڕ بوونی کات ببێت بۆ جۆرێکی تر، وە بەم شێوەیەش چەند جۆرێکی جیاواز لە زیندەوەران پەیدا بوون، بە پێی ئەم تیۆرە ئەم گۆڕانە هەمە چەشنەییە سەدەها ملیۆن ساڵی خایاندووە. وەبەپێی ئەم بانگەشەیە دەبێت بوونی چەند جۆرێکی

گۆڕاو یاخود بازنەی ناوەند هەبن کەبە درێژایی ماوەکەی گۆڕانی هەمە چەشنەی لە زیندەوەرەکاندا ڕوویاندا بێت. بۆ نموونە دەکرێت چەند بونەوەرێك هەبن کە هەڵگری سیفاتی هاوبەش بن لەماسی و خشۆکەکاندا، چونکە ئەوانە لەسەرەتادا بوونەوەری ئاوی بوون و لەناوئاویشدا ژیاون دواتر بە شێوازی پلەبەندی گۆڕاون بۆ خشۆکەکان. یاخود دەبوو چەند بوونەوەرێکی خاوەن سیفاتی هاوبەش لەباڵندە و خشۆکەکان بووبن چونکە ئەمانە لەسەرەتادا خشۆك بوون دواتر گۆڕاون بۆ باڵندە. وەك ئەوان دەڵێن ئەم بوونەوەرە جیاوازانە لەقۆناغی گۆڕان تێپەڕیوون کەواتە لەو کاتەدا خاوەنی تێك چوونێکی شێوەیی بووبن یان کەم ئەندام بووبن، وەبانگەشەکەرانی پەرەسەندن ئەم جۆرە بوونەوەرە گۆڕاوانە بەناوی (بازنە ناوەندەکان) ناوزەد دەکەن. ئەگەر وادابنێین ئەم (بازنە ناوەندانە) لە مێژوویەکی دووردا ژیاون، ئەوسا دەبوایە کە ئەمانە بە ژمارەیەکی زۆر و هێجگار جۆراو جۆرەوە چەندین ملیاریان لێ پەیدا ببوایەوە دەبوو کەلەو دۆزراوە بەبەردبووانەش شوێنەوارێکیان لێ جێبمایە، داروین ئەم ڕاستیە لە کتێبەکەیدا بەم شێوازە باس دەکات (ئەگەر تیۆرەکەم ڕاست بێت ئەوە دەبێت کەئەم زیندەوەرە بەیرانە لەیەکێك لەسەردەمەکاندا لەسەر زەویدا ژیابن... وەباشترین بەڵگەش لەسەر بوونیان ئەو هەڵکۆڵەرانەن کە بەبەردبوەکانی تێدا دۆزراوەتەوە [1].

---

[1] Derek A. Ager دیریك. أ. آجر ، The Nature of the fosseil record كبيعة سجلات المتفريات محاضر الجمعية الجيولوجية البريطانية المجلد ١٩٧٦٨٧ ص ١٣٣.

## بێ ئومێدیەکانی داروین

لەناوەڕاستی سەدەی نۆزدەو تاکو ئێستاش هەڵکەندن و پشکنینی زۆر باش ئەنجام دراوە بەڵام هیچ شوێنەوارێك نە دۆزراوەتەوە لەم (بازنە ناوەندانە یان شێوە گۆڕاوانە) بەڵکو بەپێچەوانەوە بەبەردبووەکان کەلەئەنجامی هەڵکەندنەکانەوە دەست کەوتوون سەلماندویانە کە بۆچونی داروینیەکان کە دەڵێ : سەرجەم زیندەوەرە جۆریە جۆرەکان لە پڕێکدا و لەسەر باشترین شێواز هاتوونەتە بوون تەواو پێچەوانەی ڕاستیەکانە. وەیەکێك لەلایەنگرانی داروین بەناوی (دیریك وایکر) W. Ager Derek کە پسپۆڕی بەریتانیە لە زانستی بەبەردبووەکاندا دانی بەم ڕاستیەدا ناوە کە دەڵێ : گرفتی ڕاستەقینەی ئێمە بریتیە لە دۆزینەوەی بوونەوەرێکی زیندووی تەواوەتی جائەمە لەسەر ئاستی جۆروشێوە یان کۆمەڵ بێت کاتێ لەپاشماوەی بەبەردبووەکان وردبوینەوە، وە ئەو حاڵەتەشمان هەمو کاتێك ڕوو بەڕوو بووەتەوە بەبێ ئەوەی کە هیچ شوێن پێیەکی یەکێك لەوبەدیهاتووانە بدۆزینەوە [1].. واتە بەبەردبووەکان ئەوەیان بۆ سەلماندین کەتەواوی زیندەوەرەکان لە پڕێکدا دەرکەوتن بەبێ هیچ شێوازێکی گۆڕاوی. ئەمەش لەڕاستیدا پێچەوانەی بانگەشەکانی داروینن کەدەیکردن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە ئەم زیندەوەرانە بەدیهاتوون، لەبەرئەوە تەنها ڕاڤەوشیکردنەوەیەك بۆئەوەی زیندەوەرێك بەبێ ئەوەی باپیرەیەکی دیاری کراوی هەبێت و لە پڕێکدا هاتبێتە بوون ئەبێت بەدیهاتووبێت، وەئەم ڕاستیەش زانای زیندەوەر ناسی بەناو بانگی وەك دوگلاس فوتویاما Douglas Futuyma پەسەندی کردووە کە دەڵێت : لە ڕاستیدا بەدیهاتن و پەرەسەندن دوو چەمك یان دوو ڕاڤەی باون بۆ ڕاڤە کردنی

---

[1] Douglas J. Futuyma دوغلاس. جي. فوتويما ، العلم في ففص الأتهام ، نيويورك : مطبوعات بانثيون ١٩٨٢ ص ١٩٧



تۆماره بەبەردبوەکان بەگەورەترین ڕێگر دادەنرێت لەبەردەم بڵاو بونەوەی تیۆری پەرەسەندندا، چونکە ئەو تۆمارانە دەریانخستوه کە بوونەوره زیندوەکان لەپڕێکداو وەبەم شێوه ی ئێستایان پەیدابوون بەبێ ئەوەی هیچ جۆره هاوشێوەیەکیان هەبێت. وە ئەم ڕاستیەش بەدڵنیاییەوە ئەوە دەردەخات کە تەواوی بوونەوره زیندوەکان دروست کراون.

بوونی زیندەوەران لە دونیای زانست دا، جا زیندەوەران یان لەناکاو لەپڕێکدا لەسەر زەوی پەیدابوون لەسەر باشترین شێواز یان نا، واتە لەبەر ئەنجامی ئەو گۆڕانەی کەبەسەر جۆرەکان دا یان بەسەر باپیرەکانیاندا کەلە پێش ئەماندا ژیاون هاتووە، وەئەگەر لە پڕێکدا و بە شێوەیەکی تەواویش پەیدا بووبن دەبێت هێزێکی بێ سنوور هەبێت هاوکات لەگەڵ هۆشێك کەئاگای لە هەموو شتێك بێت و سەرپەرشتی بوونی ئەم بوونەوەرە زیندووانەی کردبێت [1]. بەم شێوەیە ڕۆشن دەبێتەوە کە بەبەردبووەکان ئەوە دەسەلێنن کە زیندەوەرەکان لە پڕێکدا لەسەر زەوی پەیدا بوون و لەسەر باشترین شێوە، کەواتە بنچینەی جۆرەکان بەدیهاتنە نەك پەرەسەندن وەك ئەوەی داروین وای بۆ دەچێت.

---

Solly Zuckerman سوللي زاخرمان ، Beyond the ivory tower من خلال البرج العاجي ، نيويورك منشورات توبلينغر ١٩٧٠ ص ٧٥ ـ ٩٤

Charles E. Oxnard ، موقع أوسترالو بيثيسنس في السلم التطوري للأنسان : ارضية ملائمة للشكوك ، مجلة ٢٥٨ ص ٢٨٩

# چیرۆکی هەڵبەستراو سەبارەت بە پەرەسەندنی مرۆڤ

لە ڕاستیدا گرنگترین ئەو بابەتانەی کە بۆ مشت و مڕکردن پێشنیازکراون سەبارەت بە تیۆری پەرەسەندن بێ گومان بریتیەلەبناغەوبنچینەی مرۆڤ، لەم ڕوانگەیەوە تیۆری داروینی بانگەشەی ئەوەدەکات کە ئەم مرۆڤەی ئێستا هەیە لەئەنجامی پەرەسەندنی بونەوەری زیندووی هاوشێوەی وەك مەیمون گەشەی کردووە، کە لە دێر زەمانەوە ژیاوە، وە ماوەی پەرەسەندنەکە دەگەڕێتەوە بۆ (٤ — ٥) ملیۆن ساڵ لەمەوپێش، وەئەم تیۆرە بانگەشەی بوونی هەندێك شێوازی ئەوکاتەی مرۆڤ دەکات کە لەو ماوەیەدا ژیاون، وەبەپێی ئەم بانگەشە خەیاڵیە چوار کۆمەڵی سەرەکی هەن لەناو کرداری پەرەسەندنی مرۆڤدا کە بریتین لە :

١ — **ئوسترالوبیثیکوس**.

٢ — هومو هابیلیس.

٣ — هوموئەریکتوس.

٤ — هومو سابینس.

بانگەشە کەرانی پەرەسەندن بەباپیرە گەورەی مرۆڤی ئێستا دەڵێن (**ئوسترالوبیثیکوس**) یان (مەیمونی باشوور) بەڵام ئەم بەدیهێنراوانە شتێك نین جگەلەجۆرە مەیمونێکی جیاواز کەتیاچوون، وەلە ڕاستیدا توێژینەوەکانی هەریەك لە پرۆفیسۆر تشارلز ئۆکسناردی ئەمریکی Charles Oxnard و لۆردسۆلی زاخرمانی بەریتانی SollyZuekerman کە یەکێکن لەبەناوبانگترین زانایانی بواری توێژینەوە لەسەر مەیمونی باشوور ئەوەیان سەلماندوە کەئەم جۆرە زیندەوەرانە تەنها جۆرێکی لەناوچوون لە مەیمون کە بە هیچ شێوەیەك پەیوەندی بە مرۆڤەوە

نیە [1]. وەئەو قۆناغەی بەدوای مەیمونی باشووردا دێت لەلایەن داروینیەکانەوە پێی دەوترێت (هومو) یان (مرۆڤ) وەلەسەرجەم قۆناغەکانی (هومو) دا ئەم زیندەوەرە زۆرترین پەرەسەندنی بەسەردا هاتووە لەچاو مەیمونی باشووردا، وەداروینیەکان هەستاون بەدانانی پاشماوەی ئەم جۆرە مەیمونە لەناوچووانە ئەویش وەك بەلگەیەك لەسەر ڕاستی و دروستی تیۆرەکەیان وە بۆ سەلماندنی ئەوەی کە نەخشەی ئەم پەرەسەندنە خەیاڵیە هەبووە، وەدەڵێین خەیاڵی چونکە تاکوو ئێستا هیچ پەیوەندیەکی پەرەسەندن لەنێوان ئەم جۆرە جیاوازانەدا نەسەلمێنراوە.



هیچ تۆمارێکی بەبەرد بوو نیە پاڵپشتی تیۆری پەرەسەندن بکات، بەپێچەوانەوە ئەو تۆمارە بەبەردبوانەی ئەوەیان سەلماند خاڵێك یان جیاوازی هەیە لەنێوان مرۆڤ و مەیموندا ناکرێت پیا تێپەڕ بین، بەلام سەرەڕای ئەم ڕاستیەش داروینیەکان بەردەوام پەیڕەوی لەتیۆرەکەیان دەکەن ئەویش بەیارمەتی چەند وێنەیەکی خەیاڵی کە هەڵدەسن بەدانانی چەند شێوەیەك لەسەر ئەو وێنانە بەشێوازێك بێتە مایەی سەرنج ڕاکێشانی خەڵك و هاوکات بێتە مایەی پاڵپشتی بۆ تیۆرە خەیاڵیەکە کە پێی وایە لەنێوان مرۆڤ و مەیموندا بوونەوەرێکی دیکە هەیە.

ئەرنست مایر Ernest Mayer کەیەکێکە لەبانگەشەکەرانی تیۆری پەرەسەندن لەسەدەی بیستدا ئەم تیۆرەی بەخەیاڵی داناوە کەدەڵێ : (ئەو زنجیرەیەی

[1] J.Rennie جي رينيه ، Darwins Current bulldog: frnes Nayr أرنست ماير: سفسطة داروين المستمرة ، المجلة العلمية الأمريكية ديسمبر ١٩٩٢

كە بۆ هوموساپینینس درێژدەبێتەوە ئەڵقەکانی پچڕاون بەڵکو بزریش بوون) [1].
وەزنجیرەیەکی تر هەیە داروینیەکان بۆ سەلماندنی ڕاستیەکانیان هەوڵی بۆ دەدەن کە پێکهاتووە لە مەیمونەکانی باشوور (ئوسترا لوبیثیکوس) وە (هوموهابیلیس، هوموارێکتوس، هوموساپینیس) واتە کۆنترینیان بە باپیرەی ئەو وەچەیە دادەنرێت کە بەدوایدا دێت، بەڵام ئەو دۆزینەوانەی کە زانایانی بەبەردبوناس پەییان پێ بردوون و سەلماندویانە کەمەیمونی باشوورو هوموهابیلیس وهوموارێکتوس لەهەمان کات و لەشوێنی جیاوازدا هەبوون [2]، لەوەش گرنگتر ئەوەیە کە بوونی چەند جۆرێك لە هوموئەرێکتوس هەتاسەردەمە تازەکانی ئەم دواییە ژیاون، وە ژیانیشیان بەسەربردووە شان بەشانی یەکترلەگەڵ هومو ساپینیس نیاندر تالیسیسن و هومو ساپینیس کە بە (مرۆڤی ئێستا) دەناسرێت [3]. وەئەم دۆزینەوانە ناڕاستی ئەوەیان سەلماند کە هیچ کامیان باپیرەی ئەوەی تریان نیە، وەلە بەردەم ئەم بیرۆکە هزریەداکەرووبەڕووی تیۆری داروین لەپەرەسەندندا کرایەوە، یەکێك لە بانگەشەکەرانی ئەم تیۆرە بەناوی ستیڤن جی کولد Stephen jayGould کە پسپۆڕە لەزانستی بەبەردبووەکاندا لە زانکۆی هارفارد دەڵێ : (ئەگەر ئەو سێ جۆرە کە هاوشێوەی مرۆڤن لەیەك سەردەمدا ژیابن، کەواتە چی بەسەر ڕەچەڵەك و بنچینەی مرۆڤدا هاتووە ؟ دیارە کە هیچ کامیان باپیرەی ئەوی تریان نیە، لەوەش ناخۆشتر ئەوەیە کاتێك بەراورد لەنێوانیاندا دەکرێت ناگەین

---

[1] Alan Walker ، العلم العدد ١٩٨٠٢٠٧ ص ١١٠٣ .A.J. kelso ، الأنثرلوبوجيا الفيزيائية ، الطبعة الأولى ، نيويورك : شركة J.B. Lipincott
١٩٧٠ ص ٢٢١ ، D.Leakey أولديواي كوركي العدد ٣ كمبريدج : مطابع جامعة كمبريدج ١٩٧١ ص ٢٧٢

[2] مجلة نوفمبر ١٩٩٦

[3] S.l. Gould س. ج. كولد : Natural التاريخ الطبيعي العدد ٨٥ ١٩٧٦ ص ٢٠

بەهیچ پەیوەندیەکی پەرسەندن لەنێوانیاندا)[1] زۆر بەراشکاوی ئەو چیرۆکە خەیاڵیە دروستکراوەی کەڵەبارەی پەرەسەندنی مرۆڤەوە ئەدوێ وەباس لە جۆرێك زیندەوەر دەکات کە بەشێکی مەیمونەو بەشەکەی دیکەی مرۆڤە هاوکات لەرێگەی ڕاگەیاندن و میدیاکانیشەوە گرنگی و بایەخی زۆری پێدراوەلەڕاستیداهیچ بنەمایەکی زانستی نیە، وەزاناو پسپۆڕی بەریتانی لۆرد سولی زاخرمان بۆماوەی پانزە ساڵ لەسەر مەیمونە بەبەردبووەکانی باشوور لەلێکۆڵینەوەی بەردەوامدابوو، لەگەڵ ئەوەشدا کەئەم زانایە تاقیگەیەکی زانستی تایبەتی خۆی هەیە وەك پسپۆڕێك لەزانستی بەبەردبووەکاندا، وە گەیشتە ئەو ڕاستیەی کە هیچ زنجیرەیەکی پەیوەست لەنێوان ئەو زیندەوەرە مەیمونە هاوشێوانەدا. نیە بەمرۆڤەوە، وەدانیشی نا بەم ئەنجامەدا هەرچەندە خۆی هەلگری بیروباوەڕی داروینیە، زاخرمان هەستا بەدانانی خشتەیەکی تایبەت بەزانیاریەکان وە تیایدا هەموو ئەو لقانەی کە بەزانستی دەزانین پلەپەندی کرد، هاوکات لەگەڵ ئەو لقانەی کەوای دادەنا لەدەرەوەی زانستدان، وەبە پێی خشتەکەی زاخرمان ئەو لقە زانستیانەش دەگرێتەوە کە پاڵپشتی چەند بەڵگەیەکی مادی زانستی کیمیایی و فیزیاییین. وەبەدوای ئەمانیشدا زانستی زیندەوەر ناسی دێن ودواتریش زانستی کۆمەڵناسی، وە لەدوای هەمووشیانەوە واتە لەکەناری خشتەکەدا ئەو بەشانە دێن کە سەر بەزانست نین، وەلەم بەشە شدا گۆڕینەوەی بیروڕاکان و هەستی شەشەم و هەست کردنی دووری دانا، وەدواجاریش زانستی پەرەسەندنی مرۆڤ، وە زاخرمان لەکۆتابەشی دەکۆڵێتەوەو بەم شێوەیە لێی دەدوێ (کاتێك لەزانستە مادیەکانەوە گوزەردەکەین بەرەو لقەکان کە پەیوەندیان بەزانستی زیندەوەرناسی و زانستی دوور یان هەستکردن لەدوورەوە هەیە و تەنانەت زانستی زانینی مێژووی مرۆڤ لەڕێگەی

---

[1] Beyond The Ivory Tower. Solly Zuckerman من خلال البرج العاجي ، نيويورك : منشورات توبلينغر ١٩٧٠ ص ١٩

پاشماوە بەبەردبووەکانەوە، دەبینین کە هەموو شتێك ئەگەری بوونی هەیەو لەوانەیە ببێت، بەتایبەت کەسێك کە باوەڕی بەتیۆری پەرەسەندن هەبێت ئەوا ئەو کات ناچاردەبێت لەهەمان کاتدا باوەڕ بەئەگەرە دژەیەکەکانیش بهێنێت)[1] کەواتە چیرۆکی هە لێبستاو لەپەرەسەندنی مرۆڤدا جگەلە بیروڕایەکی کوێرانە نەبێت هیچی تر نیە، کەلەلایەن هەندێ کەسەوە کراوە بەلێکدانەوەی ناژیرانە بۆ بنچینەی هەندێ لە بەبەردبووە دۆزراوەکان.

## تەکنیکە بالآکان لە چاوو گوێ دا

لەڕاستیدا تیۆری پەرەسەندن تەواو بێ توانایە لەبەردەم ڕاڤەکردنی بابەتێکی دیکەدا ئەویش چۆنیەتی بوونی ئەم ئاستە بەرزەیە لە هەستکردندا جاچ لە چاودابێت یاخود لە گوێ دا، بەرلەوەی بابەتی چاو شی بکەینەوە زۆر بەکورتی چاوێك دەخشێنین بەسەر چۆنیەتی بە جێ هێنانی کرداری بینین لەچاودا، ئەو تیشکەی بەرشتەکانی دەوروپشتمان دەکەوێت بەشێوازێکی هەڵەو گەڕاو دەیداتەوە لەچاو، وەئەم تیشکەش لە ڕێگەی ئەو خانانەی کەلەتۆڕی چاودا هەن دەکرێت بە چەند هێمایەکی کارەبایی کە دەگەڕێتەوە بۆ مەڵبەندی بینین کە دەکەوێتە کۆتایی مۆخی مرۆڤ، وەدوای زنجیرەیەك کارلێکردن ڕاڤەی ئەم هێمایانە لێك دەدرێنەوە و لەرێگەی ناوەندی بینینەوە دەکرێن بە وێنەیەك بۆ ئەو شتە. وەدوای ئەم نمایشەکورتە باکەمێك بیربکەینەوە لەوەی کە لێی دەدوێن : مۆخی مرۆڤ دوورە لە تیشك، واتە ناوەڕۆکی مێشك بەتەواوەتی تاریکە و تیشکیش ناتوانێ بچێتە ناویەوە، یا ڕوونتر بڵێین بەهیچ شێوازێك ناتوانێ بگاتە ناوەندی بینین، پێدەچێ ئەو ناوەندە لە هەموو شوێنێك تاریکتربێت، بەڵام مرۆڤ دەتوانێت بە یارمەتی ئەم

---

[1] Richard Lewontin ریتشارد ليوينتن ، The demon-haunted world العالم المثابة الشريرة ، دليل نيويورك للكتب ٩ يناير ١٩٩٧ ص ٢٨

ناوەندە زۆر تاریکەشەوە ببینیّ، لە پاڵ ئەوەی کە ئەم بینینە تیژوو روونە تا ئەو رادەیەی کە زانستی نوێی پێشکەوتووی سەدەی بیست و یەکیش لاوازە لەبەرامبەریدا کەشتێك لە وێنەی ئەو پەیدا بکات، بۆ نمونە تەماشای ئەو کتێبە بکەن کەلەبەر دەستاندایە وە سەیرێکی هەرچوار لای خۆشتان بکەن ئایا چ وێنەیەك دەبینن وەك ئەو وێنەیەی کە ئێستا دەیبینن روون و ئاشکرابووە ؟ ئەو روونیەی لەو وێنەیەدا هەیە ناتوانرێت ببینرێت ئەگەر لەچاکترین تەلەفزیۆنیشدا بێت کە ئێستا دروست کراوە، وە بەردەوام ئەندازیارو شارەزاکان ماوەی سەد ساڵە کاران و کۆڵنادەن بۆ بەدەست خستنی وێنەیەکی روونی وەك ئەوەی کە ئێوە ئێستا بەچاوی خۆتان دەیبینن، وەجارێکی تریش سەیری شاشەی تەلەفزیۆنەکە بکەرەوە دیسانەوە سەیری کتێبەکەی بەردەستت بکە، لەوێدا جیاوازیەکی گەورەو بەرفراوان لە نێوان ئەو دوو وێنەیەدا هەیە لەلایەنی روونی و خاوێنی وجوانیدا، ئەمە جگە لەوەی وێنەی تەلەفزیۆنەکە دوو دووریە بەڵام ئەوەی بەچاو دەبینرێت سیّ دووریە، ماوەی چەندین ساڵە چەند توێژینەوە و پرۆژەیەك هەیە دەکرێت بۆ بەرهەم هێنانی تەلەفزیۆنیك کەوێنەکەی سیّ دووری بێت وەك ئەو وێنەیە بێت کە مرۆڤ دەیبینێت، وەمرۆڤ لەدروست کردنی ئەم تەلەفزیۆنەدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا بەڵام وێنەی سەر شاشەکەی بە بەکارهێنانی چاویلکەی تایبەتەوە نەبێت نابینرێت، ئەمەجگە لەوەی وێنەکانیش تەنها دەسکردەو هیچی تر، چونکە پشتی وێنەکە روون نیەو پێشەکەشی لە پارچە کاغەزێك دەچێت و هەرگیز ناتوانرێت وێنەیەك دروست بکرێت شان بەشانی ئەو وێنەیە بێت کەچاوی مرۆڤ پەی پیّ دەبات، چونکە ئەو وێنەیەی کە کامێرا یان تەلەفزیۆن دروستی دەکات دەبێت تۆزێك ناتەواوی تێدابێت یان بەشێك لە خاوێنیەکەی لەدەست بدات، لێرەدا داروینیەکان بانگەشەی ئەوە دەکەن کەئەو روون و تیژیەی لە دروستکردنی وێنەکەدا لەلایەن بینایەوە بە رێکەوت روویداوە، وەئەگەر یەکێك لەوان پێتان بڵێت ئەو تەلەفزیۆنەی کەلە

ژوورەکەتاندایە دووبارە ئەویش بە ڕێکەوت دروست بووە بەوەی کە گەردیلەکان کۆبوونەتەوە لەگەڵ یەکتریدا و لەناو خۆیاندا ئەم ئامێرە سەیرەیان دروست کردووە کە پێی دەوترێت تەلەفزیۆن، ئایا بەچ شێوازێك ئەم هەواڵە لێك دەدەنەوە ؟ ئایا چۆن گەردیلەکان بەکارێك هەڵدەستن کە ملیۆنەها کەس لە بەرامبەریدا بێ دەسەڵاتە ؟. کەواتە ئەگەر ئەستەم بێت ئامێرێك کە زۆر ساناترە لە چاو بەڕێکەوت بێتە ئاراوە هەروەها بەو شێوازە خودی چاو و ئەو وێنەیەی کە چاو دروستی دەکات ئەستەمە بە ڕێکەوت بێتە ئاراوە، وە هەمان شت دەکرێت بکرێت بەنموونە بۆ گوێ. چونکە گوێچکەی دەرەوە هەڵدەستێت بە پێشوازی شەپۆلە دەنگیەکان وە کۆیان دەکاتەوە پاشان گوێچکەی ناوەڕاست هەڵدەستێ بەبەهێزکردنی ئەم شەپۆلانەو گواستنەوەیان بۆ گوێچکەی ناوەوە و ئەویش لەلایەن خۆیەوە هەڵدەستێت بە گۆڕینی ئەو شەپۆلە دەنگیانە بۆ چەند هێمایەکی کارەبایی کە دەگوازرێنەوە بۆ ناو مۆخ، وەلێرەدا لە بینین و چاودا چی ڕوویدا بەهەمان شێوەش لێرەدا ڕوو دەدات، چونکە ناوەندی بیستن لەناومۆخدا هەڵدەستێت بە لێکدانەوەی ئەو هێما کارەباییانە بۆ دەنگێکی بیستراو. وەدەتوانرێت هەمان لێدوان بکرێت بەومانایەی مۆخی مرۆڤ داخراوە بە ڕووی دەنگەکاندا، هەروەك چۆن بەرامبەر ڕووناکی داخراوە، واتە لەناو مێشکدا دەنگ بوونی نیە ئەگەرچی ژاوەژاو دەنگی بەرزیش لە دەوروبەردا هەبێت، لەگەڵ ئەوەشدا هەست بە هەستەوەرترین دەنگ و ڕوونترینیان دەکرێت لەلایەن مێشکەوە، وە ئێوەش دەتوانن بەهۆی ئەو مێشکەتانەوە کە دەنگی تێدانیە گوێ لەئۆرکسترایەك بگرن کە سەمفۆنیالێ دەدات، یان گوێ بیستی ژاوەژاوی سەرجادەو کۆلانەکان بن، بەلام ئەگەر لە کاتی گوێ گرتن لە مۆسیقایەکی دەنگ بەرزدائامێرێکی پێوانی دەنگ لەسەر مێشك دابنرێت ئەوکاتە دڵنیادەبین لەوەی کە بێدەنگیەکی تەواومان لەناومێشکدا دەست دەکەوێت. هەروەك چۆن تەکنەلۆژیامان بەکارهێنا بۆ وردترینی وێنەکان و

ڕوونترینیان هەمان شت باس دەکەین بۆ دەنگیش، هەوڵەکانیش بەردەوامن ماوەی دەیان ساڵە بۆ دەستخستنی ڕوونترین و باشترین دەنگ. ئامێرەکانی تۆمار کردنی دەنگ و ئامێرەکانی بیستنی مۆسیقا و ئامێرەکانی تری ئەلیکترۆنی کە هەستیارن بەرامبەر دەنگ هەر هەموویان لەئەنجامی ئەو هەوڵانەدا دروست کراون. وەلەگەڵ ئەوەی ژمارەیەکی زۆر ئەندازیارو هەڵکەوتوو لەوبوارەدا هەن، ئەو ئامێرە دروستکراوانەی دەنگ کە لەلایەن چاکترین کارگەکانەوە بەرهەم هێنراوە ئەو دەنگەی کە دەریدەکەن ناتەواویەکی تێدایە کەئەندازەیەك لەخاوێنی و ڕوونیەکەی وون کردووە، بەڵام ئەو دەنگەی لە گوێچکەمانەوە پێمان دەگات ڕوونترین وخاوێنترین دەنگە چونکە گوێچکەی مرۆڤ لەکاتی بیستندا ئەو زیکەزیك و ژاوەژاوەی لەگەڵدانیە بەڵکو هەڵدەستێت بە پێشوازی کردن لە دەنگەکە بەبێ هیچ گۆڕانکاریەك، ئەم شتەش بەبەردەوامی بووە و هەروەکو خۆیشی کاری کردووە لەوەتەی مرۆڤ تائێستا بەدی هێنراوە، وەهیچ ئامێرێك لە دروست کراوەکانی دەستی مرۆڤ دەنگی بێت یان وێنەیی بەپلەی ڕۆشنی و وردی چاو و گوێی خوا کردی مرۆڤ بەهێز نەبوون، بەڵام ڕاستیەکی گەورەی دیکە هەیە لەو دیوو هەستی بیستنی مرۆڤەوەیە بە ڕوونی دەربڕین لەخۆی دەکات. باڵەخۆمان بپرسین هەستکردنی تایبەت بە بیستن و بینین لەناو مێشکدا بۆ کێ دەگەڕێتەوە ؟ چی لەناو مێشکدا هەیە و ئەو جیهانە گەشەپڕ لەڕەنگە دەبینێت لەچوار دەورماندا یان گوێی لە دەنگی باڵندەو مۆسیقای سەمفۆنیای کاریگەر دەبێت یان بۆنی خۆشی گوڵە خاوێنەکان دەکات ؟. هێماکارەباییەکان کەلەئەندامە زیندووەکانی لووت و گوێ و چاودا هەن دەڕۆن بەرەو مێشك وەلەڕێگەی خوێندنەوەی کتێبە زانستیەکانی زیندەوەرزانی کیمیاو فیزیاوە دەتوانین بزانین ئەو هێما کارەباییانە لەمێشکدا دەبن بە وێنەو دەنگ وبۆن. بەڵام ڕاستیەك هەیە پەیوەستە بەم باسەوە کە ناتوانین لە هیچ کام لەم کتێبانەدا بەدی بکەین، ئایا ئەوشتە چی یە کە بۆن دەکات یان

دەبیستێ یان دەبینێ لەناو مێشکدا ؟ چونکە لەناو مێشکدا سیستەمێکی پێشکەوتوی تایبەت هەیە دەتوانێ ببینێ و ببیستێ و بۆن بکات بە بێ پێویست بوون بە چاو گوێ و لووت. ئایائەم سیستەمە پێشکەوتووە بۆ کێ دەگەڕێتەوە ؟. ئەم سیستەمەپێشکەوتووە تەنها بریتیە لەو گیانەی کە خوای گەورەی زاناو دانا بەدی هێناوە، چونکە گیان پێویستی بە چاو نیە هەتاوەکو ببینێ وە پێویستیشی بە گوێ نیە هەتاوەکو ببیستێ وە پێویستیشی بە مێشك نیە هەتاوەکو بیر بکاتەوە لەوەدا کەلەوە دوورترن. هەڵبەت ئەم سیستەمەپێشکەوتووە بۆ ئەو مێشکە ناگەڕێتەوە کە لە کۆمەڵێك دەمار یان خانەی هەستەوەر پێکهاتووە، لەبەرئەوە داروینیەکان بێ توانان کە گومان دەبەن بەوەی کە بنچینەی هەموشتێك مادەیە کاتێك کە دەستەمۆدەبن لەبەرامبەر ئەم پرسیارانەدا. پێویستە لەسەر مرۆڤ تێڕوانینی تەواوی هەبێت لەبەرامبەر ئەم ڕاستیەدا لەلایەك کەچەند سانتیمەترێکی چوارگۆشەیی لە مێشکدا دەتوانێت وێنەی سێ دووری دربکات و بوونەوەرەکانی پێ ببینێت وە گەشەکردوترینی ڕەنگەکانیشی دەربخات بە هۆی تواناو دەسەڵاتی خوای باڵا دەست، کەواتە پێویستە لەسەر مرۆڤ کە لە پەروەردگاری خۆی بترسێ و ستایشی بکات و پێ زان بێت بەو هەموو نازو نیعمەتانەی کە بەسەریەوە هەیەتی.

## بیروباوەڕی مادی

لەڕاستیدا تیۆری تایبەت بەپەرەسەندن و ئەو کەم وکوڕیانەی کەلەگەڵ بەڵگەو زانستە ئاشکراکاندا هەیە خستەڕوو هاوکات لەگەڵ ئەو کەم وکوڕیەی کە بیرۆکەی پەرەسەندن سەبارەت بە بنچینەی ژیان هەیەتی لەگەڵ یاسا زانستیەکاندا، وەهەروەها باسمان لە چۆنیەتی نەبوونی کاریگەری تیۆری پەرەسەندن کرد بۆ سەرجەم هۆکارەکان کە ئەم تیۆرە بانگەشەیان بۆ دەکات، وەلەگەڵ نەبوونی هیچ شوێنەوارێکی بەبەردبوو کە شێوە گۆڕاو یان بازنە ناوەندەکان بسەلمێنێت کەبەسەر

ژیاندا هاتووه لەمێژوودا، لەبەرئەم هۆیە دەگەینە ئەو ڕاستیەی کە پێویستە واز لەو تیۆرە بهێنین کەلەگەڵ یاسازانستی و عەقڵیەکاندا هاوڕانین، وەدەبێت ئەم تیۆرەش کوتایی پێ بێت وەك چۆن بە درێژایی مێژوو چەندین تیۆری هاوێنەی ئەو کۆتاییان پێ هات کە هەندێك لەو تیۆرانە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە زەوی چەق و ناو کرۆکی گەردوونە، بەلاّم سەیر لەوەدایە کە هەندێك بۆ پاڵپشتی کردن لەم تیۆرە و مانەوەی لەبەرامبەر ئەو ڕووداو و زانستیانەی کەلە ئارادان، جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە کەهەر ڕەخنەیەك ڕوو بەڕووی ئەم تیۆرە بکرێتەوە هێرش کردنە بۆ سەر زانست و زانایان. هۆی ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆئەوەی هەندێك لایەن مەسەلەکەیان .وەك باوەڕێکی توند وەرگرتووە کەناتوانن وازی لێ بهێنن. ئەولایەنانەش بیروبۆچونیان بە مادی ناسراوە بگرە بە هزری مادیشەوە بەستراون،بەبەستنەوەیەکی کوێرانەوە داروینیەکان لێکدانەوەی مادی بەتەنها لێکدانەوەیەك دەزانن بۆسروشت.

وە هەندێ جاریش ئەم لایەنانە دان بە ڕاستیەکانی پێشوودا دەنێن وەك چۆن ریشارد دلیونتن Richard DLewontin دەڵێ کەیەکێکە لەتوێژەرە بەناو بانگەکانی زانستی جینیەکان کەلە زانکۆی هار فارد کاردەکات و هاوکات یەکێکیشە لەو بەرگری کارە توندڕەوانەی کە پاڵپشتی لە تیۆری پەرەسەندن دەکات وەخۆی بەکەسێکی مادی دادەنێت پاشان بە پیاوێکی زانست ناس (ئێمە بڕوامان بەمادە هەیەو بەو شتانەش کەلە پێشدا بڕوایان پێ هێنرابوو، وەئەو بڕوا پێشینەی کەبە فەلسەفەی مادی و ئەو پەیوەندیەی کەلە گەڵیدا هەمانە وامان لێ دەکات ڕاڤە و لێکدانەوە و تێگەیشتنمان بۆ هەموو دیاردەکانی جیهان مادی بێت، نەك بۆیاساکانی زانست و بنەماکانی،.وە ئەو بڕوا ڕەهایەمان بەمادە وای کردووە کە هۆکارێك بێت بۆ پاڵپشتی کردنی بێ سنووری سەرجەم ئەو توێژینەوانەی کەدەکرێت بۆ ئەوەی ڕاڤەو لێکدانەوەیەکی مادیانە بکەین بۆ تێکڕای

دیاردەکان کەلە جیهانی ئەمڕۆماندا هەیە، وەلەبەر ئەوەی مادی گەرایی ڕاستیەکی ڕەهایە هەرگیزنابێت ڕێگە بدرێت کە ئەم ڕووداوانە ڕاڤەی خواییان بۆ بکرێت. گومانی تێدا نیە ئەم وشانە ڕەنگدانەوەی بیرو بۆچوونی دواکەوتوانەی ئەو زانایانەیە کە پەیوەندی کوێرانەیان بەمادەوە هەیە، وە بەپێی پەیڕەوانی ئەم تیۆرە کەتیایدا ڕۆچوون وادادەنێن کە جگە لەمادە شتێکی دیکەنیە، وەلەبەر ئەوە بڕوایان وایە مادە نازیندووەکان هۆکارێکن بۆ بوونی مادە زیندووەکان، بەو مانایەی کە ملیۆنەها جۆری وەك باڵندەو ماسی و زەڕافە و پڵنگ و مێروو دارو درەخت و گوڵ و گوڵزارو نەهەنگ و تەنانەت مرۆڤیش هیچ نین جگەلەبەرهەمی ئەو گۆڕانە ناوەکیەی کەبەسەر مادەدا هاتووە بەهۆی هۆکارە سروشتیەکانەوە وەك لێزمەباران و هەورە بروسکە. لە ڕاستیدا ئەم جۆرە بیرو باوەڕانە تەواو پێچەوانە و دژە لەگەڵ بنەماکانی عەقڵ و زانستدا، بەڵام داروینیەکان بەردەوام بەرگری لەو بۆچونانەیان دەکەن لە بەرژەوەندی ئامانجەکەیان وەك دەڵێن (هەرگیز نابێت ڕێگە بدرێت کەئەم ڕووداوانە ڕاڤەی خواییان بۆ بکرێت). وە هەموو کەسێك لەڕوانگەی مادیەوە سەیری حاڵەتی بنچینەی ژیان بکات، ئەوا ئەم ڕاستیە وەکو خۆری درەوشاوە دەبینێت ، چونکە لە ڕاستیدا تەواوی بوونەوەرە زیندووەکان لە ژێر کاریگەریەکی بە هێزەوە پەیدا بوون کەئەو هێزە کۆتایی نایەت و لەبن نایەو ئەو هۆش و بیرەش سنورێکی بۆ نیە، واتە لەلایەن بەدیهێنەرێکەوە دروست بووە، وەئەم بەدیهێنەرەش خوای گەورە و بەتوانایە کە هەموو شتەکانی لەنەبوونەوە دروست کردووە و پێی فەرمووە (دروست بەودروست بووە).

# پوختەیەك دەربارەی وەرگێڕ

ناوی تەواوی (شاهۆ عومەر عارف) لەساڵی (١٩٧٤) لەشاری هەڵەبجە لەدایک بوە هەڵگری بڕوانامەکانی (دبلۆم و بەکالۆریۆسە) خاوەنی ئەم بەرهەمانەیە:

١-بەناوی تۆوە دەژین- چاپکراوە

٢-دەوڵەتی سەلجوقی بەهاوکاری (نیهاد جەلال) – چاپکراوە.

٣-دیاری بوک و زاوا بۆ ژن و مێردی ئیسلامی بەختەوەر- چاپکراوە

٤-ئیمامی غەزالی- لەژێر چاپدایە.

٥-ئادابەکان- لەژێر چاپدایە

٦-چۆن منداڵەکانمان فێر بکەین کە رەچاوی کەسانی تر بکەن.-لەژێر چاپدایە.

٧-گرنگی ویژدان لەقورئاندا- لەژێر چاپدایە.

چەند بەرهەمێکی دیکەش وەرگێڕان لەفارسی و عەرەبیەوە بەدەستەوەیە

# پێڕست

# نەتەوە لەناوچووەکان




نوسینی
هارون یەحیا

وەرگێرانی
شاهۆ عومەر عارف



چاپی یەکەم
٢٠١٠







لە بڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا